ئاب
2005
سـالّی شەشەم

# سەردەم

40

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی


خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵلا

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

کاری کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق



ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


–سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# سنوردارکردنی دەسەڵات

**ئالان تورین**

**لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید**

## دەسەڵاتی رۆحی و دەسەڵاتی زەمەنیی

سەبارەت بە بیرۆکەی دیموکراسی، هیچ پرنسیپێك هێندەی پرنسیپی سنوردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت خاوەنی بایەخی مەرکەزیی نییە، ئەو دەوڵەتەی کە پێویستە رێز لە مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ بگرێ. بەم پێیە، مرۆڤ چۆن دەتوانێ نەیاری سەرەکیی دیموکراسی لە چاخی ئێستاماندا لەیاد بکا؟ ئەو نەیارە حوکمی شاهانەی خاوەن مافی یەزدانی نەبوو، هەروەها دەسەڵات و کۆنترۆڵی دەرەبەگ و خاوەن موڵکەکان نەبوو، بەڵکو تۆتالیتاریزم بوو. سەلماندنی پرنسیپی سنووردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت گرنگترین کارە بۆ قەڵاچۆکردنی ئەو تۆتالیتاریزمە. ئێستا ئەم جۆرە هەستە رەگی لە ناخماندا داکوتیوە، بە جۆرێك وەك هەردوو سەدەی حەڤدەیەم و نۆزدەیەم، بایەخدان بە بیرۆکەی سەروەریی میللی و بیرۆکەی یەکسانی فریومان نادا، بەو شێوازەی کە تۆکڤیڵ دەستنیشانی کردووە. چونکە ئەو گروپانەی کە پلە بەندیی توند جڵەوی دەکردن و بە سانسۆری کۆمەڵایەتی توند خۆیان دەپاراست، ئێستا لە ژێر کاریگەریی مۆدێرنیتە و هەڵوەشاندنەوەی سیستمی باڵادەست و کاریگەریی گۆڕانە خێراکان لەناوچوون. بە ئەندازەیەك ئەوەی ڕەوتی نەریتپارێز لەناودەبا کاری سیاسی و سەر لەنوێ دامەزراندنەوە نیە لە نێوان دوو هاوپەیمان کە بچنە گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوەوە، بەڵکو ئەوەی لە ناوی دەبا کاریگەریی مۆدێرنیتەیە، جا ئیدی دیموکراسی لەگەڵدابێ یان نا. لە هەموو شوێنێك لەناوچوونی حوکمە پادشاییە نەریتیەکان و چینە دەسەڵاتدارە کۆنەکان و دەسەڵاتی بنەماڵەیی و قوتابخانەیی دەبینین، ئەو دەسەڵاتانەی کە خەڵکیان ناچار دەکرد رێز لە پلەو پایە و دامەزراوەکانی پلەبەندیی بگرن، بەو پێیەی سروشتی دەزگایانە هەر بەو جۆرە بووە. ئێستا پەیوەندییە پیشەییەکان جێی چینەکانیان گرتۆتەوە، ڕەنگە کاتی خۆی چینەکانیش جێی گروپە خاوەن بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان

گرتبێتەوە. لە بەرامبەردا، هیچ شتێك سوودی نییە بۆ سنوورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەت جگە لە بڕیارێكی سیاسی و هزرێكی ئەخلاقی، چونكە هەمیشە مێژوو دەسەڵاتی زیاتر دەبەخشێ بە دەسەڵات لە كۆمەڵگەیەكی بزۆكدا كە دەوڵەت تیایدا تەنها دەستەبەری بەرهەمهێنانەوەی ڕەوتی كۆمەڵگەیی ناكا، بەڵكو لە جاران زیاتر هێزی مەركەزیی پیادە دەكا بەسەر هێزەكانی گۆڕانی كۆمەڵگەیی و كەڵەكەبوون و سەرلەنوێ دابەشكردنەوەدا. جەختكردنەوە لەسەر بیرۆكەی دیموكراسی ئامادەییەكی زیاتری هەیە لەم پرۆسەی سنووورداركردنەدا، چونكە دەبێ ئەو پرۆسەیە بەشێوەیەكی ئیرادەگەرانە ئەنجام بدرێ، هەرچەندە خەریكە بە پێچەوانەی خواستی كۆمەڵگەی مۆدێرنەوە هەنگاو دەنێ، چونكە زۆر جار پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی مەرجەعیەتە نەریتیەكان لەسەر دەستی دەوڵەتگەلێك ئەنجام دەدرێ، كە لە مۆدێلی دەسەڵاتگەرەوە نزیكن تا مۆدێلی دیموكراتی. كولتوری سیاسی ئێمە دروستبوونی دیموكراسی مۆدێرنی ڕەخساندووە، چونكە ئەو كولتورە لەسەر بنەمای جیاكاریی نێوان دەسەڵاتی ڕۆحی و دەسەڵاتیی زەمەنیدا دامەزراوە، بەڵام تا ئێستاش ئەو دوو دەسەڵاتە لە چەند شارستانیەتێكی تردا یەك دەسەڵاتن، ئەوەش بۆتە هۆی بە پیرۆزكردنی دەوڵەت. لە راستیدا ئێمە لە كەلەپوری خۆماندا بیرۆكەی پیرۆز و بیرۆكەی ترانسندنتاڵی (باڵاخوازی) پێكەوە بەدیدەكەین. یەكەمیان یەكێتی لە نێوان مرۆڤ و یەزداندا دەسازێنێ و مانایەكی ڕەمزیی دەبەخشێ بە شتەكان و ڕەفتارەكان، پرسی ڕۆحی تێكەڵ بە پرسی زەمەنیی دەكا، بگرە هەموو مانایەك لە جیاكاری نێوانیان دادەماڵێ. بەڵام بیرۆكەی باڵاخوازی بە پێچەوانەوە، جیاكاریی لە نێوان ئەو شتانەدا ئەنجام دەدا كە پیرۆزی پێكەوەی لكاندوون، چونكە ئەو بیرۆكەیە تەنها لە ڕووداوێك لە ڕووداوەكاندا، لە پەشێوییەك لە ڕەوتی كۆمەڵگەییدا، بەرجەستە دەبێ.. یان لە دەركەوتنی پێغەمبەرێكدا، یان لە دەركەوتنی كوڕی یەزدان لەسەر زەویدا بەرجەستە دەبێ. گەر ئەو پێغەمبەرە یان ئەو كوڕە نەیەت ئەوا یەزدان لە هەموو شوێنێك هەیە و لە ڕەوتی شتەكان و، لە زەینیەتی مرۆڤەكاندا ئامادەیە. بەڵام ئامادەبوونی كوڕی یەزدان و بوونی لەناو جیهاندا، بە پێچەوانەوە و بە شێوەیەكی بینراو، دەبێتە هۆی جیابوونەوەی ئاستی ڕۆحی لە ئاستی زەمەنیی، بوار دەرەخسێنێ بۆ داماڵینی پیرۆزیی لەم جیهانە — كە هەر وەك ئینجیل دەڵێ — یان بەلانی كەمەوە هەروەك شیكردنەوەی گشتی ئەو قسەیە دەڵێ: ئەوەی هی قەیسەرە بدرێ بە قەیسەر و ئەوەیشی هی یەزدانە بۆ یەزدان.

ئەم دوو كەلەپووره ئاینییە كاریگەریی لە مێژوی نوێی ئێمە كردووە، كە ماكس ڤیبەر ناویدەنێ كەلەپوری سكهەڵگوشین و كەلەپوری حوكمی پیرۆز. دیدی پیرۆزكردنی جیهان و دەسەڵاتی پیرۆزی یەزدان لەگەڵ ڕێچكەی دنیاگەریدا، بۆتە هۆی هاتنە ئارای حوكمێكی ڕەها كە ڕەوایەتی ئاینی بەخۆی بەخشیوە. لە وڵاتە مەسیحیەكاندا هەروەك وڵاتە ئیسلامیەكان ئاینی دەوڵەت هەبوو، پادشاكانمان بانگەشەیان بۆ دروستكردنی موعجیزە دەكرد. لە كاتی گفتوگۆی بەناوبانگی نێوان پاپاو ئیمپراتۆردا كڵێسا جەختی لەسەر بناغەی ئاینی ناڕاستەوخۆی دەسەڵاتی زەمەنیی و ڕۆڵی گەل لە بەخشینی ڕەوایەتی بەو دەسەڵاتە دەكردەوە. لەلایەكی ترەوە، بانگەواز بۆ

یەزدانێکی باڵا بووە هۆی هوشیاری بەرامبەر دەروون – هەروەك دیکارت پێناسەی کرد – هەروەها بووەهۆی بایەخنەدان بە جیهان و پاشان (قسەکردن) لە مافی سروشتی، بەر لەوەی ئەو بانگەوازە ببێتە هۆی دەستوەردان لە کاروباری کۆمەڵگەکانمان بەوەی بەرگی فەرمانڕەوایی کۆمەڵگەیی بپۆشێ و هەڵسوکەوت و رەفتارەکانمان لە ئاست بوونەوەرە زیندوەکاندا جڵەو بکا. ناکرێ ئاین بکرێتە نەیاری ئازادی و نەیاری ئەقڵ. زۆر جار کڵێساکان هەوڵیانداوە کۆمەڵگەیەکی مەسیحی دروستبکەن و بەرگری لەو کۆمەڵگەیە بکەن – ئەمە لە حاڵەتێکدا گەر بمانەوێ لە ناوچەی مەسیحیدا بمێنینەوە – جان دیلیمۆ کۆمەڵگەی مەسیحی ناودەنێ جیهانی مەسیحی تا ئەو جیهانە لە ئاینی مەسیحی جیابکاتەوە. زۆر جار ئەم ڕەوتە لە بزاوتی ئاینی و سیاسی پێکەوە گرێدراودا دەرکەوتووە، کە ناوەرۆکێکی (ئەو دنیایی) ئاشکرای هەبووە، وەك لاهوتی ئازادیخواز بۆ نمونە. بەڵام بەدیوەکەی تردا، باوەڕی ئاینی لە سەردەمی سواریس و لاس کاساس و کۆلۆنیالیزمەوە هەوڵی بۆ جیهانێکی تازە داوە، تا دواجار لە بزاوتی (ڤیکاریا دولا سۆلیداریداد)[1] لە چیلی دەرکەوت، کە دژ بە زۆرداری دەسەڵاتی سیاسی بەرگری لە هەژار و چەوساوەکان دەکرد. زەینیەتی دیموکراتی زۆر قەرزاری ئەزموونی ئاینییە، هەرچەندە زۆر جار ئەو زەینیەتە ناچار بووە خەبات بکا دژی پشتیوانی کڵێسا لە دەسەڵات.

## مافەکانی مرۆڤ دژی سەروەری میللی

بیرۆکەی سنووردارکردنی دەسەڵاتی سیاسی زادەی هاوپەیمانی بیرۆکەی مافی سروشتی لەگەڵ بیرۆکەی کۆمەڵگەی مەدەنییە، کە سەرەتا وەك کۆمەڵگەیەکی ئابوری تەماشا دەکرا کە لە چالاکیەکانیدا پێویستی بە ئازادی پڕۆژەسازی و ئازادی ئاڵوگۆڕ و گوزارشتکردن لە بیروڕا هەبوو. گەر ئەو ئازادییە (بۆرجوازییە) نەبوایە، ئەوا بیرۆکەی مافە بنەڕەتیەکان وەك بیرۆکەیەکی رەخنەیی پەتی دەمایەوە، وەك بیرۆکەی بەرەنگاربوونەوەی چەوساندنەوە کە زۆربەی فەیلەسوفە سیاسیەکان بەرگرییان لێدەکرد، لە (هۆبز)ەوە تا (ڕۆسۆ). گەر بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤیش نەبوایە، ئەوا زەینیەتی ئاڵوگۆڕی بازرگانی ئازاد وەرنەدەچەرخا بۆ زەینیەتێکی دیموکراسی. زەینیەتی دیموکراتی زادەی هاوپەیمانیی نێوان زەینیەتی ئازادی و زەینیەتی یەکسانییە.

بانگەوازکردن بۆ مافەکانی مرۆڤ، هەمیشە بەرەوتێکی پێچەوانە بە ڕەوتی فەلسەفەی سیاسی چاخی نێوان شۆڕشی ئینگلیزی پیرۆز[2] و شۆڕشی فەرەنسی مەزن دەڕوا، ئەو فەلسەفەیەی کە جگە لە خۆی هیچ بناغەیەکی تری بۆ سیاسەت نەدەبینی. ئەم فیکرە، لای هۆبز و لای رۆسۆش، پێی وابوو کە پێودانگی سیاسیی بریتییە لە پێودانگی ئەقڵ کە پێچەوانەی پێودانگی سروشتی و ئەو ئارەزوانەیە کە لای هیچ یەکێکمان سنوری نییە، هەروەها پێودانگی ئەقڵ دژی پێودانگی کۆمەڵگەییە کە گەندەڵی و نایەکسانی حوکمی دەکا. مۆدێرنیتە، لەم بوارەو لە بوارەکانی تریشدا، ئەقڵ واتە رێکخستن و سیستم زاڵ دەکا بەسەر پاشاگەردانی و زەبروزەنگ و خۆپەرستیدا. چونکە مرۆڤ تەنها کاتێك دەبێ بە هاوڵاتی کە خاوەن ژیار بێ. بەڵام ئەم فیکرە لیبراڵییە (کلاسیکییە) دیموکراسی دانەهێنا، بەڵکو دەوڵەتی نەتەوەیی داهێنا، کە لە ئینگلتەرا لە دایکبوو بەر لەوەی بە هەموو هێزی

خۆیەوە بگاتە فەرانسای رژێمی کۆن پاشان فەرەنسای شۆڕش. بیرۆکەی دیموکراتی لەگەڵ ئەم ئەقلأنیەتە سیاسیەدا نەهاتە گۆڕێ بەڵکو لە دژایەتی ئەودا هاتۆتە ئاراوە، هەروەها لە دژایەتیکردنی پێودانگی کۆمەڵگەییدا. گەر ئینگلتەرا دایکی دیموکراسی بێ، ئەوا فەرەنسا چەندین جار خیانەتی لێکردووە، چونکە فیکری دیموکراتی لە ئینگلتەرا سەربەخۆیی تاك و کۆمەڵگەی مەدەنی سەلماندووە، بەڵام ئەوەی لە فەرەنسا سەرکەوتنی بە دەستهێنا بریتی بوو لە کۆششی پێچەوانەوە بەرەو رەوتێکی ئەقڵی، هەروەها شوناسگۆڕکێی نێوان مرۆۋ و هاوڵاتی بە تەواوی، ئەویش واتە یەکسانکردنەوەی کۆمەڵگە بە دەوڵەت. جاڕنامەی مافەکانی مرۆۋ و هاوڵاتی ساڵی 1789 دەسپێکی قۆناغی شۆڕش نەبوو لە فەرەنسا، بەڵکو کۆتایی هێنان بوو بە کەلەپورێکی درێژ، کەلەپورێکی دوانەیی کە ئیلهامی لە ئۆگەستینۆس وەرگرتبوو، کەلەپورێك کە پێشتر فیکری لۆسەر–ی جلەوکردبوو، پاشان فیکری دیکارت، پاش ئەویش فیکری لۆك. ساڵی 1789 ساڵی درزتێبوونی مێژوی سەرکەوتنی دەوڵەت بوو، ئەو مێژووەی خەریك بوو دەبووە مێژویەکی بەردەوام، بەو جۆرەی کە تۆکڤیل لە وتارێکیدا شۆڕشی فەرەنسای پێ شیکردۆتەوە، بە پشتبەستن بە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی رژێمی کۆن. چونکە کەلەپوری لۆك کە زاڵتر بوو لە کەلەپوری رۆسۆ لە فەرەنسای ساڵی 1789دا، لە بیرۆکەی مافەکانی مرۆڤدا ئامادەیی هەیە، ئەو بیرۆکەیەش زاڵتر بوو لە بیرۆکەی سەروەری میللی. بەڵام هێندەی نەبرد ئەم هزرە دیموکراتییە لە ژێر فشاری ئامادەسازیی گشتی لە پێناو ئازادی و کۆماریخوازیدا دژی میرەکان.. پوکایەوە. هەر ئەو هۆکارەش ناپلیۆنی گەیاندە دەسەڵات، کە پاساوی دەهێنایەوە بۆ رژێمی تازەگەر و نەتەوەیی و ئیرادەگەر کە باڵی کێشابوو بەسەر مێژووی جیهاندا و تا کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمیش هەر بەردەوام بوو، بەڵام (مۆدێلی) ئەو جۆرە رژێمە نەیتوانی بەریتانیا داگیر بکا، کە لە تاریکترین رۆژگاری مێژوی ئەوروپادا، هەروەك قەڵایەکی پتەوی دیموکراسی مایەوە. جەنگەکان و مەترسییە جۆراوجۆرەکانیش نەیانتوانی دەزگا دیموکراتیەکان و زەینیەتی دیموکراتی بەریتانیا لە ڕێ لابەرن، کە لە ساڵی 1688ەوە وەك میرات بۆی جێ مابوو.

بەمجۆرە بیرۆکەی دیموکراتی ملکەچی وەرچەرخانێکی قووڵ بوو، کە دواجار بە کودەتایەك کۆتایی هات کە هەموو شتێکی ئاوەژوو کردەوە: لە کاتێکدا ئەو بیرۆکەیە جەختی دەکردەوە لەسەر هاوئاهەنگی نێوان ئیرادەی تاك و ئیرادەی گشت، ئێستا بە پێچەوانەوە، هەوڵدەدا بۆ پاراستنی ئازادی تاکەکان و گروپەکان دژی هێزی گشتگیری دەوڵەت. کاتێ رۆسۆ دژایەتی سیستمی پارلەمانی ئینگلیزی دەکرد، بەرگری لە "شێوازێکی گردبوونەوە" دەکرد، بە جۆرێك ژیان و موڵکی هەریەکێك لەو کەسانە بپارێزێ کە گرد دەبنەوە بە هەموو هێزی هاوبەشیانەوە، هەروەها کار بۆ ئەوە بکا کە تاکەکەس سەرباری یەکگرتنی لەو گردبوونەوەیەدا، تەنها ملکەچی خواستی خۆی بێت و بە ئازادی بمێنێتەوە هەروەك چۆن ئازاد بووە بەر لەوەی بچێتە گردبوونەوەکەوە (دەربارەی پەیمانی کۆمەڵایەتی 1، 6).

بەڵام هانس کلسن لە کتێبێکیدا بەناونیشانی (دیموکراسی) رەخنە لەو کۆ دژییە دەگرێ کە بیرکردنەوەی رۆسۆ –ی کز کردبوو: بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی ئیرادەی

تاکەکەس دامەزراوە، لە کاتێکدا ئیرادەی گشتی ئیرادەی هەموان نییە، جگە لەوەی ئیرادەی زۆرینەش نییە. ئەو پرسە لە پرسی هۆشیاری دەستەجەمعی، کە دۆرکایم قسەی لێکردووە، بابەتی ترە. لێرەوە، هەرگیز هاوئاهەنگی (تەواو) لە نێوان تاکەکان و دەوڵەتدا نییە. هەر بۆیە کلسن رەخنەی زۆر لە وتەزای گەل دەگرێ کە پەنا دەبا بۆ گوزارشتە کۆمەڵگەییەکان بۆ پەردەپۆشکردنی یەکێتی دەوڵەت، (ئەڵبەتە) مارکسیزم لەو مەسەلەیەدا رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی بینی. بەگوێرەی پاساوەکەی رۆسۆ دەبوو پشت ببەسترێ بە تاکێکی دابڕاو، وەك هەموو تاکەکانی تر، واتە مرۆڤێکی گەردوونی، ئەمە لە کاتێکدا گەر چاودێری واقعی کۆمەڵگەیی بکەین دەبینین لە چەند گرووپێك پێکهاتووە کە خاوەن بەرژەوەندین، لە توێژ و چینی کۆمەڵگەیی دروستبووە، بە جۆرێك ژیانی سیاسی ملکەچی هەمەجۆری و فەرەیی گرووپە کۆمەڵگەییەکانە نەك یەکێتی دەوڵەت. کلسن کە کەسێکی نزیك بوو لە سۆشیال دیموکراتەکانی نەمسا لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە دیموکراسی ناتوانێ دەسبەرداری حزب ببێ. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو جۆرە دەوڵەتە ڕەتدەکاتەوە کە شوناس لەگەڵ گەلدا دەگۆڕێتەوە، چونکە شوناگۆڕینەوەیەکی لەو جۆرە دەسەڵاتێکی بێ سنوور دەبەخشێ بە دەوڵەت بەسەر ئیرادەی تاکەکاندا.

## کۆماریخوازەکان دژی دیموکراتەکان

سەردەمانێکی درێژە دیموکراسی ئینگلیزی پارێزگاری لە ڕەهەندی ئۆرستۆکراتی خۆی دەکا، ئەو ڕەهەندەی کە دیموکراسی فەرەنسی هەمیشە دژایەتی کردووە و دژایەتی دەکا. مێژوی ئینگلیز مەحکومە بەوەی هاوپەیمانی لە نێوان گەل و چینی ئۆرستۆکراتیدا هەبێ دژی پادشا، بەڵام مێژوی فەرەنسا بە پێچەوانەوە مەحکومە بەوەی هاوپەیمانی لە نێوان گەل و پادشا واتە دەوڵەتدا هەبێ دژی چینی ئۆرستۆکراتی. بەمجۆرە خاڵی لاوازی لە دیموکراسی ئینگلیزیدا دەکەوێتە سەر لایەنی کۆمەڵگەیی، بەڵام خاڵی لاوز لە دیموکراسی فەرەنسیدا دەکەوێتە سەر لایەنە سیاسیەکەی.

لاوازیی کەلەپوری دیمواتی فەرەنسی کە لاوازییەکە لە ئیسپانیا و ئەمریکایی لاتینش هەیە، بە جۆرێکی کەمتریش لە ئیتالیا، بەو پێیەی ولاتگەلێکن کە یەکێتی نەتەوەیی تیایاندا درەنگ هاتەدی زادەی ئەو ململانێیەیە کە بە ناچاری دژی دەوڵەتێك ئەنجام دراو پەیوەندییەکی تۆکمەی بە هێزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵگەیی و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەیان هەبوو، لەسەرو هەمووشیانەوە کڵێسای کاسۆلۆکی. هەر بۆیە بەرەنگاربوونەوەی ئاین و پیاوانی ئاینی لە سیستمی کۆماریدا بایەخی خۆی هەیە، لە فەرەنسا شەڕی سیاسی و ئایدیۆلۆجی بە مانایەکی فیعلی بایەخدارترە لە ریفۆرمی کۆمەڵایەتی، لەسەردەمی کۆماری فەرەنسی سێیەمدا و لە ولاتانێکی تریش (هەمان حاڵەت) بەدی دەکرێ. ئەوەش هاندەرێك بوو کە لە فیکری فەرەنسیدا تێکەلاوی کرا لە نێوان کۆماریخوازی و دیموکراسیدا، بە تایبەتی هاوپەیمانی نێوان کۆماریخوازی و شۆڕش لەبەرتر بووە لە هاوپەیمانی نێوان دیموکراسی و ریفۆرمی کۆمەڵگەیی. فەرەنسا ولاتێکە کە کرێکاران تیایدا، لە دێر زەمانەوە، بوونی بە خاوەنی مافە نیشتمانیەکانیان بە شێوەیەکی بەرفراوانە، بەڵام تەنها بەم دواییانە بوون بە خاوەنی مافە کۆمەڵگەییەکانیان لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا.

ئەو کاتەی کرێکارانی فەرەنسا لە سایەی حکومەتی بەرەی میللیدا، بوون بە خاوەنی چەند مافێکی کۆمەڵگەیی، تەنها نیو سەدە بەسەر لە دایکبوونی دیموکراسی پیشەسازی لە بەریتانیای مەزن و دەرکردنی یاسای کار لە ئەڵمانیا تێپەڕیبوو، بەڵام هێندەی نەبرد ئەو مافانە لە ژێر کاریگەریی دۆخی ئابووری و ئەنتەرناسیۆنالیزمدا بوون بە مافگەلێکی کاڵ و کرچ کە باویان نەما. کەسی چاودێر دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە ناکۆکی لە نێوان ئەم دوو شەپۆلە فیکرییە و ئەم دوو جۆرەی کۆمەڵگەی سیاسیدا هەن، کە دەکرێ یەکێکیان بە کۆماریخوازی و یەکێکیان بە دیوکراتی ناوبەرین، ئەمە لە کاتێکدا گەر بمانەوێ ئەو ناکۆکییە بێنینەوە یادی خۆمان کە (رجیس دۆبرێ) لە نێوان ئەو دوو مۆدێلەدا دەیبینی، بە پێی (دۆبرێ) زەینیەتی کۆماری کە بایەخێکی مەرکەزی بە دەوڵەت و دەستێوەردان و گۆڕانکاریەکانی دەوڵەت دەدا، دژی زەینیەتی دیموکراتییە کە رۆڵی مەرکەزی دەبەخشێ بەهێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان. هەندێ جار وا باشە، لەم چاخەدا کەچیتر بڕوای بە شۆڕش نیە، مەزنی دەوڵەتان و گەورەیی سەپا شۆڕگێڕەکان یادی مرۆڤ بهێنرێنەوە.. بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێویستە لە هەموو شوێنێکی جیهان بابەتێکی گەوهەریی یادی مرۆڤ بخرێتەوە: ئەوەیش ئەوەیە کە دەڵەتی ئامادەساز (تەعبەوی) گەورەترین دوژمنی دیموکراسی بووە. ئەوانەی بەرگری لەو جۆرە دەوڵەتە دەکەن دەبێ ئەوە بزانن کە دیموکراس بوونی نییە بەدەر لە ئازادی کۆمەڵگە و ئازادی هێزە چالاکەکانی، بەبێ ئیعتراف دەوڵەت بەوەی کە رۆڵی ئەو تەنها خزمەت کردنی کۆمەڵگە و هێزەکانیەتی بەڵام دەبێ ئەوەش لە بەرچاو بگیردرێ کە دەکرێ هەندێ جار ناکۆك بین لە نێوان لاوازی دەوڵەت لە رووی نەریتی سیاسی و ئەو قارەمانێتییەی نمایش دەکرێ بۆ ئامادەسازیی میللی و نەتەوەیی. هەروەها دیموکراسی بوونی نیە گەر دەوڵەت لە خزمەتی وڵات و نەتەوەدا نەبێ، بە تایبەتی گەر خزمەتی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان و ئیرادەی ئەو هێزانە بۆ ئازادی و بەر پرسیارێتیدا، نەبێ.

فیکری دیموکرات تەنانەت لە ساناترین شێوازەکانیدا: واتە بەرگری لە ئازادی هەڵبژاردنی فەرمانڕوایان لەلایەن ئەوانەوە کە فەرمانەڕوایی دەکرێن ئەوە دەخوازێ بڵێین تەنها هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان لە پێشتر نین بەسەر دەسەڵاتی سیاسییەوە، بەڵکو بانگەشە بۆ ئەو بیرۆکەیە بکرێ کە دەڵێ "خەڵکی خاوەنی مافگەلێکی مەعنەوین دژی دەوڵەتەکەیان" وەك رونالد دوورکن وتوویەتی (وەرگرتنی ماف بەشێوەیەکی جدی، ل 147). پێویستە لە نێوان دوو ڕێگەدا یەکێکیان هەڵبژێرین، کە هەردوکیان بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە دیموکراسی بەرقەرار دەکەن. یەکێکیان ئەو ڕێگەیەیە کە ئاماژەمان پێدا، واتە سیاسەت و ماف سەر بەو پرنسیپانەن کە مافی سروشتی دەستەبەر دەکەن. ڕێگەی دووەم ئەو ڕێگەیەیە کە سیفەتی دیموکراتی دەخاتە پاڵ ئەو سیستمەی زۆرترین بڕی شیاو لە بەشداری دابین دەکا بۆ تەواوی گەل و دەسەڵاتی کەمینە فەرمانڕەواکان هەڵدەوەشێنێتەوە. بەڵام باشترە سیفەتی شۆڕشگێڕی بخەینە پاڵ ئەم دەسەڵاتە میللییە. چونکە ڕاستە خواستێکی دیموکراتی پاڵنەری دەسەڵاتێکی لەم جۆرەیە، بەڵام تەنها هێندە بەس نییە دیموکراتی بخەینە چوارچێوەی ڕێزگرتن لە ئیرادەی گشتی. دیموکراسی پێویستی بە پرنسیپی بەرگری هەیە دژی چەوساندنەوەی دەسەڵات. کە

پرنسیپێکی جووت روخسارە: لە لایەکەوە ناوی (ئازادی) لێدەنرێ کاتێ جەخت لەسەر سنوربەندکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا ناوی (یەکسانی) لێدەنرێ کاتێ پێناسەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبەخشێتە بەرەنگاربوونەوەی شێوازی دابەشکردنی ناعادلانەی دەرامەتی ئابوری و سیاسی. ڕاستە تەنها ئەوە بەس نییە کە سیستمێکی سیاسی دەرفەت بدا بە بەرانگاربوونەوەی دەوڵەت تا ببێتە سیستمێکی دیموکراتی. بەڵام سنوربەندکردنی دەسەڵات تەنها یەکێکە لەو پرنسیپانەی کە دیموکراسی دروستدەکەن، واتە سەرباری گرنگی ئەو پرنسیپە کەکەس ناتوانێ دەسبەرداری بێ، بەڵام هەمووی نییە. گەر مرۆڤ تەنها هاوڵاتی بێ و هیچی تر، هیچ سنورێك لەبەردەم دەوڵەتدا نامێنێ کە نەتوانێ لێی لابدا، بەڵام گەر هاوڵاتیبوون بەند بێ بە ئینتمای تایەڤ (کۆمیونیتی دیاریکراو)ی مرۆڤەوە، ئەوا ئەو مرۆڤە توانای بەرەنگاربوونەوەی ستەم و دیکتاتۆریەت لە دەست دەدا. کەواتە هیچ شتێك جگە لەو مافە بنەڕەتیانەی ناوی ماف سروشتی لێنراوە خاوەن دەلالەتێکی گەردوونی و کۆکەرەوە نییە، ئیدی هیچ شتێك نابێتە پرنسیپێکی رەها بۆ بەرانگاربوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت، کە خۆی لە خۆیدا بەرەو تۆتالیتاریەتی زیاتر دەڕوا.

## سەربەخۆیی دوولایەنەی سیستمی سیاسی

بیرۆکەی دیموکراتی دژی بیرۆکەی شۆڕشە، چونکە شۆڕش تەواوی دەسەڵات دەداتە دەوڵەت لە پێناو گۆڕینی کۆمەڵگادا. بۆ دامەزراندنی دیموکراسی، دەبێ بە پێچەوانەوە، جیاکاری بکرێ لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی سیاسی و کۆمەڵگەی مەدەنیدا. گەر بێتو دەوڵەت لەگەڵ کۆمەڵگەی سیاسیدا تێکەڵ بکەین، ئەوا دەسبەجێ چەندین بەرژەوەندی کۆمەڵگەیی دەلکێنین بە کرداری یەکخەری دەوڵەتەوە. بەڵام گەر بە پێچەوانە کۆمەڵگەی سیاسی تێکەڵ بکەین لەگەڵ کۆمەڵگەی مەدەنیدا، ئەوا چیتر پەی بەوە نابەین کە چۆن ئاستێکی سیاسی و دادوەری دابنێین کە تەنها جۆرێك نەبێ لە بەرهەمهێنانەوەی بەرژەوەندییە ئابورییە باڵادەستەکان. هەروەها ئەم تێکەڵکردنە دەبێتە هۆی ڕێگەدان بە بەرپرسیارێتی کۆمەڵگە کە تەنها بریتی بێت لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت. لە هەموو حاڵەتەکاندا بوارێك بۆ دیموکراسی نامێنێتەوە. ئەڵبەتە کۆمەڵگەی سیاسی بایەخدەدا بە دیموکراسی، هەروەها دیموکراسی پێویستی بە سەربەخۆیی کۆمەڵگەی سیاسی هەیە کە دەبێتە نێوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی. چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی دەبێتە هۆی زاڵبوونی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا، بەڵام بە هیچ جۆرێ نابێتە هۆی زاڵبوونی دیموکراسی.

جیاکاری لە نێوان دەوڵەت و سیستمی سیاسی و کۆمەڵگەی مەدەنیدا، ناچارماندەکا پێناسەی سنوری ئاستی سیاسی بکەین وەك ئەڵقەی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی، هانس کلسن کارێکی لەمجۆرەی کرد کاتێ دیدی خۆی دەربڕی دەربارەی "دروستکردنی ئیرادەی ئاراستەکراوی دەوڵەت لەلایەن دەستەیەکی هەڵبژێردراوەوە لەلای گەلەوە لەسەر بنەمای یەکسانی و دەنگدانی گشتی، واتە دەستەیەکی دیموکرات کە بڕیارەکانی بە زۆرینە دەربکا" (دیموکراسی، ل 38). ئەم ڕۆڵە نێوەندەی کە دیموکراسی ئەنجامی دەدا، وا دەکا کە بە مەرکەزی

یان به (بیرۆکەیەکی دیاریکراو) پێناسەی نەکەین، ناچارمان دەکا کە وەك تێکەڵەیەك لە چەند توخمێکی دیاریکراو لێی تێبگەین کە پەیوەندیەکانی دیموکراسی بە دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنییەوە دیاریدەکا.

بەڵام ئەو زاراوانەی کە لە ژیانی گشتیدا لەمبارەیەوە بەکاردێن لەبری روونکردنەوە ئاڵۆزیی زیاتر دروستدەکەن. چونکە واتای وشەکان لە واقعدا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازیی زۆریان هەیە من لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بکەم بەوەی کە مەبەستم لە (دەوڵەت) کۆی ئەو دەسەڵاتانەیە کە یەکێتی کۆمەڵگەی نەتەوەیی دەستەبەر دەکەن و بەرگری لەو یەکێتییە دەکەن دژی مەترسی و گرفتە دەرەکی و ناوەکیەکان، هەروەها واتە بەردەوامیی مێژویی ئەو یەکێتیە لە رابردووەوە بۆ ئایندە. دەوڵەت تەنها دەسەڵاتی جێبەجێکردن نییە: بەڵکو ئیرادەشە. بەڵام (سیستەمی سیاسی) ئەرکێکی جیاوازی هەیە کە بریتییە لە دروستکردنی یەکێتی لە فرەیی و هەمە جۆری، هەروەها لکاندنی یەکێتی بە پردەکانی هێزەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵگەی مەدەنی، لە ڕێگای سەلماندنی رۆڵی حیزبە سیاسیەکان کە دەکەوێتە نێوان گروپەکانی بەرژەوەندیی و چینەکان و دەوڵەت. سیستەمی دادوەری لە هەندێ وڵاتدا، وەك فەرەنسا، بەشێکە لە دەوڵەت.. بەڵام لە هەندێ وڵاتی تردا، وەك ئەمریکا، بەشێکە لە کۆمەڵگەی سیاسی، چونکە دادوەرەکان ئەو کەسانەن کە یاسا دروستدەکەن. هەرچی (کۆمەڵگەی مەدەنی)یە تەنها لە بەرژەوەندییە ئابووریەکاندا قەتیس نابێ، بەڵکو کایەی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکانە، کە لە یەك کاتدا، بەها کولتوری و پەیوەندییە کۆمەڵگەییە پێکا هەڵپژاوەکان ئاڕاستەی دەکەن. سەلماندنی سەربەخۆیی کۆمەڵگەی مەدەنی، کە بەریتانیەکان و هۆڵەندیەکان بەر لە هەموو کەسێ دانیان پێدانا، مەرجی یەکەمە لە مەرجەکانی دیموکراسی، چونکە جیاکردنەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی لە دەوڵەت بووە هۆی هاتنە ئارای کۆمەڵگەی سیاسی. دیموکراسی جارێکی تر دووبارەی دەکەینەوە جەختدەکاتەوە لەسەر سەربەخۆیی سیستەمی سیاسی، بەڵام لە هەمان کاتدا توانای ئەو سیستمەش دەسەلمێنێ لە دامەزراندنی پەیوەندیی لە ژیانی گشتیدا لەسەر هەردوو ئاستەکەی تر، بەڵام دواجار ئەوە کۆمەڵگەی مەدەنییە کە ڕەوایەتی دەبەخشێتە دەوڵەت. لێرەوە، دیمەکراسی تەنها دەسەڵاتی گەل نییە، چونکە ئەم وشەیە هەڵگری ئاڵۆزییەکی ئەوتۆیە کە مرۆڤ دەتوانێ بە چەندین مانا تەئویلی بکا، بگرە دەتوانی بە ئەندازەیەك تەئویلی بکا پاساو بۆ رژێمە دەسەڵاتگەر و سەرکوتکەرەکان بێنێتەوە. ڕاستتر دیموکراسی واتە گۆڕینی ئەو لۆجیکەی کە لە دەوڵەتەوە دادەبەزی بەرەو سیستمی سیاسی و پاشان بەرەو کۆمەڵگەی مەدەنی، بە لۆجیکێکی تر کە لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە، واتە لە کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بەرەو سیستمی سیاسی و پاشان بەرەو کۆمەڵگەی مەدەنی، بە لۆجیکێکی تر کە لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە، واتە لە کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بەرەو سیستمی سیاسی و لەویشەوە بۆ دەوڵەت.. ئەم دۆخەش سەربەخۆیی لە دەوڵەت ناسەنێتەوە هەروەك چۆن سەربەخۆیی لە سیستمی سیاسی داناماڵێ. چونکە فەرمانڕەوایی نەتەوەیی یان لۆکاڵی کە لە خزمەتی ڕاستەخۆی ڕای گشتیدا بێ چەندین دەرهاویشتەی خەمناکی لێدەکەوێتەوە. مەسئولیەتی دەوڵەت ئەوەیە کە بەرگری لە وادەیەکی درێژخایەن بکا دژی وادەی کورتخایەن،

هەروەها دەبێ بەرگری لە یادەوەری گشتی و کەمینەکان بکا، کاربکا بۆ هاندانی ئەفراندنی رۆشنبیری تەنانەت گەر ئەو داهێنانە هاوتاش نەبێ لەگەڵ داخوازی پانوپۆری جەماوەردا. هەروەهل پێویستە حزبەکان هاوئاهەنگی راستەوخۆی داخوازیی چینە کۆمەڵایەتیەکان و گروپەکانی بەرژەوەندی نەبن. حزبە میللییە جەماوەرییە گەورەکان لە هەموو شوێنێك، بە جۆرێك لە جۆرەکان، مەترسی بوون بەسەر دیموکراسییەوە زیاتر لەوەی بەرگریکار بن لە دیموکراسی. یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانی دیموکراسی لە ئەمریکا لەوەدایە کە جیاکارییەکی تەواوی کردووە لە نێوان کۆمەڵگەی مەدەنی و سیستمی سیاسیدا. دیموکراسی ئەمریکی دەسەڵاتی "نوێنەرانی گەل"ی جێگیر کردووە لە ئاست دەوڵەتدا، هەروەك چۆن ئەو دەسەڵاتەی جێگیر کردووە لە ئاست کۆمەڵگەدا. نابێ ئەرکی سەرەکی سیستمی سیاسی، هەروەها ئەرکی سەرەکی دامەزراوەی سەرەکی ئەو سیستمە کە پارلەمانە، تەنها پشتیوانیکردن بێ لە پرۆسەی بەرێوەبردنی وڵات، هەروەها نابێت ببێتە مەڵبەندی پێگەیاندنی پیاوانی دەوڵەت. بەڵکو رۆڵی سەرەکی ئەو سیستمە بریتیە لە دروستکردنی یاسا و هەموارکردنی تا رەنگدانەوەی دۆخی رای گشتی و بەرژەوەندییەکانی بێ. پێویستە سیستمی سیاسی پرنسیپەکانی یەکێتی لە هەمەجۆریی هێزە چالاکەکانی کۆمەڵگاوە هەڵێنجێ. هەندێ جار سیستمی سیاسی ئەو کارە لەسەر بناغەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت ئەنجام دەدا، هەندێ جار بەپێچەوانەوە، دان و ستان و هاوپەیمانی لە نێوان گروپە بەرژەوەندی – پارێزە جیاوازەکاندا ئەنجام دەدا. بەمجۆرە، گوزارشتەکانی لە بابەتی "دیموکراسی میللی" یان "دیموکراسی راپرسی" دان گوزارشتگەلێکی بێ مانا و بێ سوودن. چونکە دیموکراسی نێوەندێکی دامەزراو ئاسایە لە نێوان دەوڵەت و ئەو کۆمەڵگەیەی کە لە ئازادیدا پشتئەستوورە بە سەروەریی نەتەوەیی.

ئەم رۆڵە ناوەراستە، سەربەخۆیی سیستمی سیاسی و دادوەری دەستەبەردەکا. دەشێ گەشەی دیموکراسی شیبکەینەوە بەوەی سەندنەوەیەکی سەخت و مەترسیدار و بەردەوامی سەربەخۆیی سیستمی سیاسی و دادوەرییە لە ئاست دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنیدا. ئەڵبەتە ئێمە پەلە ناکەین و پرسی نوێنەرایەتیکردنی هێزە سیاسییە چالاکەکان بۆ کۆمەڵگا بە کەم ناگرین، چونکە ئێمە وتمان کاری ئەو هێزانە تەنها نوێنەرایەتیکردنی چەند ئەڵقەیەکی دیاریکراو یان چەند گروپێکی بەرژەوەندی پارێز نییە، بەڵکو ئەوان لە نوێنەرانی گەل زیاتر سیفەتی نوێنەرایەتیکردنیان هەیە. وشەی (نوێنەرانی گەل) کە هاوواتای وشەکانی کۆمەڵگە و دەوڵەت و نەتەوەیە، هەموویان پێکەوە وتەزاگەلێکی سیاسی ئاشکران. چونکە ئەوە هێزە کۆمەڵگەییەکانن ئەو یاسا و بریارانە دروستدەکەن کە لەسەر خاکی نەتەوەیی جێبەجێ دەکرێن. رای گشتی قایل نییە بەو کەسە سیاسیانەی کە خۆیان وەك بەرگریکار لە بەرژەوەندییە تایبەتەکان نیشان دەدەن. کاتێکیش حزبێکی سیاسی، وەك پارتی سەوزی ئەڵمانیا بۆ نمونە، سەربەخۆیی دەنگدەرەکانی تا ئەوپەری بەرتەسك دەکاتەوە و جۆرێك لە بریکارییان پێ دەبەخشێ کە چەند پابەندبوونێکی دیاریکراو لە ئەستۆ دەگرن و پەیمان دەدەن بەرلەوەی نوێنەرایەتیکراو بن خۆیان نوێنەری حزبەکە بن، هەروەها دەبێ ئەوانەی لەسەر یەك لیست هەڵبژێردراون لە کاتی کاری پارلەمانیدا

له نێوان چەند ماوەیەکی کورتدا جێگۆڕکێ بکەن.. حزبێکی لەو جۆرە، بەر لە هەر شتێك، ئەوە دەسەلمێنێ کە توانای نییە بزاوتی کۆمەڵگەیی بکاتە بزاوتێکی سیاسی، هەر بۆیە دووچاری پەشێوی ناوەکی دەبێتەوە و هێندە نابا لە ژێر باری سەختی ئەو دۆخەدا ئەندامەکانی دابەشدەبن بەسەر (فەندەمێنتاڵیستەکان) و (واقعیەکان)دا.

بەڵام ئەو سنورانەی پەیوەندیدارن بەلایەنەکەی ترەوە، لایەنی پەیوەندییەکانی نێوان سیستەمی سیاسی و دەوڵەت، تێپەڕاندیان زۆر سەخت و گرانە، بەجۆرێك جیاکاری لە نێوان ئەو دوو وتەزایەدا لە زۆر وڵاتدا پەسەند نیە و تێگەیشتن لەو بارەیەوە ئاسان نییە، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کە خاوەن کەلەپورێکی کۆمارین وەك فەرەنسا. زۆر جار ئەندام پارلەمان لە فەرەنسا دەبێتە عومدەی شار و هەوڵیش دەدا ببێتە وەزیر. لێرەدا سوودی زۆری سیستمی سەرۆکایەتی بەدی دەکەین، وەك ئەوەی لە ئەمریکا هەیە، چونکە بەپێی ئەو سیستمە پارلەمانتارەکان یاسادانەرن، بەڵام لە فەرەنسا زۆربەی ئەو یاسایانەی کە پارلەمان بڕیاریان لەسەردەدا لە بنەڕەتدا لەلایەن حکومەتەوە دەرچوون، زۆربەی ئەو بڕیارانە جۆرێکن لە هاوسەنگی ڕاگرتن لە نێوان یاسای نیشتمانی و ڕێنمایی ئەوروپیدا. ئیدی لە دۆخێکی لەمجۆرەدا چۆن دەتوانین جیاکارییەکی ڕوون ئەنجام بدەین لە نێوان سیستمی سیاسی و دەوڵەتدا؟ بەڵام دەبێ لەبەر خاتری دیموکراسی ئەو کارە بکەین. گەر لە زۆبەی وڵاتانی خۆرئاوادا ئەم دۆخە جۆرێك لە لاوازی بخوڵقێنێ، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو جیاکارییە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لە زەینیەتی (هاوڵاتیان)دا ئامادەیی نییە. لە سەردەمی ئایدیۆلۆجیای کۆماریی شکۆداردا، هەڵسوڕاو بیریارە سیاسیەکان بڕوایان وابوو کە حکومەت لە هەر وڵاتێکدا گوزارشت لە ژیانی کۆمەڵگەیی و فیکری سیاسی ئەو وڵاتە دەکا. بەڵام ئەم بۆچوونە تەنها وەهمێك بوو لە وەهمەکان، چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی دەستەویەخە، کە هەندێ جار راستەوخۆ و هەندێ جاریش ناڕاستەوخۆ بوو، بە ئەندازەیەك ئاشکرا بوو کە ئەم دیدە بۆ حکومەت دەبووە دیدێکی واقعی، وەك دیدێکی یاسایی و کۆمەڵگەیی پەتی. بەڵام ترسناکترین وەهم ئەو وەهمەیە کە هەندێ پێیان وایە بنیاتنانی یەکێتی ئەوروپا بریتیە لە تێپەڕاندنی بەرژەوەندیی نەتەوەیی و ململانێی نێوان دەوڵەتەکان و نەتەوەکان، ئەو کەسانە چەند بیرۆکەیەکی ئاشتی خوازانە پێشنیاز دەکەن کە بیرۆکەگەلێکی ئاسان و ڕوونن و لە بەڵگەکانیاندا پەنادەبەن بۆ ئەگەری ئەو مەترسیانەی کە بوونیان نەماوە، وەك ئەگەرەکانی ململانێ لە نێوان وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاواییدا. بەڵام ئەو ئەوروپایەی لە دروستبووندایە بەرپرسیارێتی دەوڵەتی لەسەر شانە، ئەگەرنا ئەوا وەك هێزێکی بێدەسەڵات و کەمتەرخەم دەردەکەوێ.

لە ڕاستیدا سیستمی نەتەوەیی لە ئەوروپا بەدەست لاوازییەوە دەناڵێنێ. لەلایەکەوە چەندین لێهاتوویی و شارەزایی دەبینین کە ڕوویان کردۆتە برۆکسل، لەلایەکی ترەوە فۆرمەلەبوونی چەندین گروپی بەرژەوەندیپارێز و فشار دەبینین کە لە نێوان دوو هەڵوێستدا دێن و دەڕۆن: یان دەبێ بە هیچ جۆرێ پشت نەبەسترێ بە سیستمی سیاسی، بەڵکو تەنها بایەخ بدرێ بە هۆکانی ڕاگەیاندن. یان دەبێ فشارێکی راستەوخۆ بخرێتە سەر دامەزراوە ئەوروپیەکان. هەروەها کارکردن بۆ گشتیکردنی ئابوری دەبێتە هۆی دابەشبوونی داوا

کۆمەڵگەییەکان تا ئەوپەڕی، ئەوەش سیستمی سیاسی و دەوڵەت لاواز دەکا. گەر دەوڵەتێکی ئەوروپی نەیەتە کایەوە و گەر لە ئاست ئەو دەوڵەتەدا ئیعتراف بەسەربەخۆیی سیستمی سیاسی و نەتەوەیی نەکرێ، ئەوا دیموکراسی جێگیر نابێ و بەرەو مەرگ دەڕوا. بەم مانایە، بەرەنگاربوونەوەی ڕێکەوتنی ماسترێخت، لەسەرو هەمووشیانەوە ئەوەی لە دانمارك دژی ئەو ڕێکەوتنە نیشان درا، دەرهاویشتە و کاریگەریی پۆزەتیڤی هەبوو. چونکە هەرچەندە ئەو ڕێکەوتنە زۆر ڕوون بوو سەبارەت بە دروستکردنی دراوێکی یەکگرتوو، بەلآم سەبارەت بە سیاسەتە کۆمەڵگەییەکان تەمومژاوی بوو، جگە لەو بێدەنگییەی کە لە بەرامبەر پرسی دابەشکردنی بەرپرسیارێتی لەسەر ئاستی ئەوروپیی و نەتەوەیی لە ڕێکەوتنەکەدا هەبوو. بەلآم لە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مەسەلەکە پێچەوانەوە بوو، چونکە دۆڕاندنی جۆرج بوش (لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی 1992)دا کە سەرقاڵی سیاسەتی نێو دەوڵەتی بوو، هەروەها بردنەوەی ڕکەبەرە دیموکراتەکەی کلینتون، بەر لە هەرشتێك سەرکەوتنی سیاسەتی "مینیگ"[3] یان دەرخست، ئەو سیایەتەی (مایکڵ لارنەر) داپڕشت، کە لەگەڵ خواستی دەنگدەراندا یەکدەهاتەوە بە ژیاندنەوەی ئەو سیستمە سیاسییەی کە بەهۆی بایەخدانی زیاتری دەوڵەتی ئەمریکا بە سیاسەتی جیهانی پەراوێز خرابوو، ئەو پەراوێز خستنەش دژی بەرژەوەندی ڕاستەوخۆی هاولآتیان بوو بەتایبەتی ئەوانەی کە بێکار بوون و بە دەست کەموکورتیەکانی سیستمی چاودێری کۆمەڵگەییەوە دەیانناڵاند. لە ڕوسیا ترسناکترین کێشە کێشەی نەبوونی سیستمی سیاسی بوو لە دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤێتەوە، بەلآم لە پۆڵۆنیا و هەنگاریا تەنانەت لە چیکۆسلۆڤاکیای پێشوش سیستمی سیاسی دروستکرایەوە.

لەو ولآتانە، بەتایبەتی لە پۆڵۆنیا، ئەوە سەلمێنرا کە دەکرێ داواکاریە کۆمەڵگەییەکان جێبەجێ بکرێن و کەلێنی نێوان ئابوری کراوە بە ڕووی بازاڕ لەلایەك و دانیشتوان لەلایەکی ترەوە، کە دوو مەیلی بەرگی جڵەی دەکردن: نەتەوەیی و میللی. ئیتر ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لاوازیی سیستمی سیاسی لە بنەڕەتیدا زادەی لاوازیی و بێ سەروبەرییە لە ولآتانی ئەمریکای لاتین، لە مەکسیکەوە تا ڤنزوێلا و پیرۆ، بەلآم دەبینین پتەویی سیستمی سیاسی لە چیلی ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەو سەرکەوتنەی لە هەموو بوارەکانی ئەو ولآتەدا ڕوویدا. هەروەها دەبینین سیستمی سییاسی لە بەرازیل نەکەوتە هەمان ئەو قەیرانەوە کە دەوڵەت دووچاری هات.

جیاکردنەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی لە کۆمەڵگەی سیاسی و دەوڵەت مەرجێکی سەنتراڵە لە مەرجەکانی دروستبوونی دیموکراسی. چونکە دیموکراسی بوونی نیە گەر ئیعتراف نەکرێ بە هەردوو لۆجیکی تایبەتی کۆمەڵگەی مەدەنی و دەوڵەت، کە دوو لۆجیکی جیاواز و زۆر جاریش ناکۆکن. هەروەها دیموکراسی بوونی نیە گەر سیستمێکی سیاسی سەربەخۆی (جیا لە دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی) لە ئارادا نەبێ، تا پەیوەندیی ئاڵۆزی هەردوکیان چارەسەر بکا. ئەمەش ئەوەمان یاد دەخاتەوە کە دیموکراسی فۆرمێك نییە لە فۆرمەکانی بوونی کۆمەڵگا بە گشتی، بەڵکو فۆرمێکی کۆمەڵگەی سیاسییە، هەروەها ئەوەشمان لە یاد دەخاتەوە کە مۆرکی دیموکراتی لە کۆمەڵگەی سیاسیدا بەندە بە هەردوو ئەو

مەسەلەیەوە، ئەوەش پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەیە کە بڕوای بە باڵادەستیی سیستمی سیاسی هەیە، واتە ئەو تێگەیشتنەی کە بانگەشەچیانی پەیمانی کۆمەڵگەیی بەرگریی لێدەکەن. هەروەها دیموکراسی بریتییە لەو پەیوەندییە سەربەخۆیانەی کە ڕۆڵ دەبەخشن بە دامەزراوە سیاسیەکان، واتە توخمێکی سەنتراڵە بۆ یەکخستنی کۆمەڵگە و پاراستنی ڕەوتی گشتی کۆمەڵگە. تیورە فەرمانخوازیەکان باسیان لە کۆمەڵگەکان دەکرد بەوەی چەند دامەزراوەیەکن پێکەوە یەکێتی و کامڵبوونی گشتی دەسازێنن، واتە ڕۆڵێکی یەکخەریان دەبەخشییە خێزان، قوتابخانە، نەریت و ئاینەکان بە جۆرێك ڕۆڵیان کەمتر نەبوو لە ڕۆڵی دامەزراوە سیاسییەکان. بەڵام دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی، بە پێچەوانەوە، ئامانجی سەرەکییان یەکخستنی کۆمەڵگە نییە. دەوڵەت "شەر هەڵدەگیرسێنێ"، واتە بەر لە هەر شتێك وەڵامی ئەو دۆخە نێو دەوڵەتییە دەداتەوە کە وڵات ملکەچیەتی. کۆمەڵگەی مەدەنیش، لای خۆیەوە، مەحکومە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان کە پەیوەندیگەلێکن لەسەر بنەمای ململانێ لەلایەك و هاریکاریی و دانوستان لەلایەکی ترەوە دامەزراون. تەنها سیستمی سیاسی بۆی هەیە کۆمەڵگە پێکەوە بخاتە گەڕ، چونکە ئەو سیستمە بەرژەوەندییە هەمە جۆرەکان و یەکێتی یاسا پێکەوە دەگونجێنێ، هەروەها پەیوەندیی لە نێوان کۆمەڵگەی مەدەنی و دەوڵەتدا بنیات دەنێ.

کەوابێ سنوردارکردنی دەسەڵات دەوڵەت پێویستی بە دوو مەرج هەیە: سەلماندنی کۆمەڵگەی سییاسی و سەربەخۆیی ئەو کۆمەڵگەیە لە یەك کاتدا، لە ئاست دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنیدا کە زۆر جار تێکەڵ بە کۆمەڵگەی سیاسی کراون. بەڵام ڕاستتر وایە، بە پێی شیکردنەوەکەی تالکوت بارسۆنز، وەزیفەی کۆمەڵگەی مەدەنی تەنها دیاریکردنی ئامانجەکان بێ. دواجار ئەو شیکردنەوەیە ترسێك دەخاتەوە سەبارەت بەو بانگەشانەی بۆ دیموکراتیزەکردنی دەوڵەت و کۆمەڵگە دەخرێنەگەڕ. چونکە دەوڵەت خۆی لە خۆیدا دیموکرات نییە، بەڵکو ئەرکی سەرەکی ئەو بریتیە لە بەرگریکردن لە یەکێتی کۆمەڵگەی نەتەوەیی و هێزی ئەو کۆمەڵگەیە لە بەرامبەر دەوڵەتە بیانیەکان و گۆڕانکارییە مێژوییە ستراتیجیەکاندا لەیەك کاتدا. ڕۆڵی دەوڵەت ڕۆڵێکی نێو دەوڵەتییە، هەروەها بەگریکارە لە یادەوەریی دەستەجەمعی، لە هەمان کاتدا بریتیە لە پێشبینی کردن و پلاندانانی ستراتیجی. هیچ یەکێکیش لەم ئەرکە بنەڕەتییانە پێویستیان بە دیموکراسی نییە. بەڵام چالاکی و بزاوتە کۆمەڵگەییەکان، کۆمەڵگەی مەدەنی چالاك دەکەن و فووی ژیانیان بە بەردا دەکەن. هەرچەندە مەرجی دیموکراسیەتی سیستمی سیاسی بریتیە لە نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان، بەڵام مەرج نیە ئەو هێزانە خۆیان لە خۆیاندا بە شێوازێکی دیموکراتیانە ڕەفتار بکەن. (دواجار) سیستمی سییاسی مەڵبەندی دیموکراسییە و دیموکراسیش مەڵبەندی سیستمی سیاسییە.

## سنورەکانی لیبراڵیزم

فیکری لیبراڵی لەگەڵ دیموکراسیدا یەکدێتەوە کاتێ ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە دەوڵەت ببێتە دەوڵەتی تاکە عەقیدەیەکی ئاینی یان تاکە سیستمێکی بەرەهایی کە بە دوور بێ لە سەروەریی گەل. زۆر جار ترسی فیکری لیبراڵی لە دەوڵەت، یان لە ئایدیۆلۆجیا و ئامادەسازیی میللی گەورە، ئەوەی

که ڕاڵف دارندۆرف بە بێزارییەوە ناوی لێنا "کەفوکوڵی هەست و سۆزی میللی" (دەربارەی شۆڕش لە ئەوروپا، ل 17).. زۆر جار ئەو ترسە پاساوی خۆی هەبووە، کە هەرچەندە هەندێ جار دراماتیکی بووە، بەجۆرێك دەبێ پێگەیەکی دیاریکراو بە لیبرالیزم لە فیکری دیموکراسیدا ببەخشین. تەنانەت قسەکردن لە جۆرێك لە دیموکراسی کە دژی لیبرالیزم بێ، خۆی لە خۆیدا قسەکردنێکە کۆدژی لە خۆ دەگرێ و زادەی ڕژێمێکی دەسەڵاتگەرە نەك مۆدێلێکی تایبەتی دیموکراسی. بەڵام سەرەڕای ئەم خاڵە لیبراڵیزم و دیموکراسی هاوواتای یەکتر نین. چونکە گەر (بووترێ) هیچ سیستمێکی دیموکراسی بەبێ لیبراڵیزم بوونی نییە، ئەوا (دەڵێین) زۆر ڕژێمی لیبراڵی هەن کە دیموکراتی نین. چونکە لیبراڵیزم قوربانی دەدا بە هەموو شتێك لە پێناو یەك ڕەهەندی دیموکراسیدا کە بریتیە لە سنوردارکردنی دەسەڵات. لیبراڵیزم ئەو کارە بەناوی تێگەیشتنێکی دیاریکراوەوە ئەنجام دەدا، کە بەهەمان ئەوەی دیموکراسی دەپارێزێ هەڕەشەیشی لێدەکا.

فیکری لیبراڵی بەرهەمی ترسە لە بەها، ترس لە فۆرمەکانی دەسەڵاتگەری کە ڕێزگرتن لەو بەهایانە دەسەپێنێ. ئەو فیکرە جیاکاری دەکا لە نێوان ئەقڵی بێ لایەن کە پێویستە ئەقڵی ژیان بێ بەڵام لە هەمان کاتدا ئەقڵی بەرژەوندی پاراستنیشە لەگەر ئاستی ئەو بیر و باوەڕانەی کە پەیوەستن بە ژیانی تایبەتەوە. ئەو فیکرە بڕوای بە بوونی ئەو هێزە کۆمەڵایەتییە چالاکانە نییە کە بەندن بە بەهاو پەیوەندییەکانیانەوە بە کۆمەڵگاوە. بەڵکو بڕوای بە بەرژەوەندی و مەیلە تایبەتەکان هەیە، هەروەها هەوڵدەدا کە گەورەترین بوار بڕەخسێنێ بۆ ئەو بەرژەوەندی و مەیلانە، بەمەرجێ ئەو کارە نەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە بەرژەوەندیی و مەیلی کەسانێکی تر. هەوڵدەدا بوارێکی باش ببەخشێتە "هەموو گروپێك لە گروپە مرۆییەکان لە پێناو بەدیهێنانی مەبەستە تایبەت و دەگمەنەکانیان، بە مەرجێ نەبێتە هۆی پێکاهەڵپژانی سەخت لەگەڵ ئامانجەکانی خەڵکانی تردا" هەروەك ئێزایا بێرلین ووتی. بەڵام بۆ ئەوەی پێکەوە گونجاندنی نێوان ئەم ئامانجانە کارێکی شیاو بێ، پێویستە خواستی گەیشتن بە ڕەهایەتی لە هەریەك لەو گروپانە بسەندرێتەوە، واتە دەبێ دەسبەرداری ئەوە بن کە ببنە عەقیدە، دەبێ تەنها خۆیان جۆرێك لە گروپی بەرژەوەندی، یان جۆرێك لە زەوق، جۆرێك دید و ڕا نیشان بدەن و خۆیان نەسەپێنن بەسەر کەسدا. واتە وێنەیەك بۆ ژیانی کۆمەڵگەیی کە جیگای عەقیدە و مەیلی کۆمەڵگەیی ریشەیی تێدا نابێتەوە، بەتایبەتی جێگای بیرۆکەی دەسەڵاتی تێدا نابێتەوە. لیبراڵیزم کۆمەڵگەی نمونەیی لە وێنەی بازاڕێکدا دەبینێ، لە دۆخێکی ئاوهایشدا دەستێوەردانی یاسا و دەوڵەت بە دوور نابینرێ، بەڵام دەبێ ئەو دەستێوەردانە لە پێناو سەپاندنی ڕێزگرتن بێ لە یاساکانی گەمەکە، هەروەها بۆ چاودێریکردنی کڕین و فرۆشتن و مامەڵە بەشێوەیەکی دروست، هەروەها دەستەبەرکردنی ئازادی ڕادەربڕین و کار بۆ هەموانە.

فیکری لیبراڵی تاپێی بکرێ جیاکاری دەکا لە نێوان خوودگەری و ژیانی گشتیدا. بە مانایەکی ڕوونتر جیاکاری دەکا لە نێوان داخوازی تاکەکەسەکان و ئەو ئەقڵەی ئاڵوگۆڕە کۆمەڵگەییەکان جڵەو دەکا. تێگەیشتنی لیبراڵی بۆ دیموکراسی تەنها پەیوەندی بە دەستەبەرکردنی ئازادی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایانەوە هەیە بێئەوەی باس لە ناوەڕۆکی کار و کردەوەکانیان بکا. ڕاڵف

دارندۆرف، پاش چەند بیریارێکی لیبراڵی تر، قسەیەکی لەمجۆرەی کرد کاتێ بەئاشکرا ووتی: "گرنگ دانان و هاوسەنگی – ڕاگرتن و ئاڵوگۆڕی جاربەجاری فەرمانڕەوایە لە ڕێگای چەند ڕێ و شوێنێکی هێمنانەوە وەك هەڵبژاردن بۆ نمونە" (ل 17). بەڵام ئایا ڕەوایەتی ئەم گروپە فەرمانڕەوایانە لەسەر چی دادەمەزرێ؟ لیبراڵەکان (لە وەڵامدا) باس لە گرنگی دان و چوونە ئاستی بەرژەوەندی گشتی دەکەن، بەڵام نەیارەکانیان جەخت لە دەسەڵاتی سەرمایەی ئابوری و کولتوری دەکەنەوە. لە ڕاستیدا ئەم دوو تەئویلە، کە لە ڕواڵەتدا دژی یەکترن، لە یەکترەوە نزیکن، چونکە لیبراڵیەکان نەسڵەمیونەتەوە لەوەی کە بڵێن خۆشگوزەرانی و موڵکداریێتی و فێرکردن.. ئەو شتانەن کە پێویستە بایەخیان پێبدرێ تا بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاو بگیردرێ و کارێکی ئەقڵی ئەنجام بدرێ. نوخبەی لیبراڵی زۆر ڕاشکاوانە بڕوایان بەوە هەیە کە کەسانی جێنتڵمان زەوقیان بەرزە و بە تواناترین کەسن لەوەی گوزارشت لە زەوقی خۆیان بکەن. لە هەمان کاتدا ئەو نوخبەیە ترسیان لە مەیل و ئارەزوی میللی هەیە. چونکە لیبراڵیزم وەك هەر فۆرمێکی ئەقلانی هاودژی دەبینێ لە نێوان ئەقڵ و سۆزی بەجۆشدا، هەروەها لە نێوان نوخبەی ئاقڵ و ئەو نوخبانەی ملکەچی هەواو هەست و سۆزن، لەوەشدا ئافرەتان، چینە میللیەکان، میللەتە کۆلۆنکراوەکان (داگیرکراوەکان).. هەموویان وەك یەك وان، کە دەبێ لە ژێر حوکمداری (سانیۆر پارس)[4]دا بن.لیبراڵیزم هەموو سیفەتێکی نوێنەرایەتیکردن لە کەسە هەڵبژێردراوەکان دەسێنێتەوە لە ئاست هێز و بزاوتە کۆمەڵگەییە چالاکەکاندا، هەروەها لە واقعدا هەموو کایەیەکی کۆمەڵگەیی ڕەتدەکاتەوە چونکە تەنها بڕوای بە ڕێکخستنی سیاسی و بەرژەوەندیەکان هەیە.. لێرەوە لیبراڵیزم حوکمی ئەوەی بەسەر خۆیدا داوە کە بایەخێکی پراکتیکی زۆر سنورداری هەبێ، هەرچەندە بایەخێکی ڕەخنەیی گەورەی هەیە. لیبراڵیزم توخمێکی بەردەوامە لە توخمەکانی دیموکراسی. بەڵام تەنها ناوچەیەکی ناوەڕاست و نێگەران پێکدێنێ کە دەکەوێتە نێوان هێزە سیاسییە نەیارەکانەوە، لە کاتێکدا ئەو هێزانە خاوەنی دیاریکردنێکی کۆمەڵگەیی یەکلاکەرەوەن، بەتایبەتی کاتێ دەبنە چینی کۆمەڵگەیی یان گروپی بەرژەوەندیپارێز. هەرچەندە لیبراڵیزام دژی سیستمە پادشایەتییە ڕەهاکان جەنگاوە، بەڵام هێندەی نەبردووە، پاش ڕوخانی ئەو سیستمە پادشاییانە، دژی بزاوتە میللیەکان جەنگاوە. لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، ئەو پێگەیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، لەلاوازبووندایە. لەمبارەیەوە چۆن دەتوانێ بەرگری لە نەزانینی خۆی بکا لە کاتێکدا ڕێچکە نەتەوەیی و مەزەبە ئاینیەکان بەشێکی گەورەی جیهانیان لە ئەستۆی خۆیان توند کردووە؟ لە وڵاتانێکیشدا کە ئابوری بازاڕ باڵا دەستە، مرۆڤ چۆن دەتوانێ ڕێگە بگرێ لە پارچەپارچە بوونی زەوق و بەرژەوەندییە تایبەتەکانی کۆمەڵگا، پاشا وردکردنەوەی بۆ زنجیرەیەك تایەفە و گروپی کۆمەلایەتی داخراو، کە هیچ شتێك پێکەوەیانەوە نابەستێ جگە لە بازاڕ، بازاڕیش ملکەچی باڵا دەستی ژمارەیەك بەرژەوەندیی داراییە کە جگە لە دیسپلینی سیاسی هیچ کۆیان ناکاتەوە؟ ئایا چیدی دەتوانین سیفەتی لیبراڵی بخەینە پاڵ کۆمەڵگەیەك کە شەپۆلی کڕین و فرۆشتنی سەهم ڕاپێچی کردبێ و ئیمپراتۆریەکانی پارە حوکمی بکا و فریوەکانی بەرخۆری (ئیستهلاکی) دەمامکدار گەمەی پێ بکا، کە ئارەزوە فەردیەکانی بازرگانی

بچێته سەرو داخوازیە کۆمەڵگەییەکانی بۆ شێوازی بازرگانی و دادوەری و یەکسانی؟ چیتر تیۆری (ویلفێر ستێت)[5] و ڕێچکە ناسیونالیستە نوێیەکان خۆیان لە ڕێگای تێگەیشتنی لیبرالییەوە بۆ کۆمەڵگا پێناسە ناکەن. هەرچی شێوازەکانی کۆمەڵناسییە دژی ئەو جیاکارییەی لێبرالیزمن لە نێوان بەرژەوەندییە تایبەتەکان و ڕێکخستنی کاروباری گشتی بەوەی وێنەیەکی یەکانگیر دەبەخشن بە کۆمەڵگە، کە لە یەککاتدا داخوازیی کولتوری و مەیلی کۆمەڵگەیی ئاراستەی دەکا، بە تێکەڵکردنی ئەو داخوازی و مەیلانەش هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان دروست دەبن، لەسەرو هەمووشیانەوە ئەو بزاوتە کۆمەڵگەییانەی کە کەرەستەی شیکردنەوەو چالاکی دابین دەکەن، ئەڵبەتە فیکری لیبراڵی بێ هوودە هەوڵی لەناوبردنی ئەو کەرەستانەی داوە.

فیکری لیبراڵی بە ڕەخنەگرتنی لە دەسەڵاتی ئۆتۆکراتی ڕێگەی خۆشکرد لە بەردەم دیموکراسیدا، بەڵام بەر لەوەی تۆتالیتاریزم ببێتە هۆی لێك نزیکبوونەوەی فیکری لیبراڵی و فیکری دیموکراسی، کە بە عەمەلی لە ڕێگەی پەیوەندییە ناجێگیرەکانیانەوە سەربەخۆیی خۆیان پاراست.. بووە ڕکەبەری دیموکراسی و لەگەڵیدا چووە جەنگەوە. لە پاش شۆڕشی فەرەنساوە فیکری لیبراڵی نەبرەیەکی کۆنزەرڤاتیڤی بەکارهێنا کە وردە وردە بەرەو هەڵکشان چوو. لە نوسینەکانی تۆکڤیلدا، کە بە توندی وەڵامی ئەو ڕۆژگارانەی شۆڕش دەداتەوە کە ساڵی 1848 بەخۆوەی بینی، ئەم پرسە بە ڕوونی دەبینین، ڕوونتریش لای (تین) پاشان (مۆسکا) دەیبینین، تەنانەت مۆسکا پەرگیری زۆرتر بەکاردێنێ. تەرجەمەی ئەمریکی کتێبەکەی ئەو "توخمەکانی زانستی سیاسەت" چینی سیاسی (*Classe Politique*)ی کردووە بە چینی باڵادەست (*Ruling Class*)، هەرچەندە شیکردنەوەی بۆ ئەو چینە لە چاپی زیادکراوی کتێبەکەیدا کە لە ساڵی 1923دا بڵاوبۆتەوە زۆرترین ڕووبەری گرتۆتەوە. جیاکاری لە نێوان سیاسەت و ئابوریدا لەمپەرێکی کۆمەڵگەیی دروستدەکا لە نێوان ئەو کەسانەدا کە شیاوی فەرمانڕەواین و ئەو کەسانەی کە شیاو نین. لەمپەرێك کە ڕەنگ بوو تێپەڕاندنی لە شوێنێکی وەك باشوری ئیتالیا زەحمەت بووبێ، چونکە مۆسکا لەوێ لەدایك بوو بەر لەوەی پۆستی بەرز لە بەریتانیای مەزن و فەرەنسا وەرگرێ. بەڵام ناوبانگێکی لەوجۆرەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبوو، هەرچەندە هارڤرد و یاڵ تا ماوەیەکی زۆر ڕابەر و فەرمانڕەوەکانیان بۆ ئەو وڵاتە دەنارد. (واتە) ئەم ئەقڵانیەتە لیبراڵییە درێژبوونەوەی کەلەپوری ماکیاڤیلین، چونکە زۆرترین بایەخ دەدا بە کێشەی ئەگەرەکانی فەرمانڕەوایی نەك کێشەی نوێنەرایەتیکردن.

ئەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا ڕوویدا ئەوەبوو کە چەند پرنسیپێکی وەك بازرگانی و یاسا وەك پرنسیپی پێکهێنەری گردبوونەوەی کۆمەڵگەیی، کە مۆسکا ناویان دەنێ پرنسیپی کۆمەڵگەیی، لە ئارادا نەمان. بەڵکو فیکری نەتەوەیی بووە پێکهێنەری کۆمەڵگا. ئەو فیکرانەی کە بایەخیان دەبەخشی بە یەکێتی گروپە کۆمەڵگەییەکان زیاتر لە بایەخدانیان بە پەیوەندییە ناوکیەکان.. وەرچەرخانیان بەرەو فیکری نەتەوەیی ئاسانکرد و بیرۆکەی ململانێی چینەکانیان کردە بیرۆکەیەکی گراندەست، بەو پێیەی بیرۆکەیەکی کۆمەڵگەییە زیاتر لەوەی سیاسی بێ. هەرچەندە بایەخدانی زیاتر بە کاروباری سیاسی هەندێ جار هەڵگری زەینیەتی

ئازادییە، بەڵام لە هەمان کاتدا و هەندێ جاری تر خۆراك دەبەخشێ بە ڕژێمە دەسەلاّتگەرەکان، کاتێ بەناوی یەکخستنەوە ئەو شتانە وەلادەنێ کە دابەشکەرن. هەڵکشانی فیکری ناسیونالیستی بەڵگەی ڕوونی ئەو ڕاستییەیە.

سەرەتای سەدەی بیستەم، تەقینەوەی بزاوتە شۆڕشگێرەکان کە شۆڕشی روسیا و هەنگاریا و کۆششەکانی شۆڕش لە ئەڵمانیا و قەیرانی کۆمەڵگەیی گەورەی ئیتالیای 1920ی لێکەوتەوە، هەروەها بووە هۆی پەرچەکرداری فاشیزم و گۆڕینی ماکیاڤیلیەتی لیبراڵی بۆ ماکیاڤیلیەتی کۆنەپەرست.. ئەو دۆخە، هەروەك نوربرتۆ بۆبیۆ ئاماژەی پێدەدا، مۆسکاری هاندا ئاراستەیەکی دژە شۆڕش بگرێتەبەر و هەروەك (مایکلز) پشتیوانی لە فاشیزمی مۆسۆلێنی بکا، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەو پشتیوانییە پشتیوانیەکی لیبراڵیانە بوو. مۆسکا لە تەمەنی لاوێتیدا بڕوای هێنا بەو جیاکارییە توندەی کە سپنسەر لە نێوان کۆمەڵگەی سەربازی و کۆمەڵگەی پیشەسازیدا ئەنجامی دابوو، کە فیوداڵی و بیرۆکراتی ناوی بردن، بەلاّم پاش کامڵبوونی، دیموکراسی تێکەڵ بە لیبراڵیزم کرد. لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستە هەڵوێستێکی نێوەندگیرە، هەڵوێستێکی دژ بە دیموکراسیشە، چونکە وەك لە پێناسەکەیدا دەردەکەوێ دیموکراسی دەکاتە ڕژێمێك کە ڕێگە لە کەس ناگرێ ئینتما بکا بۆ نوخبەی فەرمانڕەوا. گەر دیموکراسی بە بناغەی کۆمەڵگەیی فەرمانڕەواکان دەستنیشان بکرێ، ئەوا زۆر دوور دەکەوێتەوە لەوەی ببێتە فەرمانڕەوایی گەل. مۆسکا، وەك زۆربەی لیبراڵەکان کە لە رۆسۆوە دەست پێدەکەن، پێیوایە کارێکی دژوار و (کۆدژە) گەر مرۆڤ وێنای ڕژێمێك بکا کە فەرمانڕەوایی بە دەستی زۆرترین خەڵکەوە بێت و تەنها کەمینەیەك فەرمانڕەوایی بکرێن.

بیرۆکەی دیموکراتی تەنها ئەو کاتە گەشەی بەخۆوە بینی کە ئەو درزە کۆمەڵگەیییە سیاسییەی چارەسەر کررد، ئەو درزەی کە کۆمەڵگەی لەسەر دوو ئاست دابەشکردبوو (دەکرێ لێرەدا بەڵگەی کۆدژیی نێوان هاولاّتی چالاك و هاولاّتی خاووخلیچك بێنینەوە). ئەو چارەسەرە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگای دەنگدانی گشتییەوە لە فەرەنسا ساڵی 1848 ئەنجام درا، پاشان لە ڕێگای بەگەڕخستنی دەزگا سیاسیەکانەوە و بەستنەوەی بە جێبەجێکردنی داخوازییە میللییەکانەوە، چونکە ئەو داخوازیانە لە بەرەنگاربوونەوەی هەژمورونی بەرژەوەندییەکاندا، داوایان دەکرد پەنابرێ بۆ ئەقلاّنیەتی تەکنیکی و ئابوری، پاش ئەوەی سەردەمانێکی دژیژ هەمان ئەو ئەقلاّنیەتە دژی ئەوان بەکارهات. سەرەڕای بەشداری ئایدیۆلۆجیای سۆشیالیزم (نەك بزاوتی کرێکاری) لە دروستکردنی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاری دژ بە دیموکراسی، بەلاّم بزوتنەوەی کرێکاری زەمینەیەکی پتەوی بۆ دیموکراسی بەرهەم هێنا. دووریی فیکری دیموکراتی لە ئایدیۆلۆجیای شۆڕشگێرانە کەمتر نییە لە دووریی ئەو فیکرە لە ئایدیولۆجیای لیبراڵی.

بەلاّم لە جیهانی هاوچەرخدا، کە لە لایەکەوە دەوڵەتی بڕیاربەدەست و لەلایەکی ترەوە ڕژێمی نەتەوەیی و دەسەلاّتگەر بالاّدەستن، چیتر فیکری لیبراڵی ناتوانێ بەشێوەیەکی سەلبی لە ئازادی تێبگا. دەکرێ لەمبارەیەوە ئیزایا بێرلین بخوێنینەوە، چونکە ناوی ئەو بەستراوەتەوە بە دژایەتیکردنی دوو تێگەیشتنەوە بۆ ئازادی سەرەتا دەڵی جیهانی نوێ بڕوای بە هەقیقەتە ئەبەدییەکان

و سروشتی سەرمەدی مرۆڤ نەماوە، ئەمەشش پێچەوانەی دیدی فەیلەسوفانی ئەقلانی چاخی رۆشنگەرییە. بەلام لە هەمان کاتدا پێیوایە ئەو جۆرە ئەقلانیەتە سیستماتیکە سەرچاوەی ئەو دیدە یۆتۆپیانە بووە کە هەمیشە مەترسی بووە لەسەر دیموکراسی. لە یۆنانی کۆن و لە قۆناغی کلاسیکی جیهانی مۆدێرندا فرە جۆر بوون، پاشان لەگەڵ ئەقلانیەتی هیگڵ و مێژووگەریی مارکسدا فۆرمی نوێیان بەخۆوە بینی. لە هەموو سەردەمێکدا دیدە یۆتۆپیەکان تێزی بوونی کۆمەڵگەیەکی تەواو، پاشان کۆمەڵگەیەکی وەستاویان پێشکەشکردووە کە کۆمەڵگای سەرمەدین (بێ سەرەتاو بێکۆتا) هەروەك چۆن یۆتۆپین، بە جۆرێك تێزگەلێك بوون کە هیچ بوارێکیان بۆ گفتوگۆی سیاسیی کراوە نەهێشتۆتەوە. پاشان بێرلین وای دەبینێ کە دابڕان لەگەڵ ئەو فەلسەفە وشکەی رۆشنگەری لە ژێر گورزی *Sturm Und Drang*[6] دا،پاشان لە ژێر گوشاری رۆمانسیەت و فەلسەفەی هێردەر و فیختەدا.. بووە هۆی سەپاندنی فرە بەهایی و لە دایکبوونی کۆمەڵگەی کراوە. بانگەشەکردن بۆ تایبەتمەندیی هەر کولتورێك بۆ خۆی رێگەی خۆشکرد لەبەردەم سیاسەتی خودی بکەر و سیاسەتی رەسەنایەتی و داهێنانی ئەو خودە، تا جێگەی ئەو ئایدیانە بگرێتەوە کە ستەمی رۆشنگەری بە هەموو ئەقلانیەتی دەسەلاتگەریانەی خۆیەوە هەڵیگرتبوون. ڕەنگە کەسانێك کۆدژییەکی ئاشکرا لەم دەسپێکە دەگمەنەدا ببینن، چونکە زۆر جار وتراوە کە ئەقلانیەت دەرفەتی پەیوەندیی و یەکترناسینی بۆ هەموان ڤەخساندووە، لە کاتێکدا بانگەشەکردن بۆ تایبەتمەندیی کولتوری هەموو مرۆڤێك دەکاتە بەندکراو لە چوارچێوەی کولتورێکی نەتەوەیی دیاریکراو و قۆناغێکی دیاریکراوی مێژودا. هێندە نابا ئیزایا بێرلین ئەم کۆدژییە (تناقض) چارەسەر دەکا. داخۆ جیهانی نوێ چۆن بتوانی لەسەر بناغەی فرەیی کولتوری (ئازادی) بنیات بنێ، چۆن دەکرێ خۆی بپارێزی لەوەی نەکەوێتە (داوی) ناسیونالیزمەوە کە دەشێ تا ئەوپەڕی بڕوا؟ لە ئاست ئەم دوو پرسیارەدا کە کەس ناتوانێ خۆی لێیان غافڵ بکا، پێویستە مرۆڤ وەلام بداتەوە بەوەی کە ئازادی لە بەردەم مەترسیدایە، بە هەموو ئەو شێوازانەی تێگەیشتنەوە کە مرۆڤ دەتوێنێتەوە لەناو ئەو کۆمەڵە سروشتییە یان ئەو قۆناغە مێژوییەی ئینتمای بۆ دەکا. چونکە ئیتر رۆڵی دەوڵەت دەبێ بە ئازادکردنی نەتەوەیەك یان چینێك، ئیتر تاکەکەس بە پێی ئەو رۆڵە دەبێتە کۆیلەی ئەو کۆمەلانە و کۆپلەی ئیرادەی گشتی، هەروەك رۆسۆ (کاتی خۆی) گوزارشتی لێکرد. ئیزایا بێرلین جەخت دەکاتەوە لەسەر رۆڵی ئیجابی فرە کولتوری، بەلام لە هەمان کاتدا دژی ئەو توانا گشتگیرەی دەوڵەتە کە لەگەڵ تایەفەیەکی دیاریکراودا یان لەگەڵ قۆناغێکی مێژویی دیاریکراودا شوناسدەگۆڕێتەوە. لێرەوە دەکرێ دژایەتی دیکتاتۆریەتی زۆرینەش بکەین، واتە بەرگری بکەین لە خودی داهێنەر و ئەفرێنەری تاکەکەس دژی دیدی بالادەست و بەرژەوەندییە باوەکان. بەمجۆرە دوور دەکەینەوە لەو دژبوونە درۆزنەی کە لە نێوان ئازادی نەریخواز و ئازادی ئەرێخوازدا هەیە "ئازادبوون لە (...) و ئازادبوون بۆ (...)"[7] وەکئینگلیز دەڵێن. باشتر وایە باس لە دوو ئازادی بکەین، دوو ئازادی نەریتخواز، یەکێکیان ڕزگاربوونە لە دەوڵەت و ئەوی تریان ئازادبوون لە ئینتما کۆمەڵگەییەکان. هەر لە ڕێگای ئەم بانگەوازەوە بۆ

خود دەگەینە ئازادی، دوور لە تایەفەگەری سەرکوتکەر.

ئەم ڕێگا پێچاوپێچەی کە ئازادی هاوچەرخ گرتوویەتیە بەر دوورە لە ئەقلآنیەت، بەلآم لە ژێر هەڕەشەی هەواداریی ناسیونالیستی و ئایدیولۆجیای چینایەتیشدایە.. ڕێگایەکی پڕ نشێوە، بە جۆرێك لیبرالییەکی وەك ئیزایا بێرلین لە ژێر فریوی گەڕانەوە بۆ ئەو ئەقلآنیەتە یەکخەرەدا دەمێنێتەوە کە لێوەی دەستی پێکردووە، هەر بۆیە مانایەکی سانا دەبخشێتە ئازادیی نەریتخواز کە نەیارە لەگەڵ ئەو دەسەلآتەی بەناوی سروشت یان بە ناوی مێژووەوە قسە دەکا. بەلآم ئەو ڕێڕەوەی بێرلین لە سەری دەڕوا سەرنج ڕاکێشە، چونکە ئازادی ئەرێخواز کە ئەڵبەتە دەشێ دیکتاتۆریەت بەرهەم بێنێ، بەشێوەیەکی (ئیباحی) بەرجەستە دەبێ، وەك ئەوەی بەرگریکردن بێ لە مافەکانی مرۆڤ دژی کۆمەڵگە و دەوڵەت لەیەك کاتدا. ئازادی مۆدێرن تەنها باس لە تاکگەرییەکی وەهمی ناکا، بەڵکو خۆی دادەبڕێ لە تواندنەوەی تاك لەگەڵ ئاستی سروشتی و کۆمەلآیەتیدا بەشێوەیەکی ئەفلاتۆنی، تا بچێتە خزمەتی جۆرێك لە خودەوە کە دەشێ فرەیی کۆمەڵگەیی و کولتوری لەناوی بەرێ، بەلآم هەر ئەو فرەییەش مەرجی سەلماندنی خود و بوونی خودە.

هێزی لیبرالیزم لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە لەم سەدەیەدا دیموکراسی دووچاری چەندین پەلاماری بەهێز بۆتەوە لەلایەن ڕژێمە تۆتالیتاری و دەسەلآتگەرەکانەوە. بەلآم لە کاتێکدا ئەو دەوڵەتانە خۆیان کردبووە زمانحاڵی کولتورێکی تایبەت، دۆخێکی ئابوریی دیاریکراویان ئاڕاستە دەکرد، ئایدیولۆجیایەکی دیاریکراویان دەسەپاند، بگرە هەندێ جار خۆیان کردبووە باڵی چەکداری ئاینێکی تایبەت.. لە کاتێکی وادا ئایا پێویست نییە بەرگری لە دیموکراسی بکەین و هەموو جۆرە دەسەلآتێکی خۆسەپێن ڕەتبکەینەوە، هەروەها دان بنێین بە جیاوازیی تەواو لە نێوان هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگەییدا، جیاکاریی تەواو ئەنجام بدەین لە نێوان ئاین، سیاسەت، ئابوری، پەروەردە، ژیانی نەتەوەیی، خێزان و هونەر و.. هتد.؟ فیکری دیموکراسی بە پەلەی یەکەم دژی چڕکردنەوەی سامان و چڕکردنەوەی دەسەلآت جەنگاوە، بەلآم دەبینین کەسێکی وەك مایكڵ والزەر پێیوایە ئەرکێکی لەو جۆرە تەنها لەلایەن دەوڵەتێکی بەتواناوە ئەنجام دەدرێ کە دەسەلآتی خۆی بسەپێنێ بەسەر هەموو کۆمەڵگەدا، هەربۆیە پێویستە ئامانجێکی سەرەکی بۆ خۆمان دیاری بکەین، ئەویش بریتییە لە سەلماندنی سەربەخۆیی هەر بازنەیەك لە بازنەکانی ژیانی کۆمەڵگەیی و ڕێزگرتنیان لەلایەن هەموانەوە، هەروەها کارکردن بۆ سنورداركردنی جیاوازیەکانی ناو هەر یەکێك لەو بازنانە. واتە "پێویست ناکا خێروخێراتی (س) کە بەشێکە لە خێروخێراتی کۆمەڵگە دابەشبکرێ بەسەر ئەو ژن و پیاوانەدا کە خێروخێراتی تریان هەیە (ص)، تەنها لەبەرئەوەی ئەوان (ص) یان هەیە بێ ئاوڕدانەوە بۆ دەلالەتی (س).." (بازنەکانی ئازادی، ل 20). چالاکترین خەباتی دیموکراتی ئەو خەباتەیە کە دژی دەستبەسەرداگرتنی دەسەلآتە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە سەروەت و سامانیان هەیە. هۆکاری ئەم خەباتە دەگەڕێتەوە بۆ تێزێکی سۆسیۆلۆجی کلاسیکی کە دەڵێ دەبێ جیاوازی بکرێ لە نێوان سیستمە کۆمەڵگەییە فەرعیەکان لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، پاشان داوا دەکا هەموو سیستمە گشتییەکان پارچە پارچە بکرێن و

ئیعتراف بکریٚ بەسەربەخۆیی بازنەکانی هونەر، ئابوری، ئاین و.. هتد.

بەلاٚم ئەمجۆرە تێگەیشتنە کە بەرەو بیرۆکەی پوکانەوەی دەوڵەت دەڕوا، لیبراڵییەکان بەرگییان لێکرد هەروەك چۆن مارکس لە سەدەی نۆزدەیەمدا بەرگری لێکرد، تێگەیشتنێکە پەسەندکردنی زەحمەتە چونکە کاری سیاسی بە درۆی خستۆتەوە، لەسەرو هەمووشیانەوە ئەو کارو رەفتارانەی کە لە سایەی رژێمە دیموکراتیەکاندا ئەنجام دراون. پێش هەموو شتێك ئەو تێگەیشتنە پێناسەیەك دەبەخشیٚ بە بازنەی کاری سیاسی بەوەی بریتیە لە بازنەی قسەکردن و فریودان و کەڵەکەبوونی دەرامەتی سیاسی بە مانایەکی فیعلی بەوەی کە بریتییە لە دەرامەتی دەنگەکان و هاوپەیمانیەتیە سیاسیەکان، ئەمەش بەرگێك دەبڕی بەسەر کاری سیاسیدا کە لە سیستمی پارلەمانییەوە نزیکە بەو جۆرەی سەدەی نۆزدەیەم بەخۆوەی بینی نەك دەوڵەتی هاوچەرخ. هەربۆیە (والّزەر) کە لە (هابرماس)ەوە نزیکە پێیوایە سیاسیەت جیهانێکە لەسەر مشتومڕ و بەڵگاندن دامەزراوە، واتە جیهانێکە لە فیکری ئەقڵی پێکهاتووە، کە پەیوەندیی لە نێوان ژمارەیەك گۆشەنیگای جیاواز دەدۆزێتەوە. پاشان ئەو تێگەیشتنە پشتئەستوورە بە جیاکردنەوەی سیستمی سیاسی لە دەوڵەت تا دوا ئەندازە، هەروەها لەلایەکی ترەوە پشتئەستوورە بە جیاکردنەوەی ئەو سیستمە لە چالاکی و پەیوەندییە کۆمەڵگەییەکان. شیکردنەوەی (والّزەر) هەروەك شیکردنەوەی زۆربەی لیبراڵیەکانی تر، تەنها ئەو کاتە پەسەندە کە سەبارەت بە یەك دیو لە هەردوو دیوەکەی ژیانی سیاسی و دیموکراتی قسە بکەین. ئەڵبەتە لە شوێنێکدا دەوڵەتێکی گشتگیری رەها حوکم بکا دیموکراسی بوونی نییە. هەروەها کاتیٚ سەروەریی میللی و یاسای زۆرینە توانای ئەوە لە دەست دەدەن گوزارشت لە خۆیان بکەین.. لەو کاتەشدا دیموکراسی بوونی نییە. واتە گەر ئێمە هەمان وشەکانی (والّزەر) بەکاربێنین دیموکراسی تەنها ئەو کاتە ئامادەیە کە وەك "کارێکی سیاسی بۆ بەکریٚ گرتنی دەسەلاٚت" بەرجەستە دەبیٚ، ئەوەش سیاسەت دەباتە ئاستێکی بەرزی چالاکیە تایبەتەکان و وەك ئەفلاٚتون دەیویست نایکاتە تەکنیکێك کە رۆڵێکی یەکخەری پێببەخشیٚ. ئایا لە رژێمە دیموکراتیە هاوچەرخەکاندا (ئەم ڕاستیە) بەدیٚ ناکریٚ؟ ئەو ڕژێمانەی دەست وەردەدەنە پرۆسەکانی بەرهەمهێنانەوەی داهاتی نیشتمانی لە ڕێگەی باج و سیستمی بیمەی کۆمەلاٚیەتییەوە، هەروەها هاریکاری ڕێکخراو و سەندیکاکان دەکەن، کەمینەکان دەپارێزن و کاردەکەن بۆ پێشخستنی بنەماکانی ماف لەبەر رۆشنایی داخوازیەکانی رای گشتی. بە کورتی، ڕەنگە ئەو ڕژێمانە توانای یەکخستن و کاملکردنی کۆمەڵگەیان نەبیٚ، بەلاٚم خۆ بەلانی کەمەوە توانای ئەوەیان هەیە تێکڕژانی تەواوی بازنەکانی ژیانی کۆمەڵگەیی و پەیوەستبوونی ئەو بازنانە بەیەکترەوە دابین بکەن. ئەمەش دەمانباتەوە سەر پرسی سنورردارکردنی دەسەلاٚت و پرسی هاولاٚتیبوون، کە بەبیٚ ئەو دوو پرسە پێکەوە قسە لە بوونی دیموکراسی ناکریٚ.

کەواتە باچیتر دژبوونی تەواو نەخەینە نێوان لیبراڵیزم و دیموکراسی. چونکە لە کاتێکی وادا دیموکراسیی قوباتی سەرەکییە. نۆربرتۆ بۆبیۆ لەسەر هەقە کاتیٚ پێیوایە "وریایی (ترس) و نەزانین کە لە نێوان دوو کولتوردا، کولتوری لیبراڵی و کولتوری سۆشیالیستیدا، ئاڵوگۆڕیان پێدەکریٚ..

بەرەو لەناوچوون دەڕۆن" (ئایندەی دیموکراسی، ل 118). ئێمەش لەم کتێبەدا هەوڵی تێپەڕاندنی ئەو دژبوونەی (نێوان دیموکراسی و لیبراڵی) دەدەین، کە بەرگری لە سیستمی سیاسی لیبراڵی دەکەین دژی مەترسیەکانی دەسەلاٚتگەری، بەلاٚم بەو هیوایەی دەستێوەردانی مەبەستدار لەلایەن دەوڵەتەوە، بەهاندانی هێزگەلێکی کۆمەڵگەیی دیاریکراو، لە ئارادابێ دژی لیبراڵیزمی ئابوری کە ڕەنگە ببێتە هۆی دوو فاقیی زیاتری کۆمەڵگا.

## پەراوێزەکان

1- *Vicaria de la Solidaridad*، لە دەقەکەدا بە ئیسپانی هاتووە، واتە: سەرزەمینی هاوکاری.

2- *Glorious Revoltion* لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتووە.

3- *Politique du meaning*، واتە سیاسیەتی خاوەن ئامانج.

4- *Sanior pars*، لە دەقەکەدا بە لاتینی هاتووە، واتە: چینی تایبەت و خاوەن فەزیلەت.

5- *Walfare state*، لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتووە، واتە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی.

6- *Sturn und Drang*، لە دەقەکەدا بە ئەڵمانی هاتووە.

7- *Freedom from and Freedom to*، لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتووە، واتە: رزگاربوون لە شتێك و رزگاربوون لە پێناو شتێکدا.

## سەرچاوە

الان تورین، ماهي الديمقراطية؟ حكم الاكثرية ام ضمانات الأقلية. بيروت: دار الساقي، 1995، ط 1، ص 53-72.

# ڕۆژێك لە یۆنانی دێرین

## (3)

## ماڵی ئەسیناو کەل و پەلەکانی
## بەدوای پیاوێکی ئەسینابیدا بەرەو ماڵەوە

ولیەم داڤیز

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

جێهیشتنی ئاگۆراو ڕووکردنە ئەو شەقامانەی بەرەو گەڕەکەکان دەڕوات نەزکێکی خۆشترمان لا جێدەهێڵێت. چەند درەختێکی مەیلەو سوور لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر داچێنراون، تەنانەت لە نێوانی کۆڵانەکانی نێوانی ماڵە خواروخێچەکاندا ڕوواون، وەلێ بۆشاییەکی وەهاش هێڵراوەتەوە کە بەشی دروستکردنی پەرستگایەکی وەك پەرستگای هێفاستۆس بکات کە دەکەوێتە نزیکی بازاڕ، پایەو ستونو دیوارەکانی بە مەرمەڕی سپیو سەوزو سوور ناوپۆش کراونو بە زێڕیش ڕازێنراونەتەوە، ئەوکاتە یۆنانییەکان زۆر حەزیان لە ڕازاندنەوەی پەیکەرو مەزارەکان بووە.

لەسەر سووچی کۆڵانەکانو یەکتربڕینی شەقامەکان، پاشماوەی داڕماوی کۆتەڵی هێرمێس هەیە، هەر وەکو ئەوانە وەهان لە بازاڕدا دەبینرێن، تاکە تاکە ماڵەکانیش لە بەر دەروازەکانیاندا دوو پایەو ڕووکارێکی تایبەتییان داناوە، ئەمە نیشانەی نەریتی ئاینییانەی نهێنی خۆیانە.

قەرەباڵەغییەکەی ناو ئاگۆرا بە پێ بەرەو ماڵەوە دەیکوتن. بەکارهێنانی گالیسکە لەو دەوروبەرانەدا نیشانەی ئەوەیە خاوەنەکەی تێڕوانینێکی نادیموکراسییانەی هەیە، تەنها ژنان یان پیاوانی نەخۆش بواریان دەدرێت بە گالیسکەو هەراو زەنا بێنو بچن. لەگەشتەکەماندا پیاوێك هەڵدەبژێرین کە جوانو تەمیز جلی پۆشیوەو تازە لە سەرتاشخانە هاتۆتە دەرەوە، لەگەڵ ئەم پیاوەدا دەچینەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەم پیاوە لە دەوڵەمەندە زۆر ساماندارەکان نیە، چونکە گەورە دەوڵەمەندان

نمونەی نائاساییو ناگشتێنرێن، هەروەها یەکێکیش نیە لەو هەژارانەی ئیشی قورس دەکەن. دوو خزمەتکاری پۆشتەو بەتوانای لەگەڵدایە، بەچەند کۆڵانێکی تەسکی باکوری ئەکرۆپۆلیسدا دەڕوات. لە بەردەمی دەرگایەکی سادەو تۆکمەی یەکێك لەماڵەکاندا هاوار دەکات "پای.. پای" واتە "کورە.. کورە" دەنگی خڕەو تەقەو رەقەی کردنەوەی دەرگا دێت. لەودیوەوە خزمەتکارێکی بە رەچەڵەك بیانی دەردەکەوێت، ئیشی ئەم خزمەتکارە ئەوەیە خەڵکی بێزارکەرو مشەخۆر دەربکاتو نەهێڵێت بچنە ژوورەوە، دەرگاکە واز دەکاتو سڵاوێکی بەڕێزانە لە ئاغای دەکات. لەو لاشیەوە سەگەکەی بازدەداتو دەست دەکات بە وەڕین.

بەدوایدا دەچینە ژوورەوە، (لە پێشەوە قاچی راستمان دەخەینە ئەو دیوەوە، چونکە چوونە ژوورەوە بە قاچی چەپ نەگبەتی پێوەیە) تێبینی دەکەین لەسەر دەرگاکە نوسینێك هەڵواسراوەو دەڵێت "با هیچ خراپەیەك روو نەکاتە ئێرە". یان نوسراوە "بۆ پیاوچاکان" پاشان چەند هەنگاوێکی کەم بە راڕەوێکی تەسکدا دەڕۆینو دەگەینە دالان، ئینجا ژوورەوە، ئەمە شێوەی هەموو ماڵێکی ئاسایی یۆنانە.

## شێوەو و بەکارهێنانی ماڵی یۆنانی

هەموو کەلوپەلەکانی ناو ماڵی یۆنانی وەك دواتر لێی ورد دەبینەوە دەبن بە دووچەشنەوە: هی ماڵانی باکورو ماڵانی باشور. خانووی باکور بە یەك تاقە هۆدەی گەورە دەستپێدەکات "هۆڵە گەورەکە" پاشان ژووری بچووکتریشی بۆ زیادکراوە. لە پەنجەرەکانی سەر رووکاری دیوارەکانی دەرەوە رۆشنایی بۆ دێت، هەمووشیان بە یەك تاقە سەربانی سواخدراو گیراون. ماڵەکانی باشوریش (یۆنانەکانو دێرینەکان) بە حەوشەیەکی لاکێشەیی داخراو دەستپێدەکات. ژوورەکان زۆر بن یان کەم رۆشنایی لەو حەوشەیەوە وەردەگرن، بەڵام بە تەواویی بە رووی جیهانی دەرەوەدا داخراون. ئیتر ئەم شێوازەی بیناسازیی هەواگۆڕکێی زۆر باشترە، فێنکترە، لەوەی تریان رەحەتترە. ئەو حەوشە بەرینە کراوەیە ژوورەکانی دیکەی ماڵەکە لە هەموو کەشوهەوایەکی سەخت دەپارێزێت.

دەڵێن سۆکرات تێڕوانینێکی زۆر بەهاداری هەبووە دەربارەی ئەوەی دەبێت خانووی باش چۆن بێت، ئەو پێیوابوو پێویستە لە هاویندا فێنك بێت، لە زستانیشدا گەرم بێت، لەبارو گونجاوبێت بۆ نیشتەجێبوونی خێزانو کەلوپەلەکانیشیان. لەبەرئەوە پێویستە ئەو ژوورەی دەکەوێتە ناوەندەوە لە هەموویان بەرزوبڵندتر بێتو بەسەر باشوردا بکرێتەوە، بۆ خۆپاراستن لە گەرمای هاوینیش پێویستە سەربانی حەوشەکە بە شتێك بگیرێت، ئەو ژوورانەی دەکەونە بەشی باکورەوە نزمتر بینا بکرێن. ئەمانە هەموویان شتی باشن، بەڵام لە راستیدا پیاوانی ئەسینا ئەوەندە گوێ نادەنە شوێنی نیشتەجێیان، پارەیەکی زۆر کەم لە جوانکردنی نیشتەجێیدا سەرفدەکات. مەگەر نەخۆش بێت، ئەگینا تەنها هەر بۆ نوستنو نانخواردن لە ماڵەوە دەبێت. ئاگۆرا، ئەنجومەنی گشتی، کۆبوونەوەکانی دەستەی سوێندخۆران، جیمنازیۆم، فێستیڤاڵە ئایینیە مەزنەکان هەموو رۆژەکەی لێ سەرف دەکەن. زینۆفۆنی ئەسینایی دەڵێت "من هەرگیز کاتی خۆم لەماڵەوە سەرف ناکەم، هاوسەرەکەم خۆی دەتوانێت بە باشی ماڵ بەڕێوە ببات". کە حاڵەتەکە ئاواهی بێت، تەنانەت پیاوی دەوڵەمەندیش کەلوپەلی ماڵی کەمە، گەرچی زۆرجاریش سکاڵاو گلەیی ئەوە کراوە خەڵکی وایان

لێهاتووه ماڵی رازاوەتر پێکەوە دەنێن و لە سادەو ساکارییەکەی سەردەمی پێریکلێس لایانداوە (بۆ نمونە دیمۆستینێس گلەیی وەها کردووە).

## نەخشەی ماڵی یۆنانی

بەپێی رووبەری ئەو خاکەی ماڵەکەی لەسەر بینا دەکرێت، هەروەها بە پێی گەورەیی و بچوکی خێزان، زەوق و میزاج، سەروەت و سامان، نەخشەی ماڵەکانیش دەگۆڕێت. کاڵەکان بەشێوەیەکی گشتی لاکێشەیین، لا بچووکەکەی روودەکاتە شەقام، وەلێ ئەمە شتێکی نەگۆڕ نیە. لە ماڵە گەورەکاندا دوو حەوشە (ئالوا) هەیە، یەکێکیان دەکەوێتە پشتی ئەوەی تریانەوە، هەریەکەیان تەیمان و جیاکەرەوەی خۆی هەیە. حەوشەی یەکەمیان پێی دەوترێت (ئەندرۆنۆتیس) ئەمەیان تەرخانە بۆ پیاوان. حەوشەیەکی فراوانەو بەکەڵکی هەندێك مەشق و وەرزشیش دێت. بە دەوری چوارچێوە کراوەکەیدا چەند ستونێك ریزکراوە، رۆژانی گەرما دەکرێت بە کەپرو سابات. لە ناوەڕاستیشدا لەسەر سەکۆیەکی بچووك پەیکەری زیۆسی پارێزەر دانراوە، ناوبەناو باوکی خێزانەکە لەوێدا قوربانی دەکات و وەکو ئاینزای ماڵەکە رەفتار دەکات. زۆرجار تاجەگوڵینەیەك لەسەر سەکۆکە دانراوە، هەرکاتێکیش هاتوویەکی تازە لە ئاگۆراوە هات، دانەیەك لەگەڵ خۆی دەهێنێت.

لە راستیدا ئەندرۆنۆتیس شوێنی راستەقینەی گوزەرانکردنە ماڵەکەیە: لێرەدا خاوەنماڵ پیشوازیی لە میوانەکانی دەکات، کۆیلە نێرینەکان لێرە کاردەکەن و ژنانیش هەر لێرە خۆیان سەرقاڵ دەکەن (لە سوچێکەوە لێی دادەنیشن کە نێرینەکانیان لێوە دیارە. دیکۆرو رازاندنەوەی زۆر ساکارە: دیوارەکان پاکوتەمیز راگیراون، زەمینەکەی بە جوانی گڵگەچکراوە، لە ماڵانی کەمێك مامناوەندیتردا بە باشی کوتراوەتەوە. لە لای ستونی گۆشەکانەوە لە هەرچوارلاوە کەلەگیەك کراوەتەوە، زۆرجار ژمارەیان دەگاتە دوازدە دانە، زیاتر لە تەختی حەوانەوە دەچن نەك ژوور، بچووکن و لە دەروازەکەیانەوە رۆشناییان پێدەگات، هەندێك لەوانە وەکو گەنجینە بەکار دەهێنرێن، هەندێکیان بۆ نوستنی کۆیلە نێرینەکانن، یاخود ژووری کوڕانی ماڵەکەن. هەموویان تاریکن و هەواگۆڕکێیان خراپەو کەلوپەلیشیان کەمە. لەمەشەوە ڕەنگە سەیر نەبێت بۆچی پیاوی ئەسینا زیاتر حەزی لە ئاگۆرایە، نەك کونجە تاریکەکەی خۆی.

ئێستا بەشی پێشەوەی ماڵەکە بەڕووماندا کراوەتەوە، کاتی ئەوە هاتووە زیاتر بچینە پێشەوە. یەکسەر بەرامبەری دەروازە کراوەکە دالانێك هەیە بەرەو ناوەوەی ماڵەکە. ئەم دالانە پێی دەوترێت ئەندرۆن، ئینجا ژووری نانخواردن دێت کە قەشەنگترین ژووری ماڵەکەیە. میوانەکان لێرە کۆدەبنەوە بۆ شیوی ئێوارە, لە سوچێکەوە وەجاخێکی رەش هەیە، کاتی خۆی ئاگردانی ماڵەکە بووە، بەڵام ئێستا بووە بە هێمایەکی پیرۆزی ماڵەکە. ئەمە کۆتەڵێکی سادەیەو بۆ هیستریای خوداوەندی ئاگردان تەرخانکراوە. لەوێدا مەشخەڵێکی بچووك بڵێسەی دێت. لە هەموو ژەمێکی میواندارێتیدا گۆشت و شەراب پێشکەش دەکرێت، جا ماڵەکە هەژار بێت یان دەوڵەمەند.

لە دیواری ئەندرۆندا کە رووبەڕووی ئەندرۆنیتیسە، دەرگایەکی تۆکمە هەیە. ئەگەر لەو دەرگایەوە بچینە ژوورەوە، مانای وایە ئێمە میوانێکی ئازیزین. تەنها باوك و کوڕان و نێرینەی خزمان بۆیان هەیە بچنە ژوورەوە، چونکە دەچێتە

سەر جیناکۆنیتیس (هۆڵی ژنان). ئەگەر کەسێك ڕێگە بە خۆی بدات بچێت بۆ جیناکۆنیتیس، تەنانەت ئەگەر هاوڕێی ماڵیش بێت، جۆرێکە لە سوکایەتیکردنو بە پاڵ دەیکەنە دەرەوەو گازاندەی لێدەکەنو لەوانەشە شکاتی لێبکرێتو تووشی لێپرسینەوەی یاسایی ببێت. بە کورتی جیناکۆنیتیس ناوچەیەکی پیرۆزو قەدەغەیە لە ئەسینا. ژنان لەوێ دەژینو لێیان قەدەغەکراوە زۆر بەشداریی ژیانی گشتی بکەن، بۆیە بوونەتە خاوەنی کۆمەڵێك دابونەریتی تایبەت بە خۆیان. بەزاندنی ڕێزی ئەو شوێنە نەك هەر شتێکی بێئەدەبانەیە، بەڵکو یاساغیشە.

ئەم ماڵەی بۆی دەچین، ماڵی کەسێکی خۆشگوزەرانە، جیناکۆنیس ژوورێکی دیکەیەو لە تەنیشتییەوە چەند ژوورێکی دیکەی هاوقەبارە هەنو وەکو ئەندرونیتیس دروستکراون. یەکێك لە ژوورەکانی ئەوسەر پڕێتی لە جگو دیزەو گۆزەو کوپەو دەفری جۆراوجۆرو بۆنی سوورکردنەوەی ماسییە پانکەڵە پێماندەڵێت ئەوە مۆبەقە. بێشك ئەوانی دیکەش شوێنی نوستنی کۆیلە مێینەکانن. لە لاتەنیشتی نزیکی ڕووکاری ماڵەکەوە، کە بەسەر حەوشەی ناوەوەدا دەکرێتەوە، شوێنی نوستنی سەرداری ماڵەکەی لێیە کە لانیکەم یەك تەختی نوستنی لێیە، ئەمەیان پێی دەوترێت سالامۆس، شوێنی نوستنی ئاغاو خاتونی ماڵە، زۆربەی کەلوپەلە بەهادارەکانو بابەتی ئارایشتی ناو ماڵەکە لەم ژوورەدایە. ئەگەر ماڵەکە گەورەکچی شوونەکردوویان هەبێت، ئەوانیش ژوورێکی دیکەی ئاوایان دەبێت (ئەنتی–سالامۆس) کە زۆر لە کونجی کچە کۆیلەکان فراوانترە. ژوورێکی تایبەتیش جیاکراوەتەوە وەکو ژووری ڕستنو چنین، گەرچی ئەم پیشە سەرەکییەی ژنان بەشێکە لە ماڵداریی، وەلیٚ ئەگەر کەشوهەوا خۆش بێت، لە بەشی کراوەی ناوەوەی حەوشەکەشدا دەکرێت. لێرە لە دەوری تەختێکی بەگوڵ ڕازێنراوە، ئافرەتە کۆیلە جاحێڵەکان خەریکی تەشی ڕستنو تەون بادانن، منداڵە بچووکەکانیش گەمەو گەڕەلاوژە دەکەن، چەند پەلەوەرێکی ماڵییش بەوناوەدا بۆ وردە نان دەگەڕێن. لە ڕاستیدا لە پانتاییەکی تاڕادەیەك تەسکدا، ژمارەیەکی زۆر خەڵك دەژی، هەمووان سەرقاڵن، جەنەبازی دەکەن، ژاوەژاوە، ئەگەر نەناسێك خۆی بکات بەوێدا، هەرایەك دەقەومێت.

## چاکسازیی لە نەخشەی باوی ماڵدا

ئەمە خەسڵەتە سەرەکییەکانی خانووی ئەسینایییەك بوو. ئەگەر دانیشتووەکەی ناوی زۆر بە خۆنازو لەخۆڕابین بێت، ئەوا ڕەنگە باخچەیەکی بچوکی باش پەرژینکراویان هەبێت بۆ ئەوەی دەستی خۆهەڵقورتێنەریان نەگاتیٚ. زۆرتر ڕێی تێدەچێت کە بچووکی قەوارەی خانووەکە ناچاریان بکات کە ئەو هێڵکارییەی لەسەرەوە ڕوونکرایەوە، سادەتریش بکەنەوە. لە خانوویەکی یەك نهۆمی سادەی کەم مەسرەفدا، جیناکۆنیتەکان کورت دەبنەوە بۆ زنجیرەیەك ژووری مەحکەم کە بە باشی کلۆم دەدرێن. لە خانوویەکی لەوەش سادەتردا، ماڵەکە بەشێکی جیاکراوەی نابێت بۆ چوونە ژوورەوە، ئافرەتەکان بە جۆرە پلیکانەیەك لە هۆڵە سەرەکییەکەوە دەچن بۆ ژوورەکانی نهۆمی سەرەوەو لەوێ چەند ژوورێك هەیەو جودایان پێدەبەخشێت. بێشك هەتا بەرەو ئاستە زیاتر گشتییەکانی خوارەوە بڕۆین، ماڵەکانیشیان سادەو سادەتر دەبێتەوە. لەو شوێنە مییلییانەدا، لە هەردوولای دەروازەی چوونەژوورەوەی ماڵەکانەوە

دووكانی بچووك بچووك رووپانكردۆتە شەقام. لە چوونەژوورەوەدا خۆت لە پانتاییەكی زۆرتەنگو قەبزدا دەبینیتەوە، حەوشەیەكی جەنجاڵی پۆخڵ بە رووتا دەتەقێتەوە، لێرەو لەوێ كوپەو دیزە لەو كونجانەدا دانراون كە بە زەحمەت دەتوانیت پێیان بڵێیت ژوور. دیسانەوە بیرمان دەكەوێتەوە كە بۆچی نیرینەی ئەسینایی كەیفی بە ماڵ نایەتو زیاتر حەزدەكات لە ماڵ بێتەدەرەوەو بۆ ئافرەتە بێبەختەكانیان جێیبهێڵێت.

## بەكرێدانی خانوو، قیمەتی خانوو

زۆربەی ئەسینایییەكان خاوەنی خانووی خۆیانن. بێشك خانووی كرێش هەیە، بە تایبەتی بۆ بازرگانە بیانییەكان یان ئەو میوانانەی خۆیان دەكەن بە شارەكەدا، لە وەرزە جەنجاڵو قەرەباڵەغەكاندا، خانوویەك بە كرێ دەگرن بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی كاتی تێیدا بمێننەوە. بڕی3٪ – 8٪ ی بەهای خانووەكە نرخێكی ساڵانەی گونجاوە.بەڵام دانیشتوانەكە زۆربەیان خانووی خۆیانیان هەیە، چونكە لە راستیدا خانوو زۆر هەرزانە. دیارە بەشی زۆری پارەی خانوو بۆ زەوییەكەیەتی. ئیتر كەلوپەلی هەرزان بەكاردەهێنن بۆ دروستكردنی خانوو، خشتی قوڕی لەبەرهەتاو وشككراوە زۆر كەڵكی نیە، دەشبێت بەردەوام دەستت پێوەی بێتو خەریكی بیت، بەڵام زۆر هەرزانە. دیمۆستینێسی وتاردەر دەڵێت "خانوویەكی خنجیلەی سادە تەنها حەوت مینای دەهێنێت (نزیكەی 2242.8 دۆلار لە ساڵی 2000 دا)، ئەمەش نزمترین نرخی خانوو نیە، بگرە لەوەش كەمتر هەیە. پیاوێكی بانكسازی زۆر دەوڵەمەند خانوویەكی دروستكردو 100 مینای تێچوو (نزیكەی 32040 دۆلاری ساڵی 2000) بێشك ئەمیان زۆر نزیكە لە بەرزترین نرخەوە. بەمجۆرە مەسەلەی لە شاری ئەسینادا، خانووی كرێ گرفتێكی ئەوتۆ نیە.

## كەلوپەلی سادە، بەڵام ماڵێكی دڵگیر

ماڵەكان، تەنانەت ئەگەر خاوەنەكانیشیان زۆر دەوڵەمەند بن، بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر كەلوپەلی سادەو ساكاریان تێدایە. كەڵەكەكردنی كەلوپەلی قورسو دیكۆری دیوارو هونەرو جوانكاریی لە دانانی خشتەكاندا، ئەمانە هەموویان لە سەردەمانی دواتردا سەریانهەڵداوە، بەڵام لە ئەسینا شتی وەها نیەو بەشێوەیەكی زۆر نەكلۆك لەگەڵ ئایدیاكانی هارمۆنیو میانڕۆییدا ناتەبان. لە ماڵی ئەسینایییدا باوڵی كتێبو وێنەی چوارچێوەتێگیراو نیە، رەنگە هیچ دۆلابو شتێكی وەهای تێدا نەبێت. تەختی نوستن، قەنەفە، كورسی (پشتی پاڵدانەوەی نیە)، تەشتی قاچ شۆرینو مێزی بچووكی خۆشدەست بۆ گوێزانەوە، ئەمانە كەلوپەلی بەرچاوی ناوماڵن. لە بری مێزی ئارایشتو كەنتۆرو كەوانتەرو شتی تر، سندوقی گەورە گەورەی قورسیان هەیەو كە هەرچی كەلوپەلی ماڵە لەوێدا هەڵدەگیرێت.

## ماڵی ئەسینایی سادەیە بەڵام بە سەلیقەوە رێكخراوە

ئەو ماڵانە، تەنانەت ئەگەر خاوەنەكانیشیان دەوڵەمەند بن، بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر كەلوپەلەكانی ناویان سادەو ساكارن. كەلوپەلی گەورەو قورس، دیكۆری دیوارو نەخشسازیی هی سەردەمەكانی دواترن، وەلێ لای ئەسینایییەكان شورەییو نەنگییەو پێچەوانەی بیروبۆچوونەكانیانە لەمەڕ هارمۆنیو میانڕۆیی. ماڵەكان یەغدانو سندوقی گەورەگەورەیان هەیە، قورسو چەماوەن،

بەشی زۆری کەلوپەلو ئامرازەکانی ماڵ لەوێدا هەڵدەگیرێن‌و کڵۆم دەدرێن. لە راستیدا شێوازی ماڵداریکردنی یۆنان گوزارشت لەو سادەییە دەکەن کە زۆرجار ئاماژەی بۆ کراوە. فەرش‌و قاڵی خۆرەلاتییانەیان هەیە، بەڵام بە زۆریی یان دیواری پێدەپۆشن، یاخود لەسەر قەنەفەکان رایاندەخەن نەك لەسەر زەوی. دابونەریتەکانیان ئەوەندە سادەن کە بە دەگمەن پێویستییان بە سندوقی نەخشدار هەیە. لەژێر بنمیچی ژوورەکانەوە چەندان رەفە بەرێز دروستکراون بۆ ئەوەی کەلوپەل‌و پۆشاکیان لەسەر دابنرێت.

ئەمانە هەمووی راستن، لە بازاڕیش شوێنێك نیە بۆ مامەڵەکردنی کەلوپەلی قورس‌و گرانبەها. تەختی نوستن هەیە کە تەنها چەند پلێتێکن پێکەوە لکێنراون‌و کوشنێکی رەقیان بۆ کراوە کە ناواخنەکەی پەڕ یان پەشم‌و بەنە. لێوارەکانی تا رادەیەك نەخشونیگاری پێوەیەو چەمێنراوەتەوە، بەڵام پان‌وپۆڕو خۆشڕاحەتە. لەسەر کوشنی ناوەکەشی گوڵ‌و گوڵزاری جوان‌و دڵگیر دروستکراوەو سەرجێگای قرمزەو نەخشینی بەسەردا دراوە. ئەگەر کاتمان هەبێت جێی خۆیەتی کەمێك لە قاچی خەتخەتی مێزە نزمە دارینەکانیش رابمێنین، هێڵەکانیان دەستێکی شارەزاو کارامە کێشاویەتی. لەوەش زیاتر گوڵدانەکان، چرا بەردین یان برۆنزییەکان، قاپوقاچاخی هەموجۆر، جۆرەها گۆزەو دیزەو کوپەڵەی بەکارهێنان، هەموویان جوانی خۆیانیان هەیەو ویقارو خاوێنییەك دەبەخشن بە ماڵ‌و بەشێوەی جوانۆ رەنگین نەخش‌و نیگاریان تێدا کراوە، کە لە کەل‌و پەلی ناو مۆبەقەوە گۆڕیونی بۆ توحفەو ئەنتیکەی هونەریی.

قۆری‌و دیزەی رەشهەڵگەڕاو بۆ ئاو و خواردنەوەی تر بەکاردەهێنرێن، وێنەو نیگاری سووریان تێدایەو لەگەڵ هاواری خاوەنماڵدا دەهێنرێن بۆ ژووری دانیشتن بۆ ئەوەی بەدەم قسەکردنەوە لێیان بخورێتەوە، ئەوانە رۆژێك لە رۆژان دەبن بە مادەی بەنرخی ناو مۆزەخانەکان‌و نەوەکانی دواتریش فێردەکەن کە کالاو کەلوپەلی گرانبەهاو بەکارهێنانی ئەریستۆکراسییانە زۆر پێویست نین بۆ ئەوەی کەش‌و هەوای بەکارهێنانیان دڵگیر بکەن.

بێشك ئەو ئەسینائییە لەخۆڕازییانە پێیانخۆشە هەندێك کەلوپەلی بەنرخیشیان هەبێت. چەند کوپێکی زیوینی نەخشدار کە بە دیقەتەوە بۆیان گەڕاوە، لانیکەمیش یەك مێزی نانخواردنیشیان هەیە کە لە تەختەی گرانبەها دروستکراوەو بە زیویش رازێنراوەتەوەو ساف‌و بریقەداریش کراوە. لە رۆژانی ئاهەنگدا کالاکە بە کەلوپەلی ئاڵووالاو نەخشین دەرازێنرێتەوەو راخەرو قاڵیچەی جوان رادەخرێت، هەموو ئەوانەش لە پڕێکا لەناو سندوقە گەورەکانەوە دێنە دەرەوە.

بەڵام دواتر وردە وردە سەربارەی ئەو رەخنەو گازندانەی لێشیان دەگیرا ماڵی یۆنانی، لەماوەی چەند نەوەیەکدا داروديواری ماڵەکان رازێنرانەوەو بایەخیان پێدرا، ماڵە دەوڵەمەندەکان بوونە خاوەنی کۆشکی دڵفرێنی وەها کە دواتر رۆمانەکانیش چاویان لێکردن‌و ئێستاش لە پۆمپای لەو جۆرە کۆشکانە بەرچاو دەکەون.

### سەرچاوە


*WILLIAM DAVIS: A Day in Old Athens*

# ئێدمۆند هوسرێل و دیاردەناسی

لە فارسییەوە: یوونس ڕەزایی

## ئاماژەیەك:

کتێبی "بنەچەك دۆزی فەلسەفە - ئەندێشە فەلسەفییەکان لە کۆتایی هەزارەی دووهەمدا" یەکێك لەو کتێبە دەگمەنانەیە کە بە هەوڵی محەمەد ڕەزا ئێرشاد و بە قووڵ بوونەوەیەکی فەلسەفی لەلایەن "دکتۆر محەمەد زەیمەران" مامۆستای فەلسەفە هاتووەتە بەرهەم. ئەو کتێبە بریتییە لە وتوێژێکی تەسەل کە چەندین ساڵی خایاندووە و جیاوازە لە هەموو ئەو وتووێژانەی تا ئێستا خوێندوومانەتەوە، چۆن هەوڵدراوە فەلسەفەی سەدەی بیستەم بە شێوەیەکی وردو بەربلاو بکەوێتە بەرباس و هەموو لایەن و قوژبنەکانی فەلسەفەی نوێ بخرێتە بەر تیشکی ڕوونکردنەوەی دکتۆر زەیمەران، ئەو کتێبە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە. لە بەشی یەکەمدا "زەیمەران" لە زەمینە و چۆنەتی سەرهەڵدان و ڕەوشتی بیری مودێرن و دوامودێرن دەدوێ و ئەو سەردێڕانە بە پشوویەکی درێژ شیدەکاتەوە:

1-مودێرنیتەو پاش مودێرنیتە
2-کانت و مۆدێرنیتە
3-ڕۆشنگەری و بیرۆکەی ڕەخنەگرانەو عەقڵی مودێرن
4-سەرهەڵدانی ریفۆرمی ئایینی
5-مودێرنیتە، دابڕان یا بەردەوامی
6-قوتابخانەی فرانکفۆرت، پێکهاتەخوازی و پاش پێکهاتەخوازی
7-لە پاش پێکهاتەخوازییەوە تا پاش مودێرنیتە
8-چییەتی هونەر لە چاخی نوێدا
9-پاش مودێرنیتە و بیرۆکەی کۆتایی
10-بیرۆکەی کۆتایی مێژوو
11-پاش مودێرنیتە و ڕەخنەگرتن لە نیهێلیسم
12-ڕەخنەگرتن لە ئایدیۆلۆژی، دەستەڵات و حەقیقەت لە چاخی کۆتایی فەلسەفەدا
13-هابرماس و ڕەخنەی پاش مودێڕنیتە.

بەشی دووهەمی ئەو کتێبە تەرخان کراوە بۆ تاوتوێ کردنی ئەندێشەو بەرهەمەکانی یازدە فیلسووفی ناودار و شوێن دانەر. زەیمەران لەو بەشەدا بەشیکردنەوەی ڕێچکەگەلی جۆراوجۆری فەلسەفی سەدەی بیستەم و سەنگ و سووك کردنی بیرۆکە فەلسەفییەکان، هەر جارەی فیلسووفێك و جیهانی بیرکردنەوەو میتۆدی فەلسەفی ئەو فیلسوفە دەخاتە بەرباس. ئەو بەشەش لەو لقانە پێکهاتووە:

1-نیچە، فیلسووفی ژیان

2-ئیدمۆند هوسرێل: دیاردەناسی

3-مارتین هایدگێر: دیاردەناسی هێرمنۆتیکی

4-هانس گیۆرك گادامێر: هێرمنۆتیك و وتووێژ لەگەڵ دەق

5-میشێل فۆکۆ: دەسەڵات و زانیاری

6-ژاك لاکان: زمان و ناخۆ ئاگا

7-لیوتار: پاش مودێڕنیتە و کۆتایی کەڵە گێڕانەوەکان

8-ژیل دولۆز: مەیلی بەزاوزێ

9-ژاك دریدا: کۆتایی میتافیزیکی حوزور

10-ژولیا کریستووا: گوتاری ژنانە

11-ژان بودریار: دونیای پاش مودێڕن، وەهمی مێژوو و کارەسات.

پێویستە بگوترێ ئەو کتێبە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی و ئەوەی دەیخوێنیتەوە بەشێکە بە ناوی "هوسرێل و دیاردەناسی".

"وەرگێڕ"

## ئیدمۆند هوسرێل و دیاردەناسی

ئەمڕۆکە لە نێو رۆشنبیراندا زۆر باسی فیلسوف و بیرمەندانی نێو بەدەرەوەی وەك "مارتین هایدگێر، پۆل ریکۆر، مێرلۆپۆنتی و سارتر" دەکرێ. بەڵام کەمتر باسی گەورەترین فیلسووفی دونیای مودێڕن کراوە، بیرمەندێك کە شۆڕشێکی بەتینی لە فەلسەفەی زانست و ریچکە و بۆچوونی "زانستە ئینسانییەکان"ی هاوچەرخدا بەدیهێناوە. بێ شك دەبێ ئەندێشە فەلسەفیەکانی "ئیدمۆند هۆسرێل" بە پاڵپشتی فیکری فیلسووفە ناوبراوەکان بێتە ئەژمار. فیلسووفێك، کە هەر کەسێ لە رۆژئاوادا باسی فەلسەفە بکا، ناچارە کتێبێ لەسەر بیروراکانی ئەو بنووسێ. کەواتە تێگەیشتن لە هۆسرێل، پێوەری هەڵسەنگاندنی فامین و بیرکردنەوەی قووڵە، لە هەمبەر پرسیارە فەلسەفییەکاندا.

هۆسرێل بە نووسینی کتێبی "قەیران لە زانستە ئەورووپییەکان و فەلسەفەی مەزنی خواز"دا وەرچەرخانێکی گرینگی لە بۆچوونەکانی فەلسەفەی زانست بەدیهێنا. بەرای هۆسرێل رەوشت ناسی زانستە ئینسانییەکانی هاوچەرخ، بۆ وێنە "دەروون ناسی" توانای تێگەیشتنی دیاردەکانیان -بەو شێوەیەی کە هەن- نییە و شوێنی "زانست باوەڕی" بەرهەم هاتوو لەو روانگەیە، لەسەر حوکمە فەلسەفییەکان، ئاکام گەلێکی ناڕاستی لێکەوتەوە. هەر بەو هۆیە ئەو هەوڵیدا هەتا بە یارمەتی "رەوشتی دیاردەناسی" فەلسەفە بکاتە بوارێکی سەربەخۆ. بەرای هوسرێل، دیاردەناسیش دەتوانێ ببێتە بناخەیەکی پتەو بۆ زانستە ئینسانییەکان، ئێمە لە دیاردەناسیدا لە ناسیاوییەکان و زانیارییەکان لە مەڕ دیاردەیەکی رەهاکراو چاوپۆشی دەکەین، یان بە واتای هوسرێل ئەوانە دەخەینە ناو "کەوان"ەوە و بە پشت گوێ خستنیان تێدەکۆشین بگەینە گەوهەری "چییەتی" ئاگایی. لەو وتووێژەدا هەوڵمانداوە گرینگترین روانگە و ئەندێشەکانی هوسرێل بخەینە بەر تیشکی توێژینەوە.

**• جەنابی دوکتۆر زایمەران، ئەمڕۆکە ئەندێشەی کەسانێکی وەك "هایدگێر، یاسپێرس، سارتر، مێرلۆپۆنتی، ماکس شلێر، گادامێر و پۆل ریکۆر" لە کتێب و وتارگەلی جۆراوجۆردا بایەخیان پێدراوە، بەڵام بەداخەوە فیلسووفێك کە بایەخی زیاتر و شوێنی لەسەر ئەو بیرمەندە ناوبراوانە بێ ئەملاوئەولایە و بە هیچ شێوەیەك نەکەوتۆتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، هوسرێلە. لەبەرئەوە، لەم وتووێژەدا دەمانەوێ**

**ئەرک و پلەوپایەی "هوسرێل" لە فەلسەفەدا بخەینە بەر تیشکی توێژینەوە، هەر بۆیە ئایا دەتوانین بپرسین پلەو پایەی "هوسرێل" لە فەلسەفەی هاوچەرخی ئەورووپادا چییە و چ شوێنێکی لەسەر بیرمەندانی سەدەی بیستەم داناوە؟**

بەرلەوەی باسی بیروڕاکانی هوسرێل بکەم، دەبێ بڵێم خوێندنی سەرەتایی ئەو لە لقی حیساب دابووە. هوسرێل سەرەتا وەک حیساب زانێک دەستبەکار بوو، بەڵام وردەوردە هۆگری بە فەلسەفە لە دەروونیدا گەشەی کرد. چووە "ڤیەنا" تا لای مامۆستاکەی "فرانتس برنتانۆ" فەلسەفە فێربێ. ئەندێشەکانی برنتانۆ شوێنێکی کاریگەریان لەسەر هوسرێل هەبووە. یەکەم بەرهەمی ناسراوی ئەو "توێژینەوە لۆژیکییەکان"ە و بەرهەمی دواتری "ئیدەکان"ە. هوسرێل ئەو کتێبەی لە دووبەرگ و بەردێژەی دوو ساڵی دوابەدوای یەکدا بڵاوکردەوە. ماوەیەک خەریکی گوتنەوەی وانەی ئەندێشەکانی دیکارت بوو. بەرهەمی ئەو سەردەمەی کتێبێکە کە بە "وردبوونەوەکانی دیکارتی" ناسراوە. ئەو کتێبە ساڵی 1950 واتە دوای مەرگی خۆی چاپ بووە. یەکێکی تر لەو بەرهەمانەی دوای مەرگی بڵاوبووەوە و شوێنێکی بنەڕەتی لەسەر بیرمەندانی سەرەتای سەدەی بیست دانا، "قەیرانی زانستە ئەورووپییەکان و فەلسەفەی مەزنی خوازە". ئەو لە شارەکانی "هال، گوتینگن، فرایبۆرگ" وانەی فەلسەفەی دەوتەوە.

هوسرێل یەکێکە لە بناخە داڕێژەرانی دیاردەناسی. ئەو هەر بەو ناوەوە شێوەیەکی زۆر بنەڕەتی لە لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکاندا بە میرات جێهێشت. ئەو شێوەیە لە لایەن زۆربەی فیلسووفەکانەوە کەڵکی لێ وەرگیرا. بۆ وێنە "هایدگێر"، فەلسەفەی بوون"ی خۆی لەسەر بنەمای دیاردەناسی هوسرێل دامەزراند. "سارتر" مانای "ئازادی" و "بەرپرسایەتی" لەسەر بناخەی شێوەی هوسرێلی راڤەکرد. مێرلۆپۆنتیش باسی "تێگەیشتنی" لە قاڵبی دیاردەناسیدا دۆزییەوە. لەو دوایانەشدا "پۆل ریکۆر" و "گادامێر" هێرمنۆتیکیان لە چوارچێوەی شێوەی هوسرێل دا لێکداوە و سەرەنجام "دریدا" بەرهەمگەلێکی بۆ باسی ئەندێشەکانی هوسرێل تەرخان کرد. کەواتە، تێگەیشتن لەو فیلسووفە ناوبراوانە بێ تێگەیشتن لە ئەندێشەکانی هوسرێل کارێکی ئەستەمە.

هەروەک گوتمان هوسرێل سەرەتا بە هۆگرییەکی زۆرەوە خەریکی موتاڵای حیساب بوو، لە ساڵی 1891دا کتێبی "فەلسەفەی حیساب"ی لە چاپدا. بەڵام وردەوردە هاتە سەر ئەو بڕوایە کە راستییە عەینییەکانی حیساب و لۆژیک هەڵگری تاوتوێ کردنی کردەو بزاوە زەینییەکانی مرۆڤە، تەنانەت گوتی کە "چییەتی" شتە ئینتزاعییەکان، وەک رەقەم، دەبێ بەپێی سازبوون و شکڵ گرتنیان لە ئاگایی ئێمەدا بکەونە بەرباس. لەو رووەوە بەرای ئەو باسی راستییەکان لە هەرێمی "ئەزموونی زەینی"دا پێویستی بە دەستەبەرکردنی شێوەیەکی وردبوو، هوسرێل ئەو شێوەیەی بە دیاردەناسی لە قەڵەمدا. بە گوتەی ئەو، کاتێ دەتوانین پەی بە سەرچاوەی مەعریفەی مرۆڤ بەرین، کە جۆری خۆیابوونی دونیا لە زەینی ئەواندا روونکەینەوە. ئەو لەو بوارەدا لە وشەی یۆنانی فاینۆی "*phanio*"کەڵک وەرگرت. بەرای ئەو فاینۆ هەڵدەڕەخسێنێ بۆ خۆیابوون و ئامادەبوونی جیهان لە زەینی مرۆڤدا. بە گوتەی ئەو مانای دونیا ساتێ دەفامرێ کە لە ژێر سەردێڕی وشەی دیاردە "*Phenomeno*"دا بکەوێتە بەر باس. لە راستیدا هوسرێل دەیگوت مەبەستی دیاردەناسی شتێ نییە جگە لە جەخت و وێستان لەسەر ئەو بابەتە کە

دونیا بریتییە لە ئەزموونێك كە ئێمە تێیدا دەژین. ئەو دونیایە ساتێ بەرچاو نوێندرا، مانایەكی پاك و بێ خەوش بەخۆوە دەگرێ و ناوی "ئۆبژە"ی لێدەنرێ. مەبەستی سەرەكی شێوەی هوسرێل ئەوەیە كە لە ئێمە پەی بە هۆكاری پێوەندی نێوان مرۆڤ و دونیا بەرین. یانی بتوانین چییەتی و مانای ئەو پێوەندییە، بەر لەوەی كە بەشێوەی "سووژە" و "ئۆبژە"یان مانا كەینەوە، لێكبدەینەوە. لە راستیدا هوسرێل زیاتر لە سەر وشەی هۆكار و پێوەندی پێدادەگرێ.

بەرای هوسرێل، فیلسووفەكانی پێشوو زیاتر لەوەی كە سەرنج بدەنە ئەو هۆكارە، وەك دوو باسی سەربەخۆ خۆیان بە گەوهەر و مانای مرۆڤ و دونیاوە سەرقاڵ كردووە. هوسرێل دەڵێ ئەو دووانە دەبێ لە پێوەندی لەگەڵ یەكدا بخرێنە ژێر سەرنج و باسەوە.

**• كتێبی "قەیرانی زانستە ئەوروپییەكان و فەلسەفەی مەزنی خواز" وەرچەرخانێكی گرینگ بووە لە ئەندێشە فەلسەفییەكانی هوسرێلدا، هوسرێل لەو كتێبەدا، خەریكی رەخنەگرتنە لە "زانست باوەڕی" سەردەمی خۆی، بەتایبەت ئەو رەخنەی لە شێوەی "دەروناسی" باوی ئەودەم دەگرت. رەخنەی هوسرێل لە زانست باوەڕی سەردەمی خۆی لە چ ڕوانگەیەكەوە بۆ باس و لێكۆڵینەوە لە بارە؟**

یەكێ لە خاڵە گرینگەكانی كێشەی هوسرێل لەگەڵ زانست باوەڕیدا ئەوە بوو كە لە راستیدا كەسانێكی وەك "ماخ" و لایەنگرەكانی، حوكمە زانستییەكانیان وەك "پێش گریمانە" و سەرەتای دەلیلە فەلسەفییەكانیان لە قەڵەم دەدا. واتە راستی حوكمە فەلسەفییەكانیان بە هەڵقولاو لە جێ متمانەبوون و مسۆگەر بوونیان لەسەر حوكمە زانستییەكان دێنایە ئەژمار.

لە راستیدا حوكمەكان لە فەلســـــەفەدا بە دوو لقی گشتی دابەش دەبن، یەكیان حوكمە "شیكارییەكان"ن، كە هەر هەمان رستەكانی لۆژیكی و حیسابن و ئەویتر حوكمی ئەزموونییە، كە بنەمای ئەزموون و لێكۆڵینەوەی بوارگەلی وەك "زانستی سروشتی" و "ژیوناسی" پێك دێنن. كەواتە ئەوانەی بڕوایان بە زانستە، دەیانگوت حوكمی فەلسەفی دەبێ لەسەر بنەمای كەرەسە "ئەزموونی – زانستی"یەكان دامەزرێ. هوسرێل دەیگوت نابێ فەلسەفە وەك دۆڵپای زانست لە قەڵەم دەین، بەڵكوو فەلسەفە زانستێكی پتەوە كە دەشێ بەپێی شێوەی دیاردەناسانە وەك بوارێكی سەربەخۆ بێتە ئەژمار. یانی فەلسەفە بە پاڵپشتی ئەو شێوەیەوە دەتوانێ زاراوەگەلی مەعریفەتی وەك مانا و حەقیقەت و.. روون كاتەوە. هوسرێل دەیگوت: دیاردەناسی دەتوانێ ببێتە بناغەیەكی گرینگ بۆ زانستەكان. بەڕای ئەو لە كاركردنی "زانستە ئەزموونی" و ئیسباتییەكان لە خوێندنەوە و ناسینی میكانیسم و داڕشت و ئەركی زەینی مرۆڤدا دەستەوەستانن، چونكوو ئەو شێوانە تەنیا ئەپەرژێنە سەر بابەتە سروشتیەكان و هەر بەو هۆیە كەوتوونەتە داوی "سروشت بڕوایی" رێكەوە. بەو مانایە كە ساتێ ئێمە زەین و ئاگایی بە كەرەسەی "زانستی سروشتی" دەخەینە بەر تیشكی موتالاْ، لە "چییەتی مەبەستمەند" یان چاوەپۆشین. كەواتە ژیانی زەین پشت گوێ دەخەین و وەك لەشێكی بێگیان دەیناسین، ئەوەش دوورمان دەخاتەوە لە فامینی قووڵ و بە پێزی "گەوهەری ئاگایی".

زەین دەقاودەق وەك سروشت نییە. بەڵكوو چییەتێكی جیاواز لە سروشتی هەیە. ئەركی زانست خوێندنەوەی سروشتە، بەڵام كاری دیاردەناسی خوێندنەوەی زەین و ئاگایی مرۆڤ و پێوەندی ئەوە لەگەڵ دونیا. بەو پێیە راستییە

عەینییەکانی زانستە ئەزموونیەکانی وەك فیزیك و شیمی لە خوێندنەوەی زەیندا، دەستەوەستانن.

لە بواری دەروونناسیشەوە هوسرێل بە شوێن وەرگرتن لە "گوتلۆب فرێگە" گوتی: حوکمی حیساب و لوژیکی لەگەڵ حوکمی دەروونناسی جیاوازی بنەڕەتییان هەیە. چونکە حوکمەکانی حیساب چییەتی شیکاری و تیۆریکیان هەیە، بەڵام حوکمە دەروونناسییەکان چییەتی زانستی و ئەزموونییان هەیە. ئەوانەی بڕوایان بە دەروونناسی ئەو سەردەمە بوو جیاوازییان لە مابەین ئەو دووانەدا بەدی نەدەکرد. بەرای هوسرێل دەروونناسی بەکاروباری رۆژانەو عادەتییەوە خەریکە، هەر بۆیە روانگەیەکی ئەزموونی هەیە و ناتوانین لەو شتانەوە بە رەسم و یاسایەکی لۆژیکی بگەین. حوکمی دەروونناسی بە گشتی چۆن پاڵیان بە کاروباری رۆژانەوە داوە، وەسفی "شیمانە" بە خۆوە دەگرن، بەڵام حوکمی حیساب چییەتێکی پێویست و حاشا هەڵنەگری هەیە. جگە لەوە "پەرەپێدانی ئەزموونی" چییەتێکی "ئیستقرایی"هەیە و هەر لە مەبەستە وردەکانەوە وەدەست دێ و دەگاتە ئاکام. ئەوە لە ساتێکدایە کە یاساکانی حیساب چییەتێکی گشتی و حەتمییان هەیە. لەلایەکی ترەوە حوکمە ئەزموونییەکان پاڵیان بە واقعەوە داوەو حوکمەکانی حیسابیش بەستراونەتەوە بە "ئینتزاعی" زەینی و لە دونیای دەرەوە دەست ناکەون. هوسرێل دوای خستنە رووی ئەو باسە: دەڵێ کە حوکمی دیاردەناسانەش غەیرە ئەزموونین و ئەگەر پێمان وابێ فەلسەفە نابێ لە رێزەی زانستە "سروشتی – ئەزموونی"یەکان دابنرێ، دەبێ لە رێزەی زانست و بابەتە سەربەخۆ و "پێشینی"یەکان بێتە ئەژمار. ئەو پێیوایە زانستی حیساب و لۆژیك لەو رێزەیەن. هەروەك دیتان هوسرێل فەلسەفە و شێوە و میتۆدی فەلسەفی، واتە دیاردەناسی لە رێزەی حیساب لە قەڵەم داو خستیە بەر سەرنج و باسەوە. کەواتە ئەگەر دیاردەناسی بە بوارێکی غەیرە ئەزموونی بزانین، ناتوانین راستی و چەوتی ئەو (بابەتانە) بەپێی روانینە ئەزموونییەکان بسەلمێنین.

**• بەپێی ئەو شتانەی فەرمووتان ئایا دەتوانرێ ئیدمۆند هوسرێل وەك بناغەدانەری فەلسەفەی زانست بە واتا ئەمڕۆییەکەیەوە بێنینە ئەژمار؟**

پێویستە بگوترێ کە هوسرێل لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیدا کتێبێکی نووسی بە ناوی "قەیران لە زانستە ئەورووپییەکان و فەلسەفەی مەزنی خوازدا" لەو کتێبەدا ئەو بیروڕای خۆی لەسەر بارودۆخی زانستەکانی سەردەم دەربڕی. هوسرێل قەیرانی ناوبراوی بە ئاکامی ئاوێتەبوونی "دەروونناسی" و "لۆژیك" دەزانی. پێویستە بگوترێ کە سەرکەوتنی زانستی سروشتی و ژیوناسی لە دۆزینەوەی یاساگەلی زانستی و پەرەپێدانی لقی "دەروونناسی ئەزموونی" لەو سەردەمەدا و بەتایبەت دەسکەوتەکانی "وێوندت" (*wndt*) لە بواری دەروونناسی بووە هۆی گەشبینییەکی بێ سابیقە لەو بوارەدا. بە تایبەت کە دەروونناسێکی وەك "سیگ وارت" (*sigwart*) و "جان ئیستوارت میل" رەوشتەکانی دەروونناسییان لە موتالای لۆژیکدا لە کار کرد. تەنانەت کەسێکی وەك "جۆرج بول" کە "لۆژیکی جەبری" بە لووتکەی خۆی گەیاند، کتێبێکی بە ناوی "یاساکانی ئەندێشە" چاپ کرد و لەو کتێبەدا لە رەوشتی دەروونناسی کەڵك وەرگرت. هوسرێل ئەو ویست و کردەیەی بە جۆرێك قەیران لەو زانستانەدا لە قەڵەم داو تێکۆشا تا لە گشت سووچ و لایەنەکانەوە ئەو قەیرانە بخەنە بەر توێژینەوە. هوسرێل لەو

کتێبەشدا، وەك بەرهەمەکانی پێشووی، لە مابەین "جیهان ژینگە" و "بواری زانست" دا جیاوازی دائەناو گوتی: تەنانەت هایدگێریش لە نێوان ئەو دوو بوارەدا، یانی هەرێمی سروشتی و هەرێمی زانستی بە هەڵە چووە. بەرای ئەو دونیای زانست لە بەرابەر پانتای سروشتی ئێمەدایە، چونکە دونیای سروشتی هی تەواوی مرۆڤەکانە، بەڵام دونیای زانست تەنیا تایبەتە بە ژیاری ئەوروپییەوە و لە ئێستاشدا دەروازەی ئەو پانتایە بە رووی ژیارەکانی تردا ئاواڵە نییە.

بە گشتی بیرمەندانی رۆژئاوا لە سایەی لەکارکردنی بیروڕاو بۆچوونە زانستییەکانەوە بە شوێن دەست داگرتن بەسەر سروشتەوەن. هوسرێل تێدەکۆشێ هەتا لە ڕێی ناسین و چەسپاندنی بابەت و پێشبینی و لێکدانەوە و دەست داگرتن بەسەر سروشتدا، لە شێوەی زانستی حیساب کەڵك وەرگرێ. هەر بەو هۆیەشە کە لە لێکدانەوە و باسی وجودی خۆی خافڵە. کەواتە دەبێ بە یارمەتی کەرەسەی کاریگەر، ئاگای لە وجوودی خۆشی هەبێ. هوسرێل بەو کەرەسەیە دەڵێ "زەینییەتی مەزنی خواز" (*Transcedental subjectivity*) لە راستیدا لە سایەی دیاردەناسی بەرز و مەزنی خوازەوەیە کە دەتوانین هەستی بناسین. کەوابوو ئەو بەخستنە رووی رایەکی نوێ لە بواری زانست و پێوەندی ئەو رایە لەگەڵ روانینی سروشتیدا، باسێکی نوێی لە فەلسەفەی زانستدا دامەزراند و هەر ئەوەش بووە هۆی پەرەسەندنی وردبوونەوە و بیرێکی نوێ لە بۆچوونی زانست و پێوەندی ئەو بیرە لەگەڵ فەلسەفەدا.

- **دیاردە لە روانگەی هوسرێلەوە چ پێناسەیەکی هەیە و چۆن دەکەوێتە بەر تیشکی ئەزموونەوە؟**

گەرچی هوسـرێل یەکەم فەیلەسووفێك نییە کە کەڵکی لە وشەی دیاردە وەرگرتووە، بەڵام ئەو پێی وایە ئەم وشەیە باری "ماناناسانە"ی تایبەتی هەیە، دیاردە هەر وەك پێشتر گوتمان وەرگێڕاوی وشەی فێنۆمینە (*Phenomenon*) هوسرێل بە شتێك دەڵێ دیاردە کە راستەوخۆ بناسرێ. بەڵام مەبەستی لە "تێگەیشتنی راستەوخۆ" دیاردە عەینی و شتە خاوەبەرهەستەکان نییە. بەڵکوو ساتێ بەشتێك دەڵێین دیاردە کە بەشێوەیەکی تایبەت بیخەینە بەر روانین و وردبوونەوەمان. ئەو شێوە روانینەش لە دروشمی ناسراوی "بەرەو لای خودی شتەکان"دا (*Zuden Sachen*) خۆ دەنوێنێ. ئاشکراشە کە "شت" لێرەدا بە مانایەکی بەربڵاو لە کارکراوە ئەگەر بمانەوێ بە زمانێکی ساکار لەو بابەتە بدوێین، دەبێ بڵێین دیاردە ساتێ دێتە ئاراوە کە بەشێوەیەکی دیاردە ناسانە وەشوێن شتێك بکەوین. لە راستیدا، ساتێ شتێك وەسفی دیاردە دەکا، کە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی دیاردەناسانە بێ. کەواتە شتەکان و کاروباری دونیا، تا زەمانێ کە نەبوونەتە بابەتی راڤەی دیاردەناسانە نێوی دیاردەیان لێنانرێ.

- **بەر لەوەی روانگەی هوسرێل لەمەڕ "بەئاگابوون لە دیاردە" و هێنانە پانتای ئاگایی دیاردە بزانین، وا باشە سەرەتا بزانین "ئاگایی" چییە و پێوەندی ئاگایی وەك "بزاڤێك" (*noesis*) و ئاگایی وەك "بابەتێك" (*noma*) چییە؟**

دەتوانین بڵێین کە یەکێ لە بەربڵاوترین و بنەماییترین مەبەستەکان لە "تەکووزی فەلسەڤ" هوسرێل دا، مانای ئاگایی یا "فامە". لەراستیدا دەتوانین بڵێین ئێمە ئەگەر لە مانای ئاگایی نەگەین فامی دیاردەمان بۆ دژوار دەبێ. چۆن ئەو دووانە لە پێوەندی راستەوخۆدان. یانی شتێك کاتێ وەسفی دیاردە بە خۆوە دەگرێ کە لە زەین یا ئاگایی

مرۆڤدا شێوەیەکی "ماقووڵی" هەبێ. لە راستیدا زۆربەی تێکۆشانی هوسرێل لە تەواوی تەمەنی فەلسەفیدا بۆ شیکاری و وردبوونەوە لە مانای ئاگایی تەرخان کرا. ئەو تێدەکۆشا هەتا بنەما و چوارچێوەیەك بۆ ئاگایی مرۆڤ دەستنیشان بکاو دەیگوت: هەتا مرۆڤ لەو چوارچێوەیە نەگا، لە تایبەتمەندییەکانی دونیای دەرەوەش ناگا. ئەو ئاگاییە لە راستیدا بەردەوام بابەتی ئاوێزان و پێوەندیداری تایبەت بەخۆی هەیە.

هوسرێل دەڵێ ئاگایی وەك پردێك وایە، کە رێی پێوەندی لە مابەین "زەین" و "عەین" و "دونیای دەرەکی" و "دونیای ناوەکی" تەخت دەکا. کەواتە هەر شتێك لە دونیای دەرەکیدا بوونی هەیە بەبێ هەبوونی ئاگایی "منی ناسێنەر" ئیمکانی فام و تێگەیشتنی بۆ نارەخسێ. یانی بۆ ناسین و زانین دەبێ لە ئاگایی و سیستەمی فامی زەینییەوە دەست پێکەین و بەرەو شتە دەرەکییەکان لەگەڕدابین. بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین بوونی هەر شتێك بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاگایی ئێمە، لە باری ناسین و زانینەوە هەڵدەوەشێتەوە. لەو ڕووەوە دەتوانین بڵێین، ساتێك باس لە ئاگایی دەکرێ، کە مەبەستی ئاگایی لە شتێك یا لە کەسێك بێ. هەر بۆیە ئەو پرۆسەیە سەرەتا "بەئاگابوون" دەگرێتەوە کە هەر هەمان نۆئسیسی (*noesis*) باسی هوسرێلە، هەروەها داگری بابەت و شتی پێوەندیدار بە ئاگاییەوە کە هوسرێل بە نۆمای (*noema*) نێو دێردەکا. کەواتە "نۆما" بەو شتانە دەوترێ کە ئەکەونە جەغزی تێگەیشتن و هزرەوە. "نۆئسیس"یش سەر بە هەرێمی چالاکی ناسینە. هوسرێل لە قەست لەو وشە یۆنانییانەی کەڵك وەرگرتووە، چونکە بەرای ئەو وشەگەلی باو لە باسی فام و ئاگاییدا، وردە وردە و بە درێژی زەمان، ماناگەلێکی زۆر و "چەند سووچ" بەخۆوە دەگرن. بە گوتەی هوسرێل لە هەر کردەیەکی هزریدا، سێ "هۆکار"ی گەورە بوونیان هەیە کە هاوکات لەگەڵ یەك دێنە دی. یەکیان (*noesis*) و ئەویتر (*noema*) و سێیەمیش "پێداوە بەرهەستەکانە" (*sensedata*) ئەو سێ هۆکارە لەو ساتانەدا کە ئێمە لە بابەتی ئاگایی خۆمان دەگەین، هاوکات کۆدەبنەوە. لە راستیدا "نۆما" لە یۆنانیدا بە مانای فام و تێگەیشتنە. بەڵام هوسرێل پێیوایە "نۆما" بەرهەم یا کەرەسەی ئەندێشەیە. واتە مانا و خەیاڵ و نۆمادەکان. لە راستیدا هوسریل ئەڵێ "نۆما" شەرتی فام و تێگەیشتنی ئێمەیە لە دونیای دەرەکی و "نۆیسیس" هەوڵێکە کە بۆ ئاگایی لە شتێك دەدرێ.

**• هوسرێل لە بواری لێکدانەوەی ئاگاییدا لە زاراوەی مەبەستمەندی(حیپ التفاتی) کەڵك وەرگرت. مەبەستمەندی زەین کە لەسەر تەوەرەیەکی تایبەت دامەزراوە چییە؟**

هوسرێل واتای "*intentionality*" کە بە مەبەستمەندی وەرگێڕدراوە، لە "برنتانۆ" فێربوو. هێندێ لە لێکۆڵەران رایان وایە "ئیبنی سینا" بۆ یەکەم جار لەو وشەیەی کەڵك وەرگرتووە. هەر چییەك بێ رێکەوەندی مەبەستمەندی لە ئەندێشەی هوسرێلدا بایەخێکی تایبەتی هەیە. واتە هوسرێل جۆرێ پێوەندی حەتمی لە نێوان ئاگایی بە مانای "نۆئسیس" و بابەتی ئاگایی بە ناوی "نۆما" دادەمەزرێنێ و پێی دەڵێ مەبەستمەندی. لە راستیدا ئەو پێیوایە لە مابەین ئاگایی و بابەتی ئاگاییدا پێوەندی هەیە. یان بە واتایەکی تر ئەو "عەین" و "زەینی" پێکەوە لکاند. بە گوتەی ئەو بەردەوام زەینی مرۆڤ بۆ لای شتێك پەل دەبزێوێ و دیاردەیەك دەخوازێ، ئەو مەبەستمەندییەی زەین و ئاگایی بە "حیث التفاتي" ناسراوە. بەرای هوسرێل

ئاگایی بەبێ ئەو مەبەستمەندییەی لە زەیندا جێناگرێ. یانی جۆرێ هاریکاری لەمابەین ئاگایی و ئۆبژە (دونیای دەرەکی)دا هەیە کە هوسرێل پێی دەڵێ مەبەستمەندی. تەنانەت لە "خۆ ئاگایی"یشدا جۆرێك مەبەستمەندی بەشێوەی "شوناس" لە مابەین "زەین" و "خود" هەڵدەبەسترێ. بە گوتەی هوسرێل "بەردەوام بیردەکەمەوە"ی دیکارتی لە بارەی شتێکەوەیە لە راستیدا کاتێ زەینی مرۆڤ دەخوازێ لە شتێك بگا، جۆرێ کرداری مەبەستدار و بەردەوام و تەکووز مسۆگەر دەبێ.

**• بەپێی ئەوەی گوتتان ئایا بوونی شتە بەرچاوو دیاردەکان لە ناوەرۆکی ئاگاییەوە بەرهەم دێنین؟ کەوابوو بەپێی بۆچوونی هوسرێل دیاردەیەك، سەربەخۆ و جیا لە ئاگایی ئێمە بوونی نییە؟**

هوسرێل هەر لە سەرەتای لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکانی خۆیدا، لەسەر ئەو مەبەستە پێداگری کرد، کە دیاردەناسی بەردەوام هەوڵێتی هەتا وەبیرمان بێنێتەوە کە مانای سەرەکی "دونیای بەرچاو" شتێ نییە جگە لەوەی کە لە رووبەڕووو بوونەوەی ئاگایی مرۆڤ لەگەڵ شتێ جگە لە خۆی، سەرهەڵدەدا. لەلایەکی ترەوە ئەو بۆچوونە فێرمان دەکا کە مانای "ئاگایی زەینی" (دەروون ذات) پێویستی بە جۆرێکی تایبەتی رووبەڕوو بوونەوە دەگەڵ دونیای دەرەوە هەیە. لە راستیدا جۆرێ ئاڵ وویێری حاشاهەڵنەگر، بەردەوام لە نێوان مرۆڤ و دونیای دەرەوە لە ئارادایە. ئەو بۆچوونە راست لە بەرابەر لێکدانەوەی "فەلسەفە ئیسباتییەکان" ئەوێستێ، کە پێمان وایە دونیا ئۆبژەیەکی دابڕاو لە ئاگایی ئێمەیە و زەین پێوانەیەکە، کە دونیای دەرەکی لە خۆدا جێکردۆتەوە. هوسرێل هەوڵیدا هەتاکوو بەکەڵك وەرگرتن لە شێوەی دیاردەناسانە رووونی کاتەوە کە دوو "قوتبی" "زەینییەت" و "عەینییەت" لە راستیدا ئاواڵدوانەی یەکن و لە پێوەندی دان و ناتوانین بەبێ یەك بیانکەینە بیرۆکە. لەو پێوەندییەدا هەر کام لەو دوو سەرە (قوتب) لە بووندا، خۆی بە قەرزداری ئەویتریان دەزانێ. کەواتە دەتوانین بڵێین دونیای دەرەکی بوونی بەپێی بایەخی ئاگایی زەینی ئێمەوە دەبێتە بابەتی باس و لێکدانەوە.

"ئاگایی"یش بەردەوام ئاگایی لە شتێك یان لە کەسێکە. (ئاگایی لە دونیا) هەروەك گوتم "فرانتس برنتانۆ" لەسەر ئەوە سوور بوو کە زەینی مرۆڤ بریتییە لە تەقەللایەکی مەبەستمەند، واتە بەردەوام لە سنوورەکانی بوون خۆیەوە بەرەو راستی (واقع) لە بزووتن دایە.

هوسرێل بە شوێن وەرگرتن لە مامۆستاکەی، (واتە) برنتانۆ گوتی: دیاردەناسی لەسەر بناغەی ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە ماناکان بە تەنیا نە لە زەیندا خۆبەدەستەوە ئەدەن و نە لە دونیای دەرەکیدا، بەڵکوو لە پێوەندی مەبەستمەندی نێوان ئەو دوو سەرەدا شکڵ دەگرن و دەگووڕێن. هەر بەو پێیە ئێمە نابێ زەین وەك پێوانەیەك دابنێین کە تێگەیشتن و شێوەی شتەکانی لەوەبەر لە خۆیدا کۆکردۆتەوە. کەوابوو نابێ ئۆبژە یان شت، وەك وێنەیەکی لاواز و رەنگ دۆڕاوی راستی، لە زەینی مرۆڤدا بێنینە ئەژمار. ساتێ دەڵێین ئاگایی چییەتی و کردە و خوویەکی مەبەستمەندی هەیە، مەبەست ئەوەیەکە، ساتێ لە شتێ دەگەین زەینی ئێمە لە حەولی ئەوەدایە تا ئەو شتەی کە لە دەرەوەی خۆیدایە وەرگرێ و مانای کاتەوە. ئەو دەمەی موریدەکانی هوسرێل و یەك لەوان هایدگێر، مرۆڤ بە وجوودێك لە دونیادا دەناسن، لە راستیدا ئەوانیش ئاماژە بەو مانایە دەکەن. هوسرێل دەڵێ: مەبەستی سەرەکی دیاردەناسی لە تێپەڕین لە تەنگ و

چەڵەمەکانی "ئیدیالیسم" و "ریالیزم"دایە. لەلایەکەوە دەیەوێ لە "دوالیزمی" نێوان "سووژە" و "ئۆبژە" و فەرزکردنی مانا لە ئاقاری زەین دەربازبێ، لەلایەکی ترەوە بابەتەکانی "شت بڕوایی" و "ریالیزم" ڕەت دەکاتەوە و پێی وانییە کە زەینییەتی ئێمە دەستەوداوێنی بێ ئەملاوئەولای دونیای دەرەکی و واقع بێ. (هیوم، لاک، هابزومیل) هەردوو قوتابخانەی ناوبراو کردەی مەبەستمەند دەخەنە پشتگوێ و بایەخی پێنادەن.

**• رەخنەی هوسرێل لە زانست خوازی، لە کتێبی قەیران لە زانستە ئەوروپییەکان و فەلسەفەی مەزنی خوازدا و رەخنەکانی دواتری، ئەویان گەیاندە ئەو بڕوایە کە چییەتی و زاتی دیاردە گرینگە و دەبێ لێی بکۆڵدرێتەوە. مەبەستی ئەو لە چییەتی دیاردە بەگشتی چییە؟**

هوسرێل لەو کتێبەدا کە دوا کتێبێتی، رێبازێکی نوێی گرتەبەر. ئەو لەو نووسراوەیەدا باسی واتای "جیهان ژینگە"ی هێنایە گۆڕێ. لە سایەی ئەو واتایەشەوە وەبیری هێناوە کە دەروازەی گۆڕەپانی دونیای ژیانی سروشتی بە رووی هەموو مرۆڤەکاندا کراوەتەوە. چۆن هەر کەسێ لەو دونیایەدا لە دایك بێ بە یارمەتی تێگەیشتنی خۆی لەگەڵ دونیا پێوەندی دەگرێ. ئەو دوو پێوەندییە تایبەتمەندیگەلێکی زۆر ئاڵۆز و جێی تێڕامانی هەیە کە دەبێتە هۆی شکڵ گرتنی روانگە و بۆچوونی ئێمە. دونیای زانست لە ئاست ئەو دونیا ئاساییەدا ئەوێستێ. چۆن دونیای زانستی هی هەموو خەڵکی دونیا نییە، بە پێچەوانەی دونیای کولتووری کە هەموو مرۆڤەکان لەودا هاوبەشن، جیهانی زانستی تایبەتی تاقمێکی هەڵبژاردە و ژیارێکی تایبەتە و دەرکی گۆڕەپانەکەی بەڕووی هەموو کولتوورەکاندا ئاواڵە نییە. دونیای زانست بە شوێن دەست داگرتن بەسەر سروشت و حەیاتەوەیە. هەر لەو ڕووەوە خاوەنی مەبەستی تایبەتی خۆیەتی. زانست بۆ وەدەست هێنانی "ناسیاری"، "لێکدانەوە" "لێکدانەوەی هۆکارەکان" "پێشبینی" و زاڵ بوون بەسەر سروشت و حەیاتدا، لە شێوازی زانستی حیساب کەڵك وەردەگرێ. کەواتە لەسەرچاوەی بوونی خۆی بێ هەواڵ و دوورە. هەر بەو هۆیەیە کە لە باس و دەرخستنی خۆی خافڵە و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەستەوداوێنی توانایەکی ئەوپەڕی خۆی بێ. ئەو توانایەش شتێ نییە جگە لە "زەینییەتی مەزنی خواز" هوسرێل لە کتێبی "قەیران لە زانستە ئەوروپییەکاندا" ئاماژە بەسێ قۆناغی پێوەندیدار بەیەکەوە دەکا:

1-هەرێمی ئەو دیاردانەی لەگەڵ دونیای ژیان جیاوازییان هەیە.

2-هەرێمی "عەینی خوازی" زانستەکان، کە لەسەر بنەمای شتە ناسراوو دیتراوەکان دامەزراوە.

3-زەینییەت و بەتایبەت لایەنی مەزنی خوازی. لە راستیدا هەر ئەو زەینە روو لە گەشە و بەرزەیە کە یارمەتیمان دەدا هەتا دونیا بناسین. لەو ئاستەدایە کە ئێمە پێویستیمان بە فەلسەفەی بەرز و دیاردەناسی هەیە. لە راستیدا هەر ئەو زەینییەتە مەزنیخوازەیە کە هەل دەڕەخسێنێ بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەبەستمەندی ئێمە لەگەڵ دونیای دەرەوە.

هوسرێل لە کتێبی "وردبوونەوەکانی دیکارتی"دا واتای زەینییەتی بەرزی خستۆتە بەرباس و لێکۆڵینەوەو لەبەریەکی هەڵوەشاندووە. مەبەستی ئەو لە زاتی (خۆی) مەزنی خواز و روو لە گەشە بنەمای زەینی و ئاگایی مرۆڤە کە بەپێی ئەو بنەمایە مرۆڤ دەتوانێ لەگەڵ دونیای دەرەکی لە

پێوەندی دابێ. هەروەك پێشتریش گوتم: هەر شتێك کە لە دونیای دەرەکیدا بوونی هەیە، تەنیا بەپێی بوونی زەین و ئاگایی لۆژیکی ئێمەوەیە کە مانا بە خۆوە دەگرێ. لە راستیدا زەینییەتی بەرز تایبەتمەندییەکانی دیاردە بە دوو جۆر دەخاتە بەر تیشکی تێڕامان. یەکیان لە بابەت چییەتی بوونیانەوە و ئەویتر شهوودی بوونەکەیان. لە راستیدا ئەو چییەتیانە شتێ نین جگە لە رواڵەتی پێویست و بەردەوامی ئۆبژەکان. دیاردەناسیش رێکی و روونی بەو رواڵەتانە دەبەخشێ. مەبەست لە زات و چییەتی دیاردەکانی ئێمە بریتییە لە بەربلاوترین و پێویستترین شێوەی شتەکان. ئەوەش هەر ئەو شتەیە فیلسووفە کلاسیکەکان پێیدەڵێن جەوهەر ناسینەوەی جەوهەر لە دیاردەکاندا، لە مەبەستی روونکردنەوەی چییەتی شتەکانمان نزیك دەکاتەوە. ئەو شێوە روانینە لە راستیدا لە رەگەزی شهوود و (بینین لە ناخەوە) (*intutcin*) تێگەیشتوویی دێتە ئەژمار. بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین دیاردەناسی شێوەیەك شهوودە. لەو مانایەدا لە بینین نزیکە بەڵام ئەو بینینە لەگەڵ دیتنی ئەزموونی جیاوازی هەیە.

ئەو دیتنە سەر بە جەوهەری شتەکانە نەك (سەربە) خودی شتەکان. کەواتە ئەو دیتنە گەوهەرێکی جیاوازی هەیە. لە راستیدا ئەو دیتنە لایەنی دەروونناسی نییە، بەڵکوو چییەتێکی مەعریفییە. بەگشتی حوکمی دیاردە ناسانە کە ئەکەوێتە بەر تیشکی بینین و شهوودەوە ئەزموون ناکرێ. لایەنێکی وەسفی هەیە و خۆشی دەکەوێتە بەرتیشکی وەسفی دیاردەکانەوە. یانی دەبێ بوترێ کەلەروانینی دیاردە ناسانەدا "چییەتی" و "زاتی" شتەکانە کە دەبێتە بابەتێك بۆ دیتن.

**• هەڵپەساردنی (ئاوێزان کردنی) ئاگایی لە فەلسەفەی هوسرێلدا چ مانایەکی هەیە؟ هوسرێل لەو پێوەندییەدا مەبەستی لە بەکارهێنانی زاراوەی "ئێپۆخی" (*Epoche*) چییە؟**

هوسرێل دەڵێ ساتێ ئێمە دونیای ئاساییمان خستە نێو "کەوان"ەوە، یانی ئەو دونیایەمان بۆ ماوەیەك هەڵپەسارد، ئەوسا لە حاڵێکدا لەنگەر دەگرین کە بتوانین کاروبار و شتەکان وەك دیاردە بخەینە بەر باسەوە. ئەو بەو کارە دەڵێ "ئاوێزان کردنی" (هەڵپەساردنی) دیاردە ناسانە. لە راستیدا هوسرێل پێنج ئەسڵ لە شێوەی دیاردە ناسیدا نێودەبا کە بەو جۆرەن:

1–هەڵپەساردنی پێش گریمانە ئەزموونی و فەلسەفییەکانی دونیای سروشتی. یانی ئەو، بەو کارەی تێکڕای بوون –بێجگە لە ئاگایی– دەخاتە نێو کەوانەوە و لە مانای ئەو دیاردانەی کە لە زەینی ئێمەدان ورد دەبێتەوە. واتە لەسەر ئەو شێوانە جەخت دەکرێ کە مانا لەواندا لە سوێنگەی دیاردەکانەوە بە رووماندا دەپشکوێ و خۆیا دەبێ. لەو حاڵەدا زەین لە لکان و پێوەندی بە واقعەوە دەرباز دەبێ و بەو هۆیە واقع بە پێی پێوەندییەکی مەبەستدار کە لەگەڵ ئاگایی هەیەتی، دەخاتە بەر باسەوە. ئەوەش هەر هەمان شتە کە هوسرێل پێی دەڵێ "ئێپۆخی".

2–هەڵپەساردنی دیاردەناسانە، مەودایەکمان پێدەبەخشێ تا بگەڕێینەوە سەر سەرچاوەی ئەزموونە مەبەستدارەکانی خۆمان. واتە دەبێ ئەو ئەزموونانە بەر لەوەی بکەونە چوارچێوەی عەینیەتەوە بناسین. لە رێی ئەو وەلانانەوەیە کە هوسرێل دەڵێ: دەتوانین بێ پشتبەستن بە پێش گریمانەکان، راستەوخۆ بڕوانینە دونیا. لێرەدایە کە هەستیی بە هەموو لقەکانییەوە لە زەین و ئاگاییدا

یەك دەگرێتەوە. بە واتایەکیتر، بوون بەمانای بوونەوە پێشکەش دەکرێ.

3–لەو پلەیەدا دوای تێپەڕین لە "ئێپۆخی" و هەڵپەساردن، مانا بە جەغزێکی بەرتەسکی واقعی ئەزموونییەوە نابەسترێتەوە، بەڵکوو لە ئاقاری توانایيە پەتییەکانی خۆیەوە دەردەکەوێ. ئێمە دەتوانین لە ئاسۆی بێ سنووری خەیاڵدا هەموو شتێ بە جۆرێ کە لەبار و شیاوە بگۆڕین، تا ئەوەی کە بنەمای "نەگۆڕ" و پتەوی ئەو شتانەمان بۆ دەرکەوێ. ئەو بنەمایە شتێکە کە لە رەگەزی زەین و ئاگایی دێتە ئەژمار. هوسرێل بەو بنەما نەگۆڕ و پتەوە دەڵێ "زات" یا "چییەتی" (*eidos*) شتەکان. ئەوەش شتێکە کە سەر بە ئاگاییە.

4–بریتییە لە شێوەی بینینی لەناخەوەی چییەتی و زاتەکان، کە لە تەقللای "بگۆڕە مەبەستمەندەکان" وەدەست دێ. ئەو دیتنە پێویستە، لە راستیدا داگری تێکڕای ئەو ئەگەرانەیە کە پێشاگایی هەیەتی و بەشێوەی چۆنەتی راستەوخۆ وەردەگیرێ و باس دەکرێ. بەو شێوەیە دیاردەناسی لە رێی "بینینی مەزنی خوازەوە" زەین دەخاتە وردبوونەوە و ئەو توانایەی پێدەبەخشێ کە دیاردە ئەزموونییەکان بەشێوەیەکی رەها بخاتە بەر تیشکی وردبوونەوە و تێڕامان، یانی لەو چوارچێوەیەدا، جۆرێ گۆڕان لە ئەزموونی دیاردەکاندا دەردەکەوێ کە دەیانکاتە جنس و رەگەزی زەین و ئاگایی، جیهان لەوەها بارودۆخێکدا شتێکی ئاسایی و ئاشکرا نابێ، بەڵکوو وەك دەسکەوتی مانا زەینییەکان دەنوێنێ.

5–لەو ئاستەدا وەسفی بنەمای سەرەکی ئەو شتانەی دەکەونەبەر تیرۆژی بیرکردنەوە (*noma*) و هەوڵ و تەقەللای ئاگایی (*noesis*) دەکەوێتە بەرباس. یانی لە چوارچێوەی تەقەللای ئازادی خەیاڵدا، چییەتی وەك جۆرێك بینینی لە ناخەوە رەنگ دەداتەوە. بەو ئاستە دەڵێن وەسفی. لەو ئاستەدا رەوت و توندوتیژی شێوەی پێشوو تۆمار دەکرێ و بەڵگەی تیۆری لێکدانەوەی دیاردەناسانە ئامادە دەبێ. لە راستیدا لەو ئاستەدایە کە ئەزموونی مەبەستمەندی ئێمە، شێوەیەکی وەسفی و شیاوی شیکردنەوە بە خۆوە دەگرێ.

**• چۆن دەتوانین بۆچوون و ویست و بوارە رەخساوە زەینییەکانی پێشوو، کە کار دەکەنە سەر ناسینی دیاردەکان، وەلا نێین؟ فەلسەفەی هوسرێل چ شێوە و رەوشتێك لەو بوارەدا دەخاتە روو؟**

لە پێشدا پێویستە بڵێم کە دیاردەناسی بە هیچ چەشنێ بە شوێن خستنە رووی تیۆری یا گریمانەیەکی تایبەتدا نییە. بەڵکوو تەنیا خەریکی پشکنین و وەسفی دیاردەکانە. هەروەك گوتم توێژکار بە ئاوێزان کردن و هەڵپەساردنی دیاردەناسانە، بەشوێن ئەوەدایە تا لە هەموو روانگەو هەڵوێستە سروشتییەکان کە ڕیشەیان لە داب و نەریتی کولتووری و سروشتی ئێمەدایە دەربازبێ و بە گشتی فەڕزە ئەزموون نەکراوەکان بخاتە ناو کەوانەوە. لەوەها بارودۆخێکدا هیچ حوکمێ بەر لەوەی بکەوێتە بەر پشکنین و توێژینەوە، بێ ئەملاوئەولا وەرناگیرێ. دروشمی "بۆ پێشەوە بەرەو خودی دیاردە و شتەکان" پێمان دەسەلمێنێ کە دیتنی ئاسایی و ناسیاوی شتەکان، بە چییەتی دیاردەکانمان ناگەیەنن. بەڵکوو دەبێ بە یارمەتی شێوازی دیاردەناسی هەموو دیاردەکان لە پێشدا هەڵسەنگێنین و لێکیان دەینەوە و دواتر قەبوڵیان کەین. واتە، دوای توێژینەوە و پشکنینی دیاردەناسانەیە کە شتێك دەبێتە دیاردە.

**▪ توێژەران و لێکۆڵەران ئەو رەخنەیە ئاراستەی شێوەی دیاردەناسی هوسرێل دەکەن کە بۆچی بە شێوەی "بینینی ناخەکی" (شهوودی) رووبەرووی دیاردەکان دەبێتەوە؟ هەروەها دەڵێن ئەو شێوازە ناکەوێتە جەغزی ئەزموونەوە و بێ شك رەفز دەکرێتەوە، رای ئێوە چییە؟**

وەك رۆژ ئاشکرایە کە هەمووان لە سەرەتادا، بابەت و مانا و روانگە و بۆچوونەکانی هوسرێل بەشێوەیەکی خەیاڵ خوازانە و زەینی لە قەڵەم دەدەن و ناچار وا بیر دەکەنەوە کە لە دونیای ئەزموونی ئەمرۆدا ئەو شێوەیە کەڵکی نییە و بەکار نایە. بەڵام بە وردبوونەوە لە بنەمای فەلسەفەی هوسرێل روون دەبێتەوە کە، ئەو بەردەوام لە حەولی جیاکردنەوەی پرۆسەی زەین و ئاگایی لە شتە واقعەکان (*Fact*) بووە و تێکۆشاوە کە بسەلمێنێ ئەو دوو ئاقارە هەرچەند پێوەندی راستەوخۆ و نزیکایەتی تایبەتیان هەیە، بەڵام دەبێ بەشێوەیەکی سەربەخۆ بکەونە ژێر سەرنج و وردبوونەوە. هوسرێل بە دوای روونکردنەوە و سادەکردنەوەی شتەکانەوە بووە، هەر بۆیە هۆگری بە حیساب بووە. چونکە لە حیسابدا ئەملاوئەولاو چۆن و بۆچی لە ئارادا نییە. ئەو دەیویست داوێنی فەلسەفە لە پەڵەی گریمانە و پێش داوەری پێشوو پاك کاتەوە. لە راستیدا ئەو تێکۆشا هەتا قوتابیانی خۆی پێمل کا تا لە روون و ساکار ناسینی "بۆچوونی سروشتی" خۆ بپارێزن و بە چاوێکی وردبینەوە بروانن هەموو شتێ. ئەو بە شوێن ئەوەدابوو هەتا کارکردی زەین و ئاگایی روونکاتەوە، هەر بەو هۆیەشە دیاردەناسی وەك شێوازێکی فەلسەفی دەتوانێ بەشێ لە هەستی بدۆزێتەوە کە دەستی جیهانی ئەزموونی پێی ڕاناگا. سەرەڕای ئەوە خودی دیاردەناسییش بناغەی دونیای ئەزموونی دادەڕێژێ. کەوابوو ئەو هەرێمە بە یارمەتی روانینی ئەزموونی ناناسرێ، بەڵکوو تەنیا لە سایەی بینینی چییەتییەوە، هەلی تێگەیشتنی بۆ دەڕەخسێ. کەواتە ناتوانین هوسرێل بە "زەینخواز"ێکی تەواو بزانین. بەڵکوو ئەو تێکۆشا بە لێکهەڵوەشاندنەوە و تێڕوانینی زەین و کارکردی ئاگایی، لە چوارچێوەی مەبەستمەندیدا، ئەرکی تایبەت و بنەماکەیمان بۆ وەدەرخا.

**• مەبەستی هوسرێل لە هێنانە ئارای "روانگە و بۆچوونی سروشتی" چییە و چ پێوەندییەکی بە "ڕوانگە و بۆچوونی زانستی"یەوە هەیە؟ ئاخۆ ئەو ئاگایەی هوسرێل مەبەستی بووە، لە ڕێی روانگەی سروشتییەوە پەرە دەستێنێ؟**

واتای بۆچوونی سروشتی یا "ڕوانگەی ناسراو و باو" شتێکە کە بنەمای کاری هوسرێلی پێکهێناوە. بە بڕوای ئەو زەینی مرۆڤ لە سەرەتاوە خوو بە شیکردنەوەی باو و ساکاری ژیان دەگرێ و بە وەکارخستنی شوعوور و فامی باو، فێریان دەبێ و بە گشتی کاروباری رۆژانە بە شتێکی ئاشکرا و روون و بێ ئەملاوئەولا دەزانێ و بڕوایان پێدێنێ. بە قەولی هوسرێل، مرۆڤ هەر ئەوەی کە لە دونیای سروشتیدا لە دایك دەبێ، ناچار لە ڕووی خووەوە گیرۆدەی روانین و بارودۆخی سروشتییە. بەڵام ئەرکی سەرەکی دیاردەناس ئەوەیە کە وێڕای ئەوەی لە بارودۆخی رۆژانە و ناسراوی کۆمەڵگای خۆی ورد دەبێتەوە، نیشانیش بدا کە چۆن حەسار و سنووری سروشتی و ژیانی کۆمەڵایەتی بە هۆی رووبەڕوو بوونەوە و ئاڵوویێر لە مابەین کەسانی وشیار و بەئاگای کۆمەڵ دادەمەزرێ و شکڵ دەگرێ. هەروەها ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە چ مانا گەلێك بە خۆوە دەگرن. هوسرێل دەڵێ بە کەڵك وەرگرتن لە "ئیپۆخی"و خستنە ناو کەوانی کاروبار و بۆچوونە باوو سروشتییەکان، دەتوانین بە شان و شکۆ و پلە و پایەی دیاردەناسانە بگەین.

هوسرێل له کتێبی "مانای دیاردەناسی"دا گوتوویه: له مابەین روانگه و بۆچوونی سروشتی و بۆچوونی فەلسەفیدا، جیاوازییەکی بەرچاو له گۆڕێدایه، روانگەی ناسیاو و باو له تێگەیشتن و ویست و داگەڕانی ڕۆژانەوه سەرهەڵدەدا، بەڵام بۆچوونی فەلسەفی بەهۆی تێفکرینه ورد و پڕ سەرنجەکانی فەلسەفییەوه دێنەدی. به گشتی زانیاری ئێمه له رووداوو شتەکان هەر له سەرەتاوه له رەگەزی ئاگایی سروشتییه. بەڵام به پشت بەستن به هەلپەساردنی شتەکان، ئەو هەلەمان بۆ دەڕەخسێ هەتا "زانستی بەر له ئەزموون" (*apriori*) وەدەست بێنین. هوسرێل لەمابەین بینینی قووڵی دیاردەناسانه و وەسفی ئەزموونی و زانستیدا جیاوازی داناو گوتی: دەروونناسی چۆن لەگەڵ هەست و نەست و تێگەیشتن و حوکمەکانی زاڵ بەسەر بوونەوەردا، رووبەڕوویه، له راستیدا له دونیای سروشتیدایه روانگه و بۆچوونی دەروونناس بۆچوونێکی سروشتییه. بەڵام دیاردەناس کاری به بارودۆخی بەرهەست و بەرچاوی بوونەوەرەکان نییه، بەڵکوو هەست و حوکم و تێگەیشتن و شوعووری پەتی جیا له پێوەندییەك که لەگەڵ گیانلەبەران هەیانه دەخاته بەر توێژینەوه. به واتایەکی تر "کەڵکەڵەی" دیاردەناسی چییەتی و زاتی شتەکانه، هەر بۆیه بارودۆخ و کەش و هەواکان لەلانی ئینتزاعییەوه لێکدەداتەوه. له راستیدا "زانسته روون و ئاشکراکان" بەو زانستانه دەگوترێ که لەگەڵ زات و چییەتی بوارێك که مەبەستی سەرەکییه، له پێوەندییدایه و کاری به بوار و وێنه سروشتی و باوەکانی ئەوەوه نییه. هوسرێل دەڵێ: روانینی فەلسەفی و بەگشتی دیاردەناسانه بریتییه له هەڵپەساردنی روانین و بۆچوونی سروشتی.

**• یەکێ له سەرەکیترین زاراوەکانی هوسرێل "دونیای ژین" یا "جیهان ژینگه"یه، (*Lebenswelt*) مەبەست له کەڵك وەرگرتن لەم زاراوەیه چییه؟**

"جیهانی ژین" یا "جیهان ژینگه" له راستیدا ژیانی باو و رۆژانه له خۆ دەگرێ. لەو دونیایەدا هەموو شتێ هەر ئەوەیه که دەبینرێ. ئەزموونی ئێمه لەو دونیایه تێگەیشتنێکی ساکار و بێ وردبوونەوەیه. واته زایەڵەی ساکار و خاوی جیهان له زەیندا، جیهان ژینگه پێکیدێنێ. کەواته له روانگەی هوسرێلەوه جیهان ژینگه سێ تایبەتمەندی گشتی هەیه:

یەکیان ئەوەیه که له کات و شوێندا درێژه و بەردەوامی دەبێ و هەر ئەوەش دەبێته هۆی ئەوەی وه شوێن دۆزینەوەی رێگاچارەی فیکری کەوین.

دووهەم ئەوەی که، له جیهان ژینگەی خۆماندا لەگەڵ یاسا و رێساگەلێ رووبەڕوو دەبینەوه که دەبێ خۆمانیان لەگەڵ رابێنین. بۆ وێنه ئێمه خۆمان لەگەڵ ئاڵوگۆڕی وەرزەکان و تێپەڕینی رۆژەکان رادێنین، هەر بۆیەش دەبێ له بوارەکانی تریشدا خۆمان رابێنین.

سێهەم ئەوەی که، شتەکان و کاروبارەکان هەر بەو شێوەیەی بوونیان هەیه، له زەیندا رەنگ دەدەنەوه. له راستیدا بۆی هەیه شت گەلێ به قەلافەت گەلێکی جۆراوجۆرەوه خۆ به مرۆڤەکان بنوێنن. بەڵام جیهان ژینگه ئەو چەندایەتی و چەند لایەنییه بەرەو یەکیەتی و تاقانەیی رست دەکات و له مابەین ئەوانەدا لایەنی هاوبەش پێکدێنی. واته دونیای زانست له بەرابەر ئەو دونیایەدا قوت دەبێتەوه. زانست به گشتی له ئاڵووێری مابەین کەسایەتییه زانستییەکان له کۆمەڵدا سەرچاوه دەگرێ. ئەو کۆمەڵه تەنیا له کەسایەتییه زیندووەکان پێکنەهاتووه، بەڵکوو هەوڵی

بیرمەندانی رابردووش لەپتەوبوون و بەردەوامی زانستدا بەرچاو و کاریگەرە. چون بیرمەندانی ئێستا لەسەر بناغەی توێژینەوەی بیرمەندانی پێشوو بیروڕای خۆیان دادەمەزرێنن. بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بەرینەوە کە بیرمەندان کەرەسە سەرەتاییەکانی خۆیان لە دونیای سروشتی و بەگشتی لە جیهان ژینگە هەڵدەئێنجن و بە یارمەتی کەرەسە و شێوەی زانستی چییەتی و بوونێکی زانستییان پێدەبەخشن.

▪ **رەنگە کاکڵی سەرەکی بۆچوونی هوسرێل هەر لەو زاراوەیەدا بێ کە پێناسەتان کرد. (جیهان ژینگە)یانی تێگەیشتن لەوەی کە چۆن دەتوانین جیهان ژینگەی خۆمان بە جیهان ژینگەکانی خەڵکی ترەوە بلکێنین و بگەینە تێگەیشتنێکی هاوبەش و روون و ئاشکرا. بەو پێیە جیهان ژینگە شتێکی "نێوان زەینی"یە نەك تاکە کەسی، ئێوە دەڵێن چی؟**

هایدگێر قوتابی هوسرێل لە کتێبی "هەستی و زەمان"دا تیۆری "جیهان ژینگە"ی خستە بەر رەخنەوە. هوسرێلیش لە وەڵامی رەخنەکانی هایدگێر لەسەر جیهان ژینگە لە کتێبی "قەیران لە زانستە ئەوروپییەکان"دا ئاماژە بە کۆمەڵێ ئاگاییەکانی تاکەکەس دەکا و هەڵوێستی "خۆخوازانە"ی (*Solipsism*) پێشوو جێدێڵێ. ئەو هەروەها گوتی کە لە ژیانی رۆژانەی خۆماندا، لە جۆرێ ئاڵووێردا بەشداری دەکەین و لە سایەی ئەو ئاڵووێرە زەینییەدا، بە بۆچوون و روانگەکانی خۆماندا دەچینەوە. بە بڕوای ئەو جیاوازی روانگە و بۆچوونەکان زیاتر لە جیاوازی هەڵوێستی ئاگایی کەسەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. جا ئەگەر لەو ئاڵووێرەدا کەسەکان جێگۆڕکێ بکەن، گۆڕانێ لە هەڵوێستی ئاگایی ئەواندا بەدی دێ. روونیشە کە هوسرێل ئەو تیۆرییەی هەروا تەم و مژاوی هێشتەوە. بەڵام یەکێ لە قوتابیانی ئەو بە ناوی "ئالفێردشوتز" دەستی کرد بە خوێندنەوە و وردبوونەوە لە دونیای "نێوان زەینی" و ئەو تیۆرییەشی لەبەر تیشکی تیۆرییەکانی کۆمەڵناسیدا، پەرەپێدا. "شوتز" دەیگوت: دونیای رۆژانەی ئێمە بەردەوام دونیایە کە لە نێوان زەینەکاندا. لەو دونیایەدا، من و خەڵکانی تر بەشداریمان هەیە. کەواتە دونیای تاکەکەسی ئێمە بە تەواویش تایبەت بە خۆمان نییە. ئێمە مرۆڤەکان لە دەربەندێکی مێژوویدا دەژین و بەشێوەی سروشتی لە ژینی کلتووری کۆمەڵدا بەشداری دەکەین، هەروەك خەڵکی تر لە ژیانی تاکەکەسی ئێمەدا بەشداری دەکەن، ئێمەش لە ژیانی داهاتووەکاندا دەورێکی حاشاهەڵنەگر دەگێڕین.

• **مەبەست لە "زاتی مەزنی خواز" (خۆ) لە فەلسەفەی هوسرێلدا چییە؟ و لە چ پێوەندییەکی لەگەڵ باسی "جگە لە من" یا "ئەویتر" هەیە؟**

هوسرێل لە کتێبی "منطق صدری و استعلایی"دا گوتی "زاتی مەزنی خواز" (خۆ) بەشێوەی حەتم بوونی هەیە و تەواوی دیاردەکانی جیا لەو وجوودێکی وابەستە و پێوەندیداریان بەوەوە هەیە.

هوسرێل لە کتێبی قەیران لە زانستە ئەورووپییەکاندا هێندێ لە توندوتیژی ئەو بابەتەی کەم کردەوە و گوتی "خودی مەزنی خواز" لە راستیدا لەگەڵ دونیای دەرەوە پێوەندی و رووبەروو بوونەوەی هەیە. یانی لەو کتێبەدا، هوسرێل پلەوپایەی رەهای خودی مەزنی خوازی وەلانا. لە راستیدا پێشتر لە ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستدا گوتبووی کە بە "نزمکردنەوەی مەزنی خواز"ی دیاردە ناسانە دەتوانین لە جەغزی حەساری سروشت تێپەڕین و بەرەو هەرێم و

پانتایەك هەنگاو بنێین کە بمانخاتە وردبوونەوە و تێفکرین. بە گوتەی ئەو هەر لە سایەی "نزمکردنەوەی مەزنی خوازی"دایە کە شتێکمان دەست دەکەوێ. ئەو شتەش "خودی مەزنی خواز" یا "ڕوو لە گەشە" یا "ئاگایی پەتی" پێدەڵێن. ساتێ مرۆڤ بە "خودی مەزنی خواز" یا "بەرزە فڕ" گەیشت تەواوی شتەکانی دونیا لای ئەو دەبنە "ئۆبژە" یا بابەتێك بۆ "ئاگایی پەتی". لە ڕاستیدا هەر ئەو ئاگاییە پەتییە کە دیاردەناسی لە هەموو لقەکانی ئەزموون مەزنتر دەنوێنێ. هوسرێل لە سەرەتای ژیانی فەلسەفی خۆیدا بەشێوەیەکی توندڕەوانە جەختی لەسەر ئەو بابەتە دەکرد، کە تەنانەت ئەگەر تەواوی دونیاش لەبەریەك هەڵوەشێ، دیسانیش "خودی مەزنی خواز" و "ڕوو لە گەشە" یا "ئاگایی پەتی" بوونی دەبێ. لە ڕاستیدا بوونی مرۆڤ لە دوو ڕەهەندی "ئەزموونی" و "مەزنی خواز" پێکهاتووە. هەر ئەو دوو ڕەهەندەشە بوونی مرۆڤ پتەو دەکا. ئێمە لە سایەی ئەو خود و زاتە مەزنی خوازەیە کە دەتوانین لە ڕوانگەی سروشتییەوە تێپەڕین و بە ڕوانگەی فەلسەفی و دیاردەناسانە بگەین.

**• ئاخۆ دیاردەناسی هوسرێل شێوازی مێژوویی بەجارێ ئەخاتە لاوە؟ یا ئەوەی کە دیاردەکان لە بارودۆخی مێژووییاندا دەخاتە بەر تیشکی توێژینەوە؟**

هەروەك پێشتریش گوتم هایدگێر تیۆری خودی مەزنی خواز و ڕوو لە گەشەی هوسرێل و بەگشتی فەلسەفەی ئەوی خستە بەر ڕەخنەو گوتی: هوسرێل لە ڕەوتی شکڵ گرتن و سازبوونی ئەندێشەدا هۆکاری مێژوو دەخاتە پشت گوێ. هوسرێلیش لە کتێبی قەیرانی زانستە ئەورووپییەکاندا هەوڵیدا بە هێنانە ئارای باسێك لە بواری پانتایی کولتوور و بەتایبەت جیهان ژینگەوە، لەسەر واتای مێژوو و شوێن دانانەکەی جەخت بکا. بەڵام چون بنەمای لێکدانەوە و شیکارییەکانی لەسەر بناغەی لۆژیك و بە گشتی حیساب دامەزراندووە، دەیگوت: ڕەوتە مێژووییەکان و "ڕێژەیی بوونی" بڕوای نیچە و دیلتای، بواری بۆ قەیران لە زانستە ئەورووپییەکاندا خۆش کردووە و خەریکە هەتا مانای وەهای لۆژیکی بکاتە جێگری "ڕێژەیی بوونی مێژوویی" و جارێکی تر بابەتە لۆژیکییەکان لە بەستێنی ویژدانی مرۆڤدا بتۆژینەوە. ئەو لەرزۆکی و سستی لە ئەستوون و بناغەی "موتڵەق بڕوایی" بە نوێنگەی ئەو قەیرانە لە بیرۆکەی ڕۆژئاوا دەزانێ. هەر بەو بۆنەیەشەوە "دڕدۆنگی مۆدێرنی" بە شێوەی نەخۆشییەك لەبەرچاو دەگرت. ئەو سەلمێنەری ئەو دڕدۆنگییەی لە فەلسەفەی نیچە و دیلتایدا دەدیتەوە. هوسرێل لە سایەی ئەو ڕەهاخوازییەوە حەولیدا فەلسەفە شان بە شانی زانستەکان بەرێتە سەر. هەر چییەك بێ هوسرێل بە خستنە ڕووی تیۆری جیهان ژینگەی خۆی، سیلە چاوێکی خستە سەر مێژوو.

**• ئێستا کە گەیوینەتە ئێرە، چ پێناسەیەك بۆ دیاردەناسی لە گۆڕی دایە و جیاوازی دیاردەناسی لەگەڵ بوار و بۆچوونەکانی تردا چییە؟**

بە کورتی دیاردەناسی بەشوێن ئەوەوەیە تا لە پلەی ناسینی بەرچاو (عەینی) و ڕواڵەتەکانەوە تێپەڕێ و لە هەستی و چییەتی دیاردەکان بگا، دیاردەناسی تێدەکۆشێ ئەوە بسەلمێنێ کە ناسین لە مانا بەدیهاتووە و هەر بەو هۆیەش ناتوانرێ هەروا بە ساکاری دڕدۆنگی لێبکرێ. ئەرکی سەرەکی دیاردەناسی گەیشتنە بە گەوهەری سەرەکی و زاتی شتەکان. لە ڕوانینی دیاردەناسانەدا، ناسینی دونیای بەرچاوو

جیاکردنەوەی لە دیاردە زەینییەکان، لێك هەڵاواردن و ناسینی هەستی بە دوو شێوەی جیا نییە، بەڵکوو ناسینی دوو جۆرەی مانایە. چونکوو ئیتر بکەری ناسین لەلایەك و دونیا لە لایەکی تر دانانرێ، بەڵکوو تێکڕای شت و دیاردەکان لە بەستێنی ویژدانی مرۆڤدا حوزورێکی راستەوخۆیان هەیە. لە راستیدا ئیشی سەرەکی دیاردەناسی تێگەیشتن و هەڵبژاردنی یاساکانی حاکمە بەسەر ئاگایی مرۆڤدا. جیاوازی بنەڕەتی دیاردەناسی لەگەڵ بۆچوونە فەلسەفییەکانی تر، هەر لەسەر ئەو جەختە سەرەکییەیە کەلەسەر مانای زەینییەت و ئاگایی پەتی، یا بە گوتەی هوسرێل "خودی مەزنی خواز" دەکرێ.

**• رەنگە یەکەم دژکردەوە لە هەمبەر ئەندێشەکانی هوسرێلدا، هی قوتابی هەڵکەوتەی خۆی "مارتین هایدگێر" بێ. هایدگێر لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی "دیاردەناسی وجوود"دا لە مامۆستاکەیەوە دەست پێدەکا، ئاتەبایی بیروڕای ئەو دووانە لە کوێدایە؟**

هەر چەند "هایدگێر" دیاردەناسی لە "هوسرێل" فێر بوو، بەڵام بە رەخنە لەسەر ئەو بۆچوونە، لە کتێبی "هەستی و زەمان"ی خۆیدا، هەڵلاوبگرێکی زۆری لە بەستێنی فەلسەفەی سەدەی بیستدا هەڵاییساند. هایدگێر لە باس و لێکدانەوەی وجووددا، لە رەوشتی دیاردەناسی کەڵك وەرگرت، کەچی هوسرێل دیاردەناسی بۆ هەڵێنجانی یاساگەلی حاکم بەسەر ئاگاییدا لەکارکرد. هایدگێر تیۆری "روانگە و بۆچوونی سروشتی" لەسەر باس و لێکدانەوەی رۆژانە دابەزاند. هایدگێر "هەڵپەساردنی" حوکمی هوسرێلی لە شیکردنەوەی دازاین (*Dasein*)دا بەکاربرد و گوتی: بە هەڵپەساردنی بوونەوەرەکان دەتوانین بگەینە زات و چییەتی بوونیان. لە

راستیدا هایدگێر رەوشتی دیاردەناسی لەگەڵ رەوشتی هێرمنۆتێك ئاوێتە کرد و فێڵێکی نوێی بۆ تێگەیشتن لە وجوود خستە روو. مەبەست لە "دیاردەناسی هێرمنۆتێك" توێژینەوە و تێگەیشتنی وجوودە لە دونیادا. دیاردەناسی هێرمنۆتیك بە چاوپۆشین لە چۆنەتی و هەرێمی ئەزموونی پێشوو، خۆی بۆ باس لە وجوود تەرخان دەکا. کاتێ هوسرێل کتێبی "هەستی و زەمان"ی هایدگێری – کە پێشکەش بە خۆی کرابوو – خوێندەوە گوتی: هایدگێر دونیای ناسیاوی سروشتی لەگەڵ پانتای زانست لێ تێکچووە. چونکە شت و کاروباری (جیهان) چییەتێکی وێستاو و خۆڕاگریان نییە و ناتوانن راستەوخۆ ببنە بابەتی توێژینەوەی دیاردەناسانە. چون لە دیاردەناسیدا بەر لە هەموو شتێ وجوودە ئاشکراو ماقووڵەکان، کە پتەو و خۆڕاگرن دەکەونە بەرباس. هوسرێل ئەرکی فەلسەفەی بە جۆرێ "خۆناسی" و تێگەیشتن لە خودی مەزنی خواز دەزانی. بەڵام دواتر بە خوێندنەوەی ئیراد و رەخنەکانی هایدگێر حەولی هەڵپەساردنی ئەو روانینە یەك لایەنەیەی داو بە جۆرێ، بڕوای بەهاوکاری و هاوشانی لە مابەین "زەین" و "عەین" هێنا. بە گشتی مەبەستی فەلسەفەی هوسرێل ناسینی چییەتی زات دەگرێتەوە و دیاردەناسی هایدگێر چاوی لە ناسینی وجوودە.

**• ئەندێشە فەلسەفییەکانی هوسرێل لە بەستێنی رەخنەی ئەدەبیدا تا چ رادەیەك شوێنی داناوە و لەو بوارەدا چ رێگایەکی بڕیوە؟**

قوتابخانەیەکی تایبەت لە ژنێڤ بنیات نرا، کە ئەدیب و رەخنەگرانی ئەو (قوتابخانەیە) ئەسڵی تیۆرییەکانی دیاردەناسی هوسرێلیان لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدیبەکاندا بەکار دەبرد.

ئەو قوتابخانەیە بە قوتابخانەی رەخنەگرانی ژنێڤ ناسرا.

لە ئەمریکاش "هیلس میلێر" (*Hills miller*) بیروڕاکانی هوسرێلی لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکاندا دەکار کرد. بەرای "میلێر" دەقی ئەدەبی رۆچنەیەکە کە "وەرگر" بەرەو مەبەستی ئاگایی نووسەر رێنوێنی دەکا. لە راستیدا لە ڕێی دەکارکردنی رەوشتی دیاردەناسی هوسرێلەوە مرۆڤ دەتوانێ ڕێ بەرێتە ئاقاری ئەندێشە و هەستی نووسەرەوە. ئەندێشە فەلسەفییەکانی هوسرێل لەسەر فۆرمالیستە رووسەکانیش کاریگەری بووە. لە ژنێڤ "ژۆرژ پوولە"ی بلژیکی و "ئیستاروبینسکی" و "ژان رووسە" و "ژان پیریشار" لە جەرگەی ئەو لایەنگرانەی هوسرێل دێنە ئەژمار، کە لە بەستێنی ئەدەبدا، لە بۆچوونەکانی هوسرێل کەڵکیان وەرگرت.

لایەنگرانی شێوەی هوسرێل، بواری مێژوویی، بارودۆخی کۆمەڵایەتی و باری ئابووری نووسەر و خوێنەر دەخەنە نێو کەوانەوە و بەجێی ئەوە رۆدەچنە قووڵایی دەقەوە و دەق بە رەنگدانەوەی تێکۆشانی زەینی بەرهەمهێنەرەکەی لە قەڵەم دەدەن. هەر بەو هۆیە، روو لە هەموو ئەو زانیارییانە وەردەگێڕن کە لە باری ژیانی نووسەرەوە دەیزانن و زۆرتر دەپەرژێنە سەر چییەتی ئاگایی نووسەر. یانی بە شوێن وەدەستهێنان و گەیشتن بە قووڵایی زەینی نووسەرەوەن. بە واتایەکی تر لە ڕێی شیکردنەوەی بنەمای ئاگایی نووسەرەوە، دەچنە جەغزی جیهان ژینگەیەوە. یانی بایەخ دەدەن بە پێوەندی "نێوان زەینی" نووسەر و جیهانێک کە تێیدا ژیاوە و بەشێوەیەکی زەینی پێوەندی لەگەڵی بووە. بە واتایەکی تر، لە ڕێی هەڵەبستنی جۆرێ پێوەندی نێوان زەینییەوە لەگەڵ دەق، رێ دەبەنە بنەمای ئاگایی نووسەرەوە. لە راستیدا بەهۆی کەڵک وەرگرتن لە هەڵپەساردن و ئاوێزان کردنی دیاردەناسانەی هوسرێلەوە دەتوانین بچینە جیهان ژینگەی نووسەرەوە و بیناسین و لەگەڵی هاودڵ و هاوڕێ بین. کەسانێکی وەک "ماریل رمۆن" "ئالبێربگین"، "ژۆرژپوولە"، "ژان رۆسە" و "ژان ئیستاروبینسکی" ئەوروپییەکانیان لە کەم و کووڕی قوتابخانەی پۆزیتیویسم و مێژوو بڕوایی بە ئاگا کردەوە. ژۆرژ پوولە هەر لەو سەردەمەدا کتێبی "رەخنەی ئاگایی" نووسی.

## سەرچاوە

اندیشه‌های فلسفی درپایان هزاره دوم، گفتگو با محمد ضیمران، تهران، هرمس، مرکز گفتگوی تمدنها، 1380.

# خۆرهەڵاتناسی/ خۆرئاواناسی

**هاشم سالح**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

ئێمە زۆرباس لە خۆرهەڵاتناسی و خۆرهەڵاتناسان دەکەین، بەڵام بە دەگمەن قسە لە خۆرئاواناسی و خۆرئاواناسان دەکەین.. شایەنی باسە خۆرئاواناسی زانستێکە پێچەوانەی زانستی خۆرهەڵاتناسیە. ئەگەر خۆرهەڵاتناسی بریتی بێت لە لێکۆڵینەوەی شارستانیەتەکانی خۆرهەڵات، ئەوا خۆرئاواناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە شارستانیەتی خۆرئاوا. بەڵام پێویستە بڵێین خۆرهەڵاتناسی وەك دیاردە و زانستێك پێش خۆرئاواناسی هەبووە.

خۆرهەڵاتناسی وەکو توێژەری فەرەنسی "ژیرار لوکلێر" دەڵێت، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، واتە پاش پەلاماردانەکەی "ناپلیۆن پۆناپارت" بۆ سەر وڵاتی میسر (1798-1801) دەستپێیکرد. ڕاستە ئەم پەلاماردانە لە ڕووی سیاسیەوە شکستی هێنا، بەڵام لە ڕووی فیکری و ئایدیۆلۆژیەوە سەرکەوتوو بوو. ئەمەش بوو بە سەرەتایەك بۆ دروستبوونی زانستی خۆرهەڵاتناسی نوێ. وەکی دەزانرێت "ناپلیۆن" لەو هەڵمەتە سەرەبازییەیدا زیاد لە (167) زانای لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، ئەو زانایانەش سەر بە بوارە جیاجیاکانی وەك: (ئەندازیاری، گەردونناسی، کیمیاگەر، پزیشکی، فەلسەفە و.. هتد) بوون. بەمجۆرە لێرەدا دەبینین کە ئیرادەی هێز پشت ئەستورە بە ئیرادەی مەعریفە، ئەمەش ئەو پەیوەندییەیە کە لە سەرەتاکانیەوە ئاڕاستەی خۆرهەڵاتناسی کردووە. بەڵام نابێت ئەمەش وامان لێبکات کۆی ئەو پرۆژەیە وەك پرۆژەیەکی کۆلۆنیالی سەیر بکەین و وابزانین جگە لە خۆسەپاندن و دروستکردنی هەژمونگەری بەسەرمانەوە، خواستێکی دیکەی نییە. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە کە زۆربەی ڕۆشنبیرانی عەرەب تا ئێستاش تێیدەکەون.

لە ڕاستیدا خۆرهەڵاتناسی زانستێکی حاشا هەڵنەگرە و زانیاریەکی زۆر و زەوەندیشی سەبارەت بە کەلەپوور و کۆمەڵگاکانی ئێمە کۆکردۆتەوە. بۆ

نمونە سێ سەد لێکۆڵیار لە نوسینی کتێبی (وصف مصر)دا بەشداربوون، کە کتێبێکی قەوارە گەورەیە و لە نۆ بەرگ پێکهاتووە و لە نێوان ساڵانی (1809–1928)دا دەرچووە. ئەم کتێبە بە سەرەتای دروستبونی زانستی میسر ناسی یاخود شارستانیەتی میسرناسی دادەنرێت، وەك چۆن بە دامەزاندنی زانستی خۆرهەڵاتناسییش دەدرێتە قەڵەم. ئەم پرۆژەیە گرنگی زیاتر بە مێژوی کۆنی میسر دەدات، واتە میسری سەردەمی فیرعەونییەکان کە قۆناغی بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام دەکات، بەڵام ئەم کتێبە سەرەتایەکیشە بۆ هاتنە ئارای زانستی ئیسلام ناسی، لەبەرئەوەی زاناکانی سەردەمی "ناپلیۆن"، هاوکات بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی میسری ئەو سەردەمەشەوە سەرقاڵ بوون.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، سەردانی گەڕیدە ئەوروپاییەکان بۆ ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست (میسر، فەلەستین، سوریا) زیادیکرد. ئەوەی ڕێخۆشکەریش بوو لە بەردەم ئەم کارەدا، کرانەوەی ناوچەکە بوو بە ڕووی دەرەوەدا، بە تایبەت پاش لاوازبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەو سیاسەتە ڕیفۆرمیانەی "محەمەد عەلی" والی وڵاتی میسر دەستی دابوویە. بەڵام ئەو گەڕیدانە خۆرهەڵاتناسی ڕاستەقینە نەبوون، بەڵکو زوربەیان نووسەر بوون و لەناو بۆن و بەرامەی خۆرهەڵات و کەش و هەوا ئەفسوناوییەکەیدا بە دوای ئیلهامدا دەگەڕان، لەوانەش: (شاتۆ بریان، لامارتین، ئەلیکسەندەر دۆما، جێراردی نێرڤاڵ)، "نێرڤاڵ" کتێبێکی گەورەی بەناونیشانی (سەردانێك ڕووەو خۆرهەڵات) نوسی. هەروەها چەند نوسەرێکی دیکەی وەك: (گۆبینۆو فلۆبێر و.. هتد). پاشان سەرەی گەورە خۆرهەڵاتناسانی ئەوروپا هات کە بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە زمان و کەلەپووری ئایینی و عادات و ترادسیۆنی ئەو هەرێمە بە شێوەیەکی زانستی، ڕویان کردە خۆرهەڵات. لەوانە: (ئەرنست ڕینیانی فەرەنسی، کارڵ بیکەری ئەڵمانی، هیرۆگرۆنگیێ هۆڵەندی، گۆڵدزهیری هەنگاری). لەو کاتەوە خۆرهەڵاتناسی ئەڵەمانی لێهاتووی خۆی سەلماند، چونکە بەشێوەیەکی سەرەکی بایەخی بە تاوتوێکردنی تێکستە ئیسلامیە کلاسیکیەکان دەدا و بەشێوەیەکی فیلۆلۆگی و مێژووی ورد،لە هەوڵی ساغکردنەوەی دەستنوسە کۆنەکاندا بووە. واتە خۆرهەڵاتناسی ئەڵەمانی زۆر گرنگی بە تاوتوێکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگە ئیسلامیەکان نەدەدا، وەکی ئەوەی لەو ماوەیەدا باوبوو. ئەوەی ڕاستی بێت لەسەرەتادا ئامانجی سەرەکی خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانی ئەوەبوو، لەوڕێنگەیە بکۆڵێتەوە کەمەسیحیەتی تێداپەیدا بوو، زیادلەوەی لێکۆڵینەوە دەربارەی ئیسلام بکات.

لێرەوە خۆرهەڵاتناسی ئەڵەمانی بایەخی زیاتری بە باس و خواسە سامیەکان دەدا کە پەیوەست بوو بە لێکۆڵینەوە تەوراتی و ئینجیلیەکانەوە. لە خۆرهەڵاتناسە مەزنەکانی ئەوسای ئەڵەمانیا دەتوانین ناوی هەندێکیان بێنین، وەك: (هـ. ئیواڵد 1803–1875، ج. فیلهاوزین 1844–1918، ت. نۆلدکە 1836–1930). لە کۆی ئەمانە تەنها "نۆلدکە" پسپۆڕ بوو لە زانستی ئیسلامناسیدا و دوای خۆشی کتێبێکی قەوارە گەورەی بەناوی (لێکۆڵینەوە لە قورئان – 1860)، بەجێهێشت. دەکرێت ئەم کتێبە بە یەکەم پراکتیزەکردنی میتۆدی زمانەوانی – مێژوویی، بەسەر تێکستی قورئاندا بدەینە قەڵەم. ئەمەش

وامان لێدەکات بڵێین "نۆلدکە" باوکی دامەزرێنەری خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانییە، دوای "بیکەر" و نەوەی سەردەمی ئەو.

سەبارەت بە "گۆڵد زیهر" (1850–1921)، ساڵی 1873 سەردانی خۆرهەڵات دەکات و یەکەمین جێگایەکیش تیایدا دەمێنێتەوە شاری قاهیرە دەبێت. "گۆڵد زیهر" یەکەمین ئەوروپییە کە وەك خوێندکارێك لە زانکۆی ئەزهەردا وەردەگیرێت و وەکی تەواوی خوێندکارانی ئەویٚ، بەرگی ئایینی دەپۆشێت. لەوێدا چاوی بە "جەماله دینی ئەفغانی" دەکەوێت و پاشان سەردانی هەریەك لە قودس و دیمەشق دەکات و ساڵی 1864 بە کتێب و دەستنوسێکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆ دابست. لەگەڵ گەڕانەوەشیدا، دەست دەکات بە نوسینەوەی توێژینەوە سەرەکیەکانی دەربارەی ترادسیۆنی ئیسلامی و بەتایبەتیش دەربارەی زانستی حەدیس. هەرچی "هیرۆ گرۆنگێی" هۆڵەندیشە (1857–1936)، ئەوا کوڕی قەشەیەکی پرۆتستانتی بووە و تیۆلۆژیای مەسیحی لە (لایدن) خوێندووە، بەر لەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ یەکەمین نەوەی ئیسلامناسانی هۆڵەندی و وەك "دوزی و گۆبز"دا پەیدا بکات. "هیرۆ گرۆنگێی" بەرلەوەی ڕوو لە ئەڵمانیا بکات بە مەبەستی خوێندن لەسەر دەستی خۆرهەڵاتناسی گەورە "نۆلدکە"، نامە گۆڕینەوە لەگەڵ "گۆڵدزیهر"دا دەست پێدەکات و پاشان بڕیار دەدات خۆی تەرخانکات بۆ لێکۆڵینەوەی فیقهی ئیسلامی.

ساڵی 1884 سەفەرە گەورەکەی خۆی بۆ نیمچە دوورگەی عەرەبی دەست پێدەکات و لە شاری جەدەدا چاوی بە زانایانی ئایینی دەکەوێت و پاش مشتومڕێکی درێژ لەگەڵیاندا، کە تیایدا شارەزایی خۆی لە ترادسیۆنی ئیسلامیدا دەسەلمێنێت، زانایانی ئەویٚ قبوڵی دەکەن و وەك یەکێك لە خۆیان حسابی بۆ دەکەن. دوای ئەوەی دەبێتە ئیسلام و ناوی خۆی دەگۆڕێت بۆ "عەبدولغەفار"، دەتوانێت بچێتە ناو شاری مەککەوە. لەوێدا چەندین دەستنوسی دەست دەکەوێت و لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی مەککە دەکۆڵێتەوە، کە بە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست چووە. پاش گەڕانەوەی بۆ هۆڵەندا کتێبێکی گەورە دەربارەی مەککە دەنووسێت کە چەندین وێنەی دەربارەی ئەو شارە تێدایە، ئەمەش یەکەمین وێنەیە دەربارەی ئەو شارە لەبەردەستماندا بێت.

لێرەدا گەر دەرفەت هەبوایە، ئەوا باسمان لە لێکۆڵینەوەکانی "کارل بیکەر و گۆستاڤ تۆن گرۆنباوم و هاملتۆن جیب" و کەسانی تر لە دەستەی یەکەمی خۆرهەڵاتناسان دەکرد. بێگومان ئەوانە هەندێکیان پەیوەندیان لەگەڵ ئیدارەی کۆلۆنیالی وڵاتەکانیان هەبوو، یاخود کاری ڕاوێژکاریان لە وەزارەتی دەرەوەدا کردووە و.. هتد، بەڵام ئەمە لە گرنگی تۆژینەوە زانستیەکانیان کەم ناکاتەوە. هاوکات لێرەدا پێویستە باس لە گرنگی ئەو باس و لێکۆڵینەوانەش بکەین، کە نەوەی دووەمی خۆرهەڵاتناسان نوسیویانە و پاشان دەستەی سێهەمی خۆرهەڵاتناسانی سەدەی بیستەم دێن کە بریتین لە (ژاك بێرك، مەکسیم ڕۆدنسۆن، جۆزیڤ ڤان ئیس و.. هتد).

بەڵام نابێت وا تێبگەین کە خۆرهەڵاتناسی تەنها تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، بەڵکو خۆرهەڵاتناسیەکیش هەیە تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە شارستانیەت و کلتوری خۆرهەڵاتی دوور. وەك ئەو خۆرهەڵاتناسیەی بایەخ بە لێکۆڵینەوەی شارستانیەتی هیندی و چینی و یابانی دەدات. ڕاستە ئەوروپاییەکان بەر لە کەسانی

دی بایەخیان بە ئێمەدا، لەبەرچەند هۆیەکی وەك: نزیکایەتی جوگرافیمان لە یەکتریی، هەروەها لەبەرئەوەی ناوچەی ئێمە شوێنە پیرۆزەکانی مەسیحیەتی لێیە کە ئایینی سەرەکی خۆرئاوایە. بەلاّم پاش ئەوەی شارستانیەتی خۆرئاوا بە هێز و دەوڵەمەندتر بوو، ئیتر ئاوڕیشیان لەو ئایین و ترادسیۆنانەش دایەوە کە یەکتاپەرستی نین. بەمجۆرە لە بەشەکانی خۆرهەلاّتناسی ناو زانکۆکانی خۆرئاوادا دەبینین، بەشێك تایبەتە بە کەلەپووری ئیسلامی و بەشێکی کە بە کەلەپووری هێندۆسی و بودایی و کۆنفۆشیۆسی و کەلەپووری چینی و بەشێکیش بایەخ بە کەلەپووری یابانی دەدات.

لێرەدا دەبینین خۆرئاوا توانای ئەوەی هەیە لە تەواوی ئەو شارستانیەتە مەزنانە بکۆڵێتەوە کە سەردەمانێك پێشەنگی مرۆڤایەتی بوون، ئەویش بەهۆی ئەوەی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە لە ڕووی تەکنۆلۆژی و زانستیەوە، بۆری سەرجەم شارستانیەتەکانی دیکەی داوەتەوە.

بەمجۆرە گەورە خۆرهەلاّتناسان لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئنگلستان و هۆڵەنداو.. هتد، پەیدابوون.. خۆرهەلاّتناسیش ئەو کەسە ئەوروپییەیە کە ژیانی خۆی تەرخانکردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە ترادسیۆنەکانی دیکە، کەواتە خۆرهەلاّتناس خاڵی پێکگەیشتنی ڕۆشنبیرییە لە نێوان کلتوری خۆیی و ئەو کلتورە خۆرهەلاّتیەی لێکۆڵینەوەی لە بارەوە دەکات.

بۆ نمونە خۆرهەلاّتناسێکی فەرەنسی کاتێك لە کەلەپووری ئیسلامی دەکۆڵێتەوە، ناچار دەبێت زمانی عەرەبی فێرببێت، بۆ ئەوەی لە دەستنوس و تێکستەکان تێبگات. هەندێ جاریش دێت بۆ وڵاتەکانمان یاخود ڕودەکاتە زانکۆکانمان، بە مەبەستی ئەوەی بەچاکترین شێوە زمانەکەمان فێربێت ئاشنایەتی زیاتر لەگەڵ کلتور و کەلەپوور و میللەتانی ئێمەدا پەیدا بکات. هەندێك جار ڕادەی سەرسامی ئەو خۆرهەلاّتناسانە بە کەلەپوور و شارستانیەتی ئێمە دەگاتە ئەوەی، ئایینی خۆیان بگۆڕن و بێنە سەر ئایینی ئیسلام، نمونەی وەك ئەوەی لە "ڤانسان مۆنتێل" ڕویداو ناوی خۆی گۆڕی بە "ڤانسان مەنسور مۆنتێل".

کەواتە لێکۆڵینەوە لە ترادسیۆنەکانی تر بۆ خۆی بریتییە لە پرۆسەیەکی کارلێکردنی کلتوری. کرانەوەش بەسەر کلتورەکانی دیکەدا و ئاشنابوون بە زمان و ترادسیۆنی ئایینی و ئەدەبی و فەلسەفی میللەتانی دیکە، لە خۆیدا سەرکێشیەکی گەورەیە. ئەم پرۆسەیە دەبێتە مایەی گۆڕینی ئەو کەسە یاخود دەسکاریکردنی، بەم پێیەش ئەو کەسە زۆر لە جاران زیاتر کراوەتر دەبێت.

ئەمەی باسمانکرد تایبەت بوو بە خۆرهەلاّتناسی و خۆرهەلاّتناسەکان، بەلاّم بابزانین خۆرئاواناسی چییە و خۆرئاوا ناسەکان کێن؟ سەربوردەی ئەوانە چییە کە بە ئاڕاستەی پێچەوانەدا دەڕۆن، واتە ئەوانەی بە لێکۆڵینەوەی کلتور و شارستانیەتی خۆرئاواوە خەریکن؟ چونکە ئەمانەش بۆ خۆیان ناوەندێکن بۆ بەیەکگەیاندنی کلتوری، لە نێوان عەرەب و ئەوروپا یان تورك و ئەوروپا یاخود فارس و ئەوروپا و.. هتد. ئەگەر خۆرهەلاّتناسەکان کاریان ئەوە بوو بێت لە شارستانیەتەکانی خۆرهەلاّتیان کۆڵیبێتەوە، هەر لە شارستانیەتی ئیسلامی و هیندیەوە تا چینی و یابانی، ئەوا کاری خۆرئاوا ناسەکان کە لە شارستانیەتی خۆرئاوا دەکۆڵنەوە ئەوەیە تاوتوێی ئەو شارستانیەتە بکەن، ئیتر فەرەنسی بێت یاخود ئەڵمانی یان ئینگلیزی و ئەمریکی و ..هتد.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە خوێندکارانی خۆرهەلاَت ڕویان لە زانکۆکانی خۆرئاوا کرد، وەك زانکۆی (سۆربۆن و بەرلین و ئۆکسفۆردو کامبریدج)، ئەم پرۆسەیەش تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ بەردەوامە، هەر لە "ڕەفاعە ڕافع تەهتاوییەوە تا ئەحمەد لوتفی سەید و تەها حسێن و محەمەد مەندورو.. هتد". خۆرئاواناس ئەوکەسەیە بەشێکی ژیانی لەخوێندنی زمانە بیانیەکانی وەك فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵەمانیدا بە خەرجداوە، هەروەها کەسێکیشە لە کلتوری نوێی ئەوروپی ئاگادارەو بە میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی ئاشنایە، ئەویش لە ڕێی زانینی زمانێکی خۆرئاوایی یان فێربوونی زیاد لە زمانێك.

کەواتە زانستی خۆرئاوا ناسی هەیە، بەڕادەی ئەوەی زانستی خۆرهەلاَتناسی هەیە. زانستی خۆرئاواناسی تەنها تایبەت نییە بە عەرەب و موسوڵمانان، بەڵکو لەلای یابانی و چینی و هندیەکانیش هەیە.. پاش ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا شارستانیەتی خۆرئاوا سەرکەوت و لە ڕووی زانستی و تەکنۆلۆژی و فەلسەفیەوە بالاَدەستی خۆی سەلماند، ئیتر بووە قیبلەگای میللەتانی دنیا و هەموان لە هەوڵی ئەوەدان زانیاری زیاتری لە بارەوە بزانن، بۆ ئەوەی لە نهێنی سەرکەوتن و بالاَدەستێتی تێبگەن.

یابان بەمجۆرە بەسەر ئەوروپادا کرایەوە، پاش ئەوەی بۆ ماوەی چەندین سەدە بەسەر خۆیدا داخرابوو. خۆرئاواخوازی یابان لەگەڵ بنەماڵەی (میچی)دا دەستی پێکرد، ئەم بنەماڵەیە لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە حوکمڕانی وڵاتی یابانیان گرتە دەست. ئەڵبەتە هەوڵی کرانەوە بەسەر خۆرئاوادا زۆر پێش ئەو مێژووە دەکەوێت لە یاباندا، بەلاَم ئەو هەولاَنە پچڕپچڕ و لاوەکی بوون. بنەماڵەی (میچی) لەگەڵ هاتنیاندا دروشمی (کرانەوەیان بەسەر شارستانیەت و ڕۆشنگەریدا) بەرزکردەوە، بۆ ئەوەی یابان بگەیەننە ڕیزی جیهانی پێشکەوتوو.

بەر لە سەردەمی حوکمڕانی بنەماڵەی (میچی)، ئەو خوێندکارانەی لە یابانەوە ڕەوانەی دەرەوەکرابوون بۆ خوێندن، ژمارەیان لە سێسەدکەسێك تێپەڕی نەدەکرد، بەلاَم دوای ئەوە ژمارەیان بوو بە هەزاران و بنەماڵەی فەرمانڕەواش داوای لێدەکردن خۆیان لە تەواوی بوارەکانی وەك: (پزیشکی و ئەندازیاری و تەکنۆلۆژیا)، بەهرەمەند بکەن و سەرجەم ئەو شتانە بۆ وڵاتی یابان بگوازنەوە. لەم سەروبەندەشدا بیریارێکی وەك "فۆکۆ زاوا یۆکیشی" (1835–1901)، ڕۆڵێکی گەورەی لەم بوارەدا گێڕا.

"یۆکیشی" پاشا ئەوەی سەردانێکی خۆرئاوای کرد، ئیتر کەوتە داواکردنی ئەنجامدانی گۆڕانێکی گشتی و هەمەلایەن لە یاباندا و هەروەها کەوتە بانگەشەکردن بۆ خۆرئاواخوازیەکی تەواو. پاشان یەکەمین پرۆسەی وەرگێڕان لە زمانە ئەوروپییەکانەوە بۆ زمانی یابانی دەستی پێکرد، بەمجۆرە بەرهەمەکانی "مۆنتسکیۆ و ژان ژاك ڕۆسۆ و جۆن ستیوارت میل و هربەرت سبنسەر"، بۆ سەرزمانی یابانی وەرگێڕدران. بەلاَم لە یاباندا وەك لە شوێنەکانی تریشدا، تەنها کتێب تەعبیری لە مۆدێرنەو نوێبوونەوە نەدەکرد، بەڵکو ڕۆژنامە و گۆڤاریش بەو کارە هەڵدەستان. لەگەڵ هاتنی سەردەمی حوکمڕانی بنەماڵەی (میچی)یشدا، ڕوناکبیرانی یابان گرنگی زیاتر و زۆرتریان بە بواری ڕۆژنامەگەری دەدا. ساڵی (1861) لە شاری ناکازاکی یەکەمین ڕۆژنامەی یابانی دەرچوو کە بە

زمانی ئینگلیزی بوو. ساڵێك دوای ئەوەش یەكەمین ڕۆژنامە بە زمانی یابانی بڵاوكرایەوە. لێرەوە كێشەیەك لە نێوان ئەوانەی داوای كرانەوەیان دەكرد لە پێناو نوێبونەوەدا، لەگەڵ ئەوانەی نەیاری كراوە بوون و داوای دەركردنی بیانیەكانیان دەكرد لە وڵاتدا، دروست بوو.

چونكە فێندەمێنتالیستە یابانیەكان پێیان وابوو هەرچی بیانی بێت و یابانی نەبێت، بەربەری و دڕندەیە. كەواتە یابانیش وەكی شارستانیەتەكانی دی لە بەرامبەر كێشەی خۆرئاوا خوازیدا، لەناوخۆدا دوچاری كێشە و ململانێ بۆتەوە. واتە ئەمە پرۆسەیەك نییە بە تەنها تایبەت بێت بە موسوڵمانان یان چینی و هندییەكان، بەڵكو لەناو هەر نەتەوەیكدا ئاقارێك هەیە كە باس لە پاراستنی بنەماكان و شوناس و ترادسیۆنی ئەو نەتەوەیە دەكات و هەموو كرانەوەیەكیش بەڕووی دەرەوەدا، بە هەڕەشە و مەترسی دەزانێت بۆ سەر كلتور و بەهاكانی ئەو نەتەوەیە.

سەرەڕای هەموو شتێك، بەڵام دواجار ئاقاری نوێخوازەكان لەیاباندا سەركەوتن، پاش ململانێیەكی دوور و درێژ لەگەڵ فێندەمێنتالستەكاندا، ئەوانەی ئیمپراتۆریان دەپەرست و بیروڕای یابانیەكانیان بەتاكە بیروڕای ڕاست و دروست دەدایە قەڵەم و لە دەرەوەی ئەوەش هەموو شتێكیان بە هەڵە و گومڕای دەزانی. فێندەمێنتالستی یابانی پێی وابوو بە كرانەوە بەسەر ژیاری خۆرئاوادا، یابان جەوهەری خۆی لە دەست دەدات. ئەمەش هەمان ئەو قسانەیە كە فێندەمێنتالستەكان لە هەموو جێیەكدا دەیكەن.

بالێرە بەدواوە سەرنج لە شارستانیەتی چینی بدەین. دەكرێت بڵێین بیریارێكی وەك "یەن فۆ" (1853–1921)، بە باوكی ئەنتلجنسیای چینی نوێ دادەنرێت، ئەو توانی سەرەتای بزاوتێكی وەرگێڕانی گەورە لەو وڵاتەدا دروست بكات، كە لە دواتردا دەبێتە مایەی گۆڕینی كایەی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی لە چیندا. هەروەها "یەنفۆ" بە ڕابەری ڕۆژنامەگەری نوێی چینی ناودەبرێت و ناوبراو بۆ ماوەی دوو ساڵ لە بەریتانیا خوێندویەتی، واتە لە نزیكەوە بە خۆرئاوا ئاشنا بووە نەك تەنها لە ڕێی كتێبەوە. ئەو لە یەكەمین ئەو چینیانەیە كە زمانی "شكسپیریان" بە چاكی زانیووە و قسەیان پێكردووە، هەروەها كتێبی چەندین بیریاری ئەوروپایی بۆ سەر زمانی چینی وەرگێڕاو، لەوانە كتێبەكانی: "هربەرت سبنسەر و ئەلدۆس هكسلی و ئادەم سمێس و شارل دی مۆنتسكیۆ و.. هتد". هاوكات بۆ خۆشی چەندین كتێبی نوسیووەو یەكێك بووە لەوانەی زۆر بە شارستانیەتی خۆرئاوا سەرسام بووە و پێیوا بووە لە سەرو ژیارەكانی دیكەوەیە. ئەمە وایلێكرد دەستبكات بە ڕەخنەگرتن لە كەلەپووری تەقلیدی چین، چونكە پێیوابوو كەلەپوورێكی چەقبەستبووە و قودرەتی گۆڕانی نییە. ئەمەش لەگەڵ فێندە مێنتالستە كۆنفۆشیۆسیەكاندا كێشەی بۆنایەوە، لە بەرئەوەی ئەوانە بە ئەڵقە لە گوێی بۆ خۆرئاوا تاوانباریانكرد!

بەمجۆرە شەڕ لە نێوان ڕۆشنبیرە نوێخوازەكانی چین و ڕۆشنبیرە تەقلیدییەكانی ئەو وڵاتەدا دەستی پێكرد، تەواو وەكی ئەوەی لە ناو ڕۆشنبیری هندی و یابانی و ئیسلامیدا ڕوویدا. شایەنی باسە بەلای زۆربەی چینیەكانەوە كۆنفۆشیۆسی بە عەقیدەیەكی فەلسەفی یاخود بە قوتابخانەیەكی فیكری دەدرێتە قەڵەم، بەڵام ئاینێك نییە چون ئایینی مەسیحی و ئیسلام. چونكە وەكی دەزانین چەمكی ئاین لە وڵاتی چیندا بوونی نییە، بەڵام بیروباوەڕی كۆنفۆشیۆسی قودسیەتێكی

لەڕادەبەدەری هەیە و وەکی ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی دەسەڵات وایە لەو وڵاتەدا، واتە کۆنفۆشیۆسی لە چیندا وەك جۆرێك لە زانستی سیاسی سەیری دەکرێت. سەرەڕای ئەوەی عەقیدەیەکی مۆراڵی و ویژدانی زۆربەی هاوڵاتیانی چینییە، بەم پێیە دەکرێت بڵێین ڕۆڵی ئایین دەگێڕێت.

ڕەنگە پابەندبوونی هاوڵاتیەکی تەقلیدی چینی بە بیروباوەڕی کۆنفۆشیۆسییەوە، هیچی لە پابەندبوونی کەسێکی مەسیحی یان موسوڵمان بە ئایینەکەی خۆیەوە کەمتر نەبێت. تەنانەت هەندێك لە فێندەمێنتالستە چینییەکان دەڵێن: (کۆنفۆشیۆسی تاکە بیروباوەڕێکی ڕاست و دروستە و پێویستە ڕۆژێك بێت تەواوی دنیا بگرێتەوە..).

## سەرچاوە

الشرق الاوسط، بەرواری 2001/12/13

# قانوون و هێز

## -بەشی دووەم-

له عەرەبییەوە: ئاسۆ كەریم

### هێز:

بەشـێوەیەكی گشـتی باسمـان لـەو توخمـە پێویستەی دەسەڵاتی شەرعی كرد تا قانوون بكارێ فەرمان و ئەركی خۆی لە هەر كۆمەڵگەیەكدا ببینێ -واتە رۆڵی ئانو لە ئەفسانەی وڵاتی میزۆپۆتامیا- ئێستاش پێویستە شتێكیش لەمەڕ هاوتاكەی كە "هێزە" بڵێین كە لە "ئینلیل"ی خوادوەندی باهۆزە لەم ئەفسانەیەدا.

دەشێ هەوەڵجار قسە لەبارەی پێوەندیی هێز بە دەسەڵاتەوە بكەین، ئەو ژی بە سەرنجدانی ئەو كۆمەڵگایانەی كە بەشێوەیەكی كاراو تەواو كۆنترۆڵ كراوە بەبێ ئەوەی كە رەعیەت هیچ بڕوایەكیان بە رەوابوونی ئەم كۆنترۆڵكردنە هەبێ. ئەمە بەناچاری لە هەموو كۆمەڵگایەكاندا وا نەبووە، نەمازە لەو كۆمەڵگایانەی كە دانیشتوانەكانیان لە رەعیەت یان كۆیلە پێكهاتبوون وەكو سپارتای كۆن یان ئیمپراتۆریای رۆم كە زۆربەی دانیشتوانەكەی كۆیلە بوون. چونكە تەنانەت لەم كۆمەڵگایانەشدا، وێڕای ئەو كوڵەمەرگی و دەردیسەرەی كە هەبووە، ئەوا رەوایبوونی ئەو دەسەڵاتەی كە دەوڵەت پراكتیزەی كردووە، جێگەی باوەڕی دانیشتوان سەرلەبەر بووە.

هەرچەند دەشێ كۆمەڵگەی واش هەبووبێ كە لە بشێوی و ئاژاوەدا نەژییێ، لێ زۆرینەی دانیشتوان باوەڕیان بە رەوایی ئەو دەسەڵاتە نەبووە كە كۆنترۆڵی كردوون. نموونەی ئەمەش، لە شەڕی دووەمی جیهاندا، هێزەكانی نازی چەند وڵاتێكی ئەورووپایان داگیر كرد بوو و هێندەش هێزیان هەبوو ویست و خواستی خۆیان بەسەر دانیشتواندا بسەپێنن. لێ دانیشتوانی وڵات داگیركراو رەوایبوونی دەسەڵاتی داگیركەرە نازییەكانیان رەتكردەوە. راستە/ ئەم رەوشە، رەوشێكی كاتەكی بوو، ئەگەر نازییەكان لەشەڕدا سەربكەوتبانایە لەوانەبوو باوەڕ بە رەواییبوونی فەرمانڕوایی خۆیان خەلق بكەن هەروەكو نۆرماندییەكان كە پەلاماری بەریتانیایان داو بەسەر ئەنگلۆ- ساكسۆنەكاندا

سەرکەوتن. گومان لەوە دەکرێ کە داخوا بەراست تا چەند تەنیا بەپشبەستن بە هێزی زەبروزەنگ و ترسەوە، بەبێ بوونی توخمی شەرعییەت، دەشێ دەسەڵات و کۆنترۆڵ بپارێزرێ، با لەهەندێ هەلومەرجی ناوزازەو تایبەت و بۆ ماوەگەلێکی کورتخایەن هێز شیا بێ ئەمە بهێنێتەدی.

داخوا ئەمە بەو مانایەیە کە لەدوامەنزلدا، قانوون تەنیا بە پێوەری هێز راڤە دەکرێ؟ و هەروەکو لەسەر زاری "تراسیماخوس *Thrasymachus*" لە کتێبی "کۆمار"ی ئەفلاتوون داهاتووە کە لە بارەی داد-ەوە دەدوێ و دەڵێ قانوونبریێتیە لە "فەرمانڕەوایی هەرەبەهێزەکە" داخوا راستە قانوون تەنیا بریێتییە لە کۆمەڵێ بڕیار و بنەمای داسەپاو بەزۆر؟

لەمبارەوە چەندین دژە-بۆچوون هەن، لەهەمووان لۆجیکتر و بەڵگەبەهێزتر ئەو بۆچوونەیە کە دبێژە: بەڵگەهێنانەوەی ئەم تێڕوانینە بە باری هێزە داگیرکارە نازییەکان، هەوڵدانێکە بۆ بە زۆر تەنگەبەرکردنی قانوون لە شێوەیەکی پەراوێزکەوتوو و رەوشێکی ناوازە لەجیاتی تێگەیشتنی قانوون لە شێوە بەجیاهەڵکەوتووەکەیدا. راستە هەندێك گوتیان ئەو رێساو بڕیارانەی لە هەلومەرجی داگیرکاریی نازیدا سەپێندران، بنەمای ئاکارەکی یان شەرعییان نییە و ئەم بڕیارو رێسایانە هەرگیز ناگەن بەئاستی قانوون، بەڵکە بە بڕیارە داسەپاوەکانی چەتەو باندو رێکخراوە تیرۆریستییەکانی لەبابەتی مافیا لە سەقلیە دەچن. لێ ئەم پاساو و بەڵگەیە هەرچۆن بێ کە دواتر دەگەڕێینەوە سەری، لێرەدا هەر هەندە دەڵێن: لە ماوەگەلی شەڕ یان شۆرشدا — واتە ماوەگەلی ناوازە- دەکرێ کاتەکی بەهێزی زەبروزەنگ یان تەنیا بە تیرۆر و تۆقاندن فەرمانڕەوایی بەسەر کۆمەڵگەدا بکرێ، بێگومان ئەمەش هۆیەکی بڕواپێهێن نییە کە قانوون تەنیا بەدەربڕی هێز بزاندرێ و بەس.

لە ئالەکا دی، داخوا دەشێ هزری قانوون بکرێ، بەلایەنی کەمەوە لە باری کردەنییەوە، بەبێ ئەوەی پشتئەستوور بێ بە هێزێکی کارا؟ راستە هێزی قانوون هەمیشە بەو بنەماو رێسایانەوە بەندە کە دەشێ بەزۆر بسەپێندرێن، چونکە جەللاد و زیندانەوان و دەرگەوان و پۆلیس هەر هەموویان بەشێکن لە دەزگای سیستەمی قانوونیی ئارا. ئەم تێڕوانینە باوە لەم دەستەواژەیەدا پۆختە بووەتەوە کە دادوەرێکی بەریتانی گوتویەتی: چاکترین تاقیکردنەوە کە داخوا ئەو کەسەی خۆی شێت کردووە، لە بەرانبەر ئاکارو کردەوەکانی خۆی بەرپرسە، ئەوەیە کە داخوا ئەو دەمەی دەستی ئەو کەسە بەدەست پۆلیسەوەیە، کارو کردەوەی لەمبابەتە دەکا.

وتەیەك هەیە لەبارەی مۆرکی زۆرەملێی قانوون جێگەی بایەخ بێ ئەوەیە کە مرۆی وا هەن کەس گومان لە دڵسۆزیی ئەوان ناکات، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هێز یان توندوتیژی خۆی لە خۆیدا، چەوت و هەڵەیە، ئەو قانوونەی بە تەواوی پشت بە زەبروزەنگ ببەستێ ئەوا پرەنسیپەکانی رەوشت و ئادابی هەقوێژ دەخاتە ژێر پێوە، ئەوانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هێز بریێتیە لە رەتکردنەوە یان وردوخاشکردنی قانوون و پەنا بۆ هێز بردن دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی قانوونەوە. واتە هێز توخمێکی لایدە و نامۆیە و ئەو دەمەی کە حوکمی قانوون پەکی دەکەوێ، پەنا بۆ هێز دەبردرێ.

مسۆگەر ئەم تاوتوویێکردنە هەرچەند پاساوی خۆی هەبێ، ئەوا بشێوی لێدەکەوێتەوە و بەشداری

له تێگەیشتنی ئەرك و وەزیفەی قانوون ناكات، تەم تومانێكی چڕ دەخاتە سەر نیشانە گرنگەكانی قانوون و بەبێ ئەوان ناشێ دەوری قانوون لە كۆمەڵگەی مرۆیی تێبگەین. هەندێ لە پشتەوانانی ئەم دیدگایە دەڵێن تاكە قانوون كە ئەوان وەكو قانوونێكی راستەقینە ددانی پێدا بنێن، قانوونی رەوشتە، ئەم قانوونە خۆی لە هەموو شێوەكانی زۆرلێكردن دوور دەگرێ و بە تەنیا پەنا بۆ ویژدانی مرۆڤایەتی دەبا. تاوتوێكردنێكی لەمبابەتە، تاوتوێكردنێكی رووتی بەقسەیە بەو مانایە دەبێ هەموو پێناسەیەكی قانوون رەتبكەینەوە ئەگەر پێچەوانەی ئەو پێناسەیە بێ كە تەنیا قانوونی رەوشت بگرێتەوە وەكو بنەمایەك بۆ بڕیاری ویژدان نەك بڕیاری هێز یان هەر شتێكی تر كە وەكو سەرچاوەیەكی بنەڕەتیی رەوشت پەنای بۆ ببردرێ. تێڕوانینێكی بنەڕەتی دیش هەیە كە پێی وایە ناشێ سیفەتی قانوون بدەینە پاڵ هەر سیستەمێكی یاسایی ئەگەر ئەو سیستەمە لەگەڵ قانوونی ئاكارەكی گونجاو نەبێ یان بەلایەنی كەمەوە نەخریتە ناو چوارچێوەی بنەمای رەوشتەوە، ئەو كەسانەی پیلەكان دەكەن و دەڵێن هێز پێچەوانەی قانوونە، ناچارن هەنگاوێكی تر هەڵبێننەوە و بڕیار بدەن كە قانوونی ئاكارەكی، زەبروزەنگ وەلا دەنێ، لێ راستییەكەی ئامانجی ئەم تەرزە گفتوگۆیە دروستكردنی جۆرێكی تایبەتیی پێوەندییە لەنێوان قانوون و رەوشتدا، بەم شێوەیە دەوری هێز لە سیستەمی قانوونی دەبێتە پرسێكی لاوەكی، لاوەكییە نەك لەبەر ئەوەی دەوری هێز بەشێوەیەكی رێژەیی گرنگ نییە بەڵكە لە رووی تەكنیكییەوە لاوەكییە. بەپلەی یەكەم گرنگ ئەوەیە روونی بكەینەوە كە قانوون پێوەندییەكی دیاریكراوی بە رەوشتەوە هەیە، گەنگینێ توانرا بەسەر ئەو ئاستەنگە زاڵ ببین پرسیارێكی تر لەبارەی ناوەڕۆكی ئاكارەكیی وەكو قانوونێكی كاریگەر دێتە پێشەوە، كە داخوا ئەم ناوەڕۆكە بەكارهێنانی توندو تیژی دەگرێتەوە یان نا. ئەم پرسە دواترلە فەسڵی پێوەندی قانوون بە رەوشتەوە باس دەكەین و روونی دەكەینەوە كە ئاستەنگەلی زۆر لەبەردەم ئەوانەدا قوت دەبینەوە كە دەیانەوێ هاوبەندییەكی پێویست لە نێوان ئەو دووانەدا دروست بكەن، تەنانەت ئەگەر بكرێ هاوبەندییەكی لەمبابەتەش دروست بكرێ، ئەوا سەختی و زەحمەتییەكی زۆرتر دێتە رێگەی هەر هەوڵ و كۆششێك بۆ دیاریكردنی ناوەڕۆكی پێویستی رەوشت دەرهەق بە نا–توندوتیژی و شتی تر.

تەنیا ئاكارویستان نین كە بەرهەڵستی ئال و دیوی زەبروزەنگ دەكەن لە قانووندا. تەوژمێك هەیە كە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە پێداگرتن لەسەر زەبروزەنگ لە جێبەجێكردنی قانووندا، بەدحاڵیبوونە لە دەوری زۆركردن. خەڵك گوێڕایەڵی قانوون دەكەن نەك لەبەر ئەوەی ناچارن بە زەبری هێز بەڵكە بەلایەنی كەمەوە پەسندی دەكەن یان ملی بۆ دادەنەوێنن، ئەم قایلبوونە، نەك هەڕەشە هێز، وا دەكا سیستەمی قانوونی كارا ببێ. ئەم رایە جاران بەند بوو بە ئایدیای كۆمەڵگە و بەو پێیەی قانوون لەسەر بنەمای پەیمانی كۆمەڵایەتی رۆنراوە كە پشت بە پرەنسیپی پەسندكردنی ئازادانەی تاكەكان، ئەوانەی رەزامەندییان لەسەر ئەوە دەربڕیوە كە مل بۆ قانوون و حكوومەت دابنەوێنن. لێ ئەم شێوەیە لەشێوەگەلی پەسندكردن، خەیاڵئامێزە تا رادەیەكی گەورە ئەگەر بەتەواویش نەبێ. را و بۆچوونی مۆدێرن ئێستا باوەڕی بەم رازیبوونە نەماوە، وەلای ناوەو ئایدیای دەنگدانی گشتی و فەرمانڕەوایی زۆرینە لە كۆمەڵگە

دیموکراتییەکاندا جێگەی گرتووەتەوە کە ناوە ناوە تاکە کەس پابەندبوونی خۆی بە سیستەمی فەرمانڕەوایی ئارا دەردەبڕێ. ئەگەر ئێمە ئەو پرسەمان لەملاوە دانا کە داخوا ئەم شێوازە واهیمەیەك ناگرێتە خۆی بەئەندازەی ئەوەی تیوریی گرێبەستی کۆمەلأیەتی ، دەبینین ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە، هەوڵ نادا کە هێز لە سیستەمی قانوونی دوور بخاتەوە بەڵکە دەیەوێ تەکزکردنە سەر ملکەچکردنی بەخورتی بۆ پەسندکردن و ملدانەواندنی ئارەزوومەندانە بگۆڕێ. بەمانایەکی وردتر، ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە ئامانجی ئەوەیە کە نیشانی بدا قانوون پشت بە بەبەکارهێنانی سەرکەوتووانەو ڕێکوپێکی هێز نابەستێ دەرهەق بەو رەعیەتانەی بەرەنگاری قانوون دەبنەوە یان سەرپێچی لە فەرمانەکانی دەکەن، بەڵکە لە دوا شیکردنەوەدا، لەسەر داد دامەزراوە، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە داخوا دەکرێ هێز لەدژی ئەو کەسانە بنەماکانی قانوون پێشێل دەکەن بەکار بهێندرێ، یان نا. ئەم بەم شێوەیە پرسی زۆرلێکردنی قانوونیی بووە بە کارڕاییەکی بەرێککەوت نەك کارێکی جەوهەری و بنەڕەتی لە بوونی قانووندا.

## هێز لە قانوونی نێودەوڵەتیدا :

دنیای هاوچەرخ لە بواری نێودەوڵەتیدا زێتر گرنگییەکی تایبەت بەم تێڕوانینە دەدا تا بواری نەتەوەیی یان نیشتمانیی. ئەو کەسانەی کە نکوڵی لە دەوری زۆرلێکردن لە جغز و بازنەی نەتەوەیی دەکەن، کەمن، لەگەڵ ئەوەیشدا، هی واش هەیە دبێژێ کە پێداگرتنی زیاد لە پێویست لەسەر هێز، داسەپاندنی شێوازی قانوونی سزایەکان بەسەر هەموو قانوونی نیشتمانیدا، دەگرێتەخۆ و بەم شێوەیە سروشتی راستەقینەی قانوون دەشێوێ.

بەم زووانە، لەسەر ئاستی پێوەندیگەلی نێودەوڵەتی، سیستەمێکی قانوونی پەیدا بووە کە ولأتە شارستانییەکان خۆیان لەڕاستیدا، بەپابەندکار دەزانن، نەك بەزۆر بەسەردا سەپێندراو بێت چونکە هێزێکی رێکخراوی جیهانی نییە کە توانای پراکتیزەکردنی دەوری پۆلیس و ئێشکگرو وەردی هەبێ کە لە قانوونی نیشتمانیدا هەن. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەم بڕیار و حوکمگەلانە بە قانوونی نێودەوڵەتیی بەئەژمار دێن، گفتوگۆی گۆڕین تەکز دەکاتە سەر پاساودانی ئەم رەوتارە، هەرچەندە زۆرلێکردنی نێودەوڵەتی هیچ شێوازێکی رێکخراوی نییە. ئەوەی جێگەی گالتەجارییە، هەندێ ناوەند تەنیا هەوڵ و کۆشش بەختکردن تا قانوونی نێودەوڵەتی کاراو پابەندکار بێت، بەوازهێنان لە قانوون بەقازانجی ئەو هێزە لێکدەدەنەوە کە نەتەوە یەکگرتووەکان پراکتیزەی دەکات. ئەم رەخنەیە ئەو دەمە نەتەوە یەکگرتووەکان هێزی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی هەردوو قەیرانی کەناڵی سویس و کۆنگۆی بەلجیکایی بەکارهێنا، سەری هەڵدا.

دەبینین بەرهەڵستکارانی زۆرلێکردن بەڕاست هەوڵدەدەن کارڕایی قانوونی بەپێوانەی دەسەلأت وەسف بکەن، ئەوژی بۆ پشتگوێخستن یان رەتکردنەوەی توخمی هێز. کەچی رووکاری زۆرلێکردن لە قانووندا بەو ئامانجەیە هێز لە پێشی پێشەوە دابنێ و خۆی لە دەسەلأت نەبان بکات. ئەگەر ویستمان وێناکردنێگی هەمەگری قانوون وەدەست بێنین پێویستە ئێمە هەردوو بەڵگە رەچاو بکەین، هەرچەندە ئەمە بەو مانایە نییە کە دەبێ خۆمان بە هەڵویستێکی بێژەکی ببەستینەوە، چونکە هیچ شتێك نییە بگاتە ئاستی قانوون مادامەکێ ئەو شتە ئەم دوو توخمەی تێدا نییە، قانوون مینای رەوشت چەمکێکە تەواو

ئیلاستیستی، هەروەکو دەبینین هەندێ رەوشی پەراوێزخراو هەن کە وا دەخوازێ وپێویست دەکا دەزگای قانوون بەکاربهێندرێ، تەنانەت ئەگەر هەندێ رووکار کە فیبەر لە نموونە ئایدیالییەکەیدا ناوی هێناون وجودیشیان نەبێ یان بەشێوەیەکی کزو پەرپووت بوونیان هەبێ. رەنگە ئێمە هۆیەکی شایەن بایەخ وەبینین تا زۆرلێکردن وەکو رووکارێکی قانوون" نموونەیەکی ئایدیالی" دابنێین، لە کاتێکدا لەبەر هۆی دیکە، هەر ددان بەوە دەنێن کە قانوونی نێودەوڵەتی کە ئەم ناوەی لێنراوە، وێرای کە رێژەیەکی کەم لە زۆرلێکردنی سیستەماتیکی کە تا ئێستا ئەم نیزامە وەدیهێناوە. هەروا لە کۆمەڵگەی کەم پەرەسەندووتردا تێبینی ئەوە دەکرێ کە زۆرلێکردن شێوەی هێزێکی ناوەندیی دەوڵەت وەرناگرێ بەو ئەندازەیەی کە شێوەی پشتبەستنی هەر تاکێك بە خزم و کەس وکاری خۆی بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانی وەریدەگرێ. لە تێڕوانینێکی رووتی ئاکارەکییەوە، وێدەچێ تۆڵەساندنەوە پێچەوانەی قانوون بێت، لێ قانوونزان پێی وایە هۆکاری یەکلاکارەوە هەن کە وای لێ دەکات ئەم شێوازە ئاژاوەچێتییە بەروالەت لەناو چوارچێوەی زاراوەگەلی قانوونی پۆلین بکات، هەرچەند دووریش بێت لە نموونەی ئایدیالیی قانوون کە بابەتی تیوریی زانستی قانوونە.

تیوریسینی قانوونی وەك هەر کەسێکی تر کە بایەخ بە دیراساتی کۆمەڵایەتی دەدەن، بەپەرۆشی لێکدانەوەو راڤەکردنی ستراکتوری گشتی بواری تۆژینەوەیە، لەسۆنگەی ئەمەشەوە ئەو پێویستی بە دەزگایەکی پرەنسیپئاسا هەیە کە هێلکارییەکی دیاریکراوی بۆ ئامادە بکا کە بەهۆیەوە بتوانێت و لەچوارچێوەکەیدا دیاریدە جیا-جیاکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لێکبداتەوە و نرخیان بۆ دابنێت. ئەم جۆرە پۆلینکردنە کە فیبەر ناوی ناوە"نموونەی ئایدیالی" لە بنیادێکی یەکگرتووی شیتەلکاری بترازێ شتێکی تر نییە. ئەم بنیادە ئەقلگرە و لەم روونی و بێگەردییەی ئەم وێناکردنەدا، ناشێ لەهیچ شوینێکی وەدۆزین، چونکە خەیاڵئامێزە، گرنگی ئەوە لەوەدایە کە چەمکێکی سنووردارە و رەوش یان کرداری راستەقینەی پێ بەراورد دەکرێ.

پێویستە وەسا چاو لە زانستی قانوون بکرێ کە پرۆسەیەکی بەردەوامە و ئەو دەمە بەرجەستە دەبێ کە جێگە و رێگەی زۆرلێکردن لە قانوونی نێودەوڵەتی دەزانین. هەروەکو چۆن پلە پلەییەکی بێ سنووری هێز هەیە لە تۆڵەکردنەوەوە بگرە تا دادگاییکردن لەبەر ریزنەگرتن لەو بڕیارەی لە دادگەیەکی هاوچەرخ دەرچووە، هەروا دەبێ لە قانوونی نێودەوڵەتیش زنجیرەیەکی دوورودرێژی کارڕایی جیا-جیا هەبێ کە لە هەر یەکێکیاندا شێوەیەك لە شێوەکانی زۆرلێکردن بەکار بێت. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو زۆرلێکردنەی لەنێوان نەتەوەکاندا بەکار دێت، ناشێ وناکرێ لەگەڵ ئەو تەرزەی لە قانوونی دەوڵەتێکدا هەیە جووت بێ کە زۆرلێکردن بەسەر تاکەکاندا پەیڕەو دەکات. سروشتی ئاریشەکە جیایە، چونکە لێرەدا نەتەوەیەك بە بتوونی ملی پێکەچ بکرێ، چونکە بەکارهێنانی رەهای هێز لەوانەیە ببێ بە لەناوبردنی ژیان و ماڵ و ملْك بەشێوەیەکی فراوان. راستە تەنانەت لەسەر ئاستی نەتەوەییش، قانوون دەخوازێ لە هەلومەرجی ئێستاشدا پراکتیزەی زۆرلێکردنی یاسایی بەسەر کۆمەڵ و گرووپەکاندا سەرباری تاکەکان بکا کاتێ کەکارڕایی سزاکاریی دەرهەق بە دامەزراوەی گەورە-گەورە پێڕەو دەکا کە قەوارەی دۆمێنەکانی بەقەد هەندێ دەوڵەتی

سەربەخۆیە. لێ راستییەکەی ئەوەیە کە قانوونی نەتەوەیی بڕیارو ئەحکامەکانی بە زەبری هێز بەسەر تاکەکاندا– وەکو بەرێوەبەرانی دامەزراوەکان یان کارمەندەکانیان– پێڕەو دەکا و ماڵ و موڵکی دامەزراوەکە گل دەداتەوە یان دەستی بەسەردا دەگرێ هەروەکو چۆن مڵك و ماڵی تاکەکان زەوت دەکا. ئەم رەوتارە چونیەکە وێرای جیاوازی لە خاسیەت و مەوداوە، دەکرێ بەرە–بەرە لە بواری نێودەوڵەتیشدا بێتەدی، ئەگەر چی ئەم پەرەسەندنە درێژخایەن و دژوار و لەیەك سەمت زێتری دەبێ. ئەوە دەبێتە ئەرکی زانستیی قانوون کە ئەم فۆرمۆلانە دابرێژێ و وا چاکتریشە لەرێگەی جەختکردنەوە لەسەر پێناسەی قانوون ئەمە ئەنجام نەدا، کە پێویستی بە زۆرلێکردن دەکاتە مەرج یان نا، بەڵکە لەرێگەی جەختکردن و دووبارەجەختکردنەوە لەسەر دەوری شێوەکانی زۆرلێکردن و دەوری کارڕایی زەبروزەنگئاسا لە پێوەندیگەلی قانوونیدا. لێوەکۆڵینێکی لەم جۆرە، کە بەرپاکردنی پێوەندیگەلی مرۆیی رەچاو کردبێ، لەوانەیە جەختکردنەوەی بەردەوام لەسەر نموونەگەل و چەمکگەلێك کە شیکردنەوەی قانوونیی زۆرلێکردن و پۆلینکردنی لەبەر رۆشنایی، لێبکەوێتەوە. بە دەستەواژەیەکی تر،ـ تیوری قانوونی مۆدێرن، چارەسەری دینامیکی بە بزافتی دەوێ نەك چارەسەری ستاتیکی.

## داخوا دەکرێ دەستبەرداری هێز ببین؟

ئەم پرسیارە هەروەکو خۆی دێتەگۆڕێ: لەم سەردەمەی ئێستاماندا چ پاساوێك هەیە کە پشتی پێ بدەین بۆ پێداگرتن لەسەر دانانی توخمی زۆرلێکردن لە سیستەمی قانوونی خۆماندا؟ دیتمان کە ئەم توخمە لە کایەی نێودەوڵەتیدا تۆزە دەورێك دەگێڕێ، تەنانەت لە قانوونی نیشتمانیشدا، خەڵك بۆیە مل بۆ قانوون دادەنەوێنن چونکە قانوون، قانوونە، نەك لەبەر ئەوەی ئەگەر لە قانوون هەڵگەڕانەوە خۆیان تووشی سزادان دەکەن. ئیدی ژ بەرچ ئەو هەموو پێداگرتنە لەسەر هێز کە بۆ زۆر کەس وەکو رواڵەتی زولم و زۆر دێتەبەرچاو تا رواڵەتی قانوون، کە دەکرێ بە هەڵتەکاندنی دەسەلاتی ئاکارەکیی قانوون خۆی دابندرێ؟ گرنگ ئەوە لە بیرو زەینی خۆماندا بەوە بزانین کە دەشێ لەو کاتەی تەرزو جۆری نموونەیی قانوونیی ئێمە هاوشێوە یان تەواو لە لەگەڵ قانوونی بەرکاری کۆمەڵگەیەکدا نەگونجێ، دەبێ لەو توخمانە پێکبێت کە لەگەل تاقیکردنەوەی ئینسانیدا لەبارو رێکبێت دەنا ئەم تەرزو شێوەیە هیچ کەڵکێك و لەجێگەی خۆیدا نابێت، کەواتە تاقیکردنەوە چی نیشانداوە؟ نیشانیداوە کە قانوونی کۆمەڵگەی مرۆیی لە هەموو ئاستەکانی خۆیدا، بۆ کارایی خۆی پشتی بە مەوداو ئاقاری ئەو هێزە تەکوزەی بۆی دەگەڕێتەوە، دەبەستێ. رەنگە کۆمەڵگەی بەرایی ئەمە رەت بکاتەوە، کەچی زانستی نوێی ئیتنۆسەکان – هەروەکو دەبینین لە لێتۆژینەوەکەماندا بۆ قانوون کە سەرچاوەکەی عورف و بەندو باوە– ئەم رایە رەت دەکاتەوەو بەئاشکرا دەوری سزا لە چەندین کۆمەڵگەی بەرایی چ لە پێشان و چ لە ئێستا، نیشان دەدا، ئێمە کاتێ ئەو بێ سەروبەریە رێژەییەی لە کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگایەتیدا هەیە وپشت بە خزمایەتی نێوان ئەو گروپ و دەستانەی لەدەوری ئاغا دەرەبەگەکانەوە کۆبوونەتەوە ، لەگەڵ ئەو بێ سەروبەرییەی لە دەزگای دەوڵەتێکی هاوچەرخی ناوەندیدا دەیبینین، بۆمان دەردەکەوێ کە دەسەلاتی قانوون

به بوونی دەزگایەتی ئۆرگانیزەکراوی لەدەمدەرەوە چی وەدەستهێناوە.

لێ روونکردنەوەی دەوری زۆرلێکردن لە قانوونی مرۆییدا، لەوانەیە لە ئاستێکی قوڵتردا بێت. شیتەڵکاریی دەروونی فێری کردووین کە رۆڵی هۆکارە پەنامەکییە نائاگایەکان لە پێکهاتنی سایکۆلۆجیای مرۆڤدا و لە نێو ئەم هۆکارانەی کە دەبێ بەهەند هەڵبگیرێ نەك تەنیا ئەو هۆکارانەی کە هاوکاری کۆمەڵایەتی دەخوازن و خۆیان لەو وتەیەی ئەرەستۆ دەبیننەوە کە دبێژە "مرۆڤ، ئاژەڵێکی سیاسییە"، بەڵکە پاڵنەرە شەڕانییە خورت و بەهێزەکانیش کە دەبێ بە توندی جڵەوییان بگیرێ تا مرۆڤ بەرفەرمانی پێداویستییەکانی سیستەمی جڤاکی ببێت. ئا لێرەوە پێویستیی زۆرلێکردن سەرهەڵدەدا، هەروەکو فرۆید بەراشکاوی ددانی پێداناوە. فرۆید باوەڕی وابووە کە دەشێ ستۆپ بەم پاڵنەرە شەرانگێزییانە بگیرێ و مشتومالْ بکرێن نەك لەناو ببردرێن. تا شارستانێتی ململانەی تێدا بەردەوام ببێت لەنێوان پاڵنەری کۆمەڵایەتی و پاڵنەری شەڕانی. فرۆید لەبارەی شیانی دوورخستنەوەی ئەم پاڵنەرەی دواییانەوە بە تەواوی، دبێژە: "ئەم سەردەمە، دەبێ بە سەردەمی زێڕین، لێ گومان لەوە داهەیە بەشێوەیەکی رەها بگەینە ئەم رەوشە، بەلایەنی زۆرەوە وا دێتەبەرچاو، کە دەبێ هەموو کولتوورێك پشت بە زۆرلێکردن ببەستێ و غەریزەکان توڕبداو نکوڵیان لێبکات". پاشان دەنووسێ و دەڵێ "خەڵك، ئافەریدەی خشکۆك و بەسۆز نیین، کاتێ پەلاماریان دەدرێ داکۆکی لە خۆیان دەکەن.. دەبێ ئەم حەزوو ئارەزووە هێژایە بۆ دەستدرێژیکردن، حیسابی بۆ بکرێ بەو پێیەی بەشێکە لە غەریزە خۆڕسکەکانی خۆیان. هەروا شێوازی پاڵنەرە نا کۆمەڵایەتییەکان، نائومێدی و بێ ورەیی دەنێتەوە، هۆکارێکی بنەرەتیی گرنگە لەو نەخۆشییە باوانەی کە ئەمرۆ شارستانێتییە پەرەسەندووەکان بەدەستیانەوە دادەدادیانە. کۆمێنتارێکی مۆدێرن دەوری بنەما ئاکارەکییەکانی لە کۆمەڵگەی مرۆیی بەپێی چەمکی فرۆید بەم شێوەیە پوختە کردووەتەوە "دەسبەرداریی ئەم بنەما ئاکارەکییانە کارێکی کەس نەکردەیە، کە بێ وان شارستانێتی بەرپا نەدەبوو لێ لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی خەفەتبارانە کۆسپ بوون بۆ قوڵترین پاڵنەرەکانی مرۆڤ. لەبەر ئەم هۆیە فرۆید بەتوندی پێی لەسەر باندێگی نێوان کۆمەڵگەی شارستانی و سیستەمی کۆمەڵایەتیی زۆرلێکردن داگرتووە" و دەشێ ئەوەشی بۆ زیاد بکەین کە مێژووی نوێ بوونی ئەم پاڵنەرە شەڕانییانەو هێزو بڕستیان و ئەو نائومێدییە بنەڕەتیانەی کە نیگەرانی بۆ شارستانێتیی ئێمە دروست دەکەن کە فرۆید دەستی لەسەر داناوەو ناکرێ بەهیچ پێوەرێکی کامڵی زانستانە هەڵبسەنگێندرێ.

بەهەق هەمیشە ئەو ئومێد و هیوایە هەبووە کە سروشتی مرۆڤ دەگۆڕێ و رژێمێکی تازەی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ دێ کە لەبارترو پێڕەوکراوتر بێت، سەرهەڵدەدا. تەنانەت ئەگەر "دی میستەر *de Maistre*" یش لەسەر هەق و راست بێت کە کۆمەڵگەی شارستانی لەسەر میر غەزەب و جەللاد دامەزراوە، ئەوا دەشێ بەردەوام بێژین کە هیچ پێویستییەك نییە کە بەم شێوەیە بێت و بەبەردەوامیش بەم شێوەیە نابێت. لێ واقیعی ئێستا، هەروەکو مێژووی دیرۆکی مرۆڤایەتی دەخوێنینەوە، ئەوەیە کە قانوون وەکو هۆکارێکی کارای زەبتی کۆمەڵایەتیی، ئەگەر لە گرنگی توخمی زۆرلێکردن کەم بکاتەوە یان خۆی لێ نەبان بکا، ئەوا

قانوونێکی بێ کەڵکە و تا بە ڕۆژی ئەمڕۆشمان دەگات بەدەردی کۆمەڵگە ناخوات. ئەگەر ئێمە بڕوامان بە هەڵاتنی سپێدەی ڕژێمێکی نوێی جڤاکی هەیە و پێویستیی بە داپڵۆسین نەهێڵێ، ئەوا وا دەخوازێ چاو بە سیستەمی قانوونی خۆمان بەشێوەیەکی رادیکال دابخشێنینەوە. لێ واقیعی ئێستا ئەو گومانە بەهێزەی لە دەروونمان چەکەرەی کردووە نارەوێنێتەوە.

## ڕێساکانی هێز:

بەشێکی گرنگی تەرزە سیستەمی قانوونیی ئێمە، ئەو ڕێساو بنەمایانە دەگرێتە خۆی کە زەبرو زەنگ بەکارهێنان ڕێکدەخەن وەکو دەستئاوێژێك بۆ جێبەجێکردنی بەشەکانی دیکەی سیستەم کە ئەو بنەمایانەن ڕەوتاری سوژێتەکانی ئەم سیستەمە ڕێکدەخەن. دەشێ بێژین ئەم بەشەیان ئەو بڕیارو حوکمانە دەگرێتەوە کە پێوەندییان بەهێزەوە هەیە، ئەو ژی لە سیستەمێکی "پریمیتڤ" کە دەشێ هەندە حوکمێکی تێدابێت بۆ سەروبەرکردنی ئەو هەراو دژمنداریيانەی لە ئاکامی تۆڵەو تۆڵەساندنەوە دەکەونەوە جیایە لە سیستەمێکی نێودەوڵەتی کە تەنیا چەند دەقێکی پرەنسیپئاسای کەمی تێدایە کە دەسەڵات بە دەزگایەکی وەکو نەتەوە یەکگرتووەکان دەدەن هێزێکی نێودەوڵەتی بۆ مەبەستێکی تایبەت پێکەوە بنێت، بۆ هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو ڕەوشە کە لەوانەیە هەڕەشە لە ئاشتی بکات وەکو ئەو هەراو و بشێوییەی لە کۆنگۆ ڕوویاندا. هەروا سیستەمی دەوڵەتێکی زۆر پەرەسەندوو کە دامودەزگای قایم و پتەوی وەك دادگە و پۆلیس و کارمەندو.. هەیە.

ئەمە بووە بە خەسڵەتێ لە خەسڵەتەکانی قانوونی دەوڵەتێکی پەرەسەندوو کە تا چەند هێز بەکارهێنان ڕێکوپێکترو کاراتر ببێ دژی بەرهەڵستکاران ئەوا هێزبەکارهێنان تادێ بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە. ئا بەم شێوەیە دەبینین دەوڵەتی بیروکراتی لەمبارەوە بەو سیستەمە دەچێ کە لەرووی تیورییەوە تەواو جیاوازە. واتە سیستەمی فەرمانڕەوایی کەسایەتیی کاریزمایی کە تیایدا دەبینین توخمی دەسەلأت بەسەر پێویستیی بە هێزدا زاڵە. ئەمەش لە کاتێکی گونجاودا ئەم تێڕوانینەی لێ پەیدا دەبێ کە پێشتر لێمان کۆڵییەوە ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز هێز یان بەلایەنی کەمەوە یەکێکە لە بیچمە بنەڕەتییەکانی قانوون. یاسازانێکی هاوچەرخ ئەمەی بە "واهیمەیەکی کوشندە" وەسف کردووە لە وتارێکدا کە هەندێکی لێ دەخەینە بەرچاو:

"لەگەڵ ئەوەی کە زەبروزەنگی راستەقینە زۆر لەبەرچاوان دوور کەوتووەتەوە، هەرچەند لەبەرچاوان ون ببێ ئەوا هەندەش کاری دەزگای قانوون ئاسانترو کەم هەراسانتر دەبێ.لەمبارەوە سەرکەوتنی چەندین دەوڵەتی نوێ بە پلەیەك کە لە پەرجوو دەچێ، بەلەبەرچاوگرتنی سروشتی مرۆڤ. لەسایەی هەلومەرجی گونجاودا، زەبروزەنگ بەکارهێنانزۆر کەم بووەتەوە بەبێ ئەوەی کەس تێبینیی بکات".

ئەم بارە دەستەبەرە کە ئەو باوەڕە دروست ببێ کە زەبروزەنگ بە قانوون نامۆیە یان گرنگییەکی لاوەکی هەس و ئەمەش واهیمەیەکی کوشندەیە. چونکە یەکێ لە مەرجە بنەڕەتییەکانی کەمکردنەوەی زەبروزەنگ بەکارهێنان تا ئەو پلەیە برێتییە لە بوونی هێزێکی ئۆرگانیزەکراو کە شنگ و توانایەکی هەمەگیری هەبێ بەبەراورد لە گەڵ هێزی هەر ناحەزو نەیارێك. ئەمە بەگشتی، ئامانجی هەر دەوڵەتێکی ڕێکوپێکە بەپێی بنەماگەلی مۆدێرن.

لەسۆنگەی ئەمەوە بەرەنگاریی کارێکی بێ فەرە. ئەوانەی خۆیان بەپێڕەوکردنی هێز لە مەسەلەگەلی سزاکاری و مەدەنی بەنسبەت کەمن لێ بەورد ئۆرگانیزەکراون و لە هەر کێشەیەك پێوەندیی بە تاکە کەسێکەوە یان چەند کەسێکی کەمەوە هەیە.

بەر لەوەی لەم فەسڵە ببینەوە وا دەخوازێ دوو خاڵ قسەی لێ بکەین. یەکەمیان ئەوەیە کە لە سیستەمێکی قانوونیی پەرەسەندوودا دەشێت ئەو بنەمایانەی پێوەندییان بە هێزبەکارهێنانەوە هەیە سەرلەبەری دەزگای کارڕایی بگرێتەوە. چونکە ئەو بنەمایانەی هێز بەکارهێنان ڕێکدەخەن وەکو زیندان یان بەجێگەیاندنی سزای لەسێدارەدان دوا قۆناخی دادخوازییە کە زۆر زەحمەتە لە زۆر باردا بیگەیەنێ ولە پرس وکێشە مەدەنییەکاندا بەگشتی. ئەم قۆناخە کاتێکی درێژی گەرەکە لەبەر ئەو کارڕاییە ئۆرگانیزەکراوانەی کە دەبێ رەچاو بکرێن و ناکرێ هیچ حوکم و بڕیارێك دەربکرێ تەنیا دوای ئەوەی هیچ ڕێگەیەکی دی نامێنێ. بەپشتبەستن بەم کارڕاییانە دەشێ فەرمان دەربکرێ کە بەپێی ئەوە هێزەکانی دەوڵەت بۆ سەپاندنی هێز بەسەر هەندێ کەسدا بەکار دەهێندرێ، ئەم کارڕاییانەش بەتەنێ کارڕایی دادوەری نین، چونکە بەکارهێنانی زەبروزەنگ لەوانەیە ئاکامی کارڕاییەکی ئیداری یان تەنفیزی بێت. نموونەی ئەمە، وەزیری ناوەخۆی بەریتانیا فەرمانی دا کابرایەکی مشەخت بگیرێ و دەربکرێ چونکە بەشێوەیەکی نا شەرعی هاتبووە ناو بەریتانیا. دەکرێ وا سەیری بڕیارو حوکمەکانی هێز بکرێ بەو پێیەی فەسڵێکە لە فەسڵەکانی کتێبێکی گەورەتر سەبارەت بەو بڕیارو حوکمانەی پێوەندییان بە دەزگای کارڕاپەراندنەوە هەیە کە ماف و ئەرکە هەوەڵینەکان تەرجەمەی کارو ئیشی کارا دەکات. ئەمەش بەو مانایە نییە کە سیستەمگەلی قانوونیی نییە تەنیا بە پێی ئەو حوکمانەی کەلەسەر ئەم ئەساسە پۆلێن کراون، بەڵکە ئەمە پێویستە و گرنگە تا راو بۆچوونێکی کارا سەبارەت بە "نموونەی ئایدیالی"ی ئەو قانوونە گەڵاڵە بکەین کە لە گەڵ سیستەمگەلی هەنووکە بە پلەیەکی گەورەتر یان نزمتر جووت بکەین.

خاڵی دووەم گرنگیی توخمی زۆرلێکردنە لە قانوون کە خراپ لێی حاڵی بوون یان زیاد لەپێویست لێکانەوەی فراوانی بۆ کراوە بەپلەیەك کە هەر قانوونێك پێڕەوکردنی هێز "یان سزا هەروەکو پارێزەران پێیان خۆشە وا بێژن"ی تێدا نەبێت ناشێ بە قانوون بژمێردرێ. ئەم رایە لەگەڵ ئەو تێورییە ڕێکە کە پێی دەگوترێ تیوریی فەرماندەری قانوون کە یاساناس "جون ئوستن" پڕۆپاگندەی بۆ دەکردو کاریگەرییەکی زۆری لەو وڵاتانە دانا کە کار بە قانوونی عورفی دەکرێ بەتایبەتی بەریتانیا.

ئێمە لەو فەسڵەی کە بۆ ئەم تیورییە تەرخانکراوە چارەسەری ئەم تیورییە دەکەین، لێ لێرەدا ئەوە بەسە کە تێبینی ئەوە بکەین کە سەرەڕای ئەوەی کە زۆرلێکردن دەشێ ببێ بە بەشێکی جیانەبووەوەی سیستەمێکی قانوونی کارا، هیچ پاساو هۆیەك لەئارادانییە کە پێ لەسەر ئەوە دابگیرێ کە بەناچاری هەر بڕیارێکی تاکە کەسی لە سیستەمی قانوونیدا، دەبێ ئاکامگەلی سزایی بەدواوە بێت و پێچەوانەش راستە. کە دەبینین سیستەمی مۆدێرن زێتر گەرەکیەتی ئەرکە گرنگەکان دیاری بکا ئەوانەی کە پێویستیان بە دەقگەلێکی سزاکاریی پاشکۆوە نییە. جێگەی نامۆییە کە ناچار بکرێین کە ئەم ئەرك و پابەندبوونانە بە نا قانوونی دابنێین.

## سەرچاوە

ماهي فكرة القانون- سلسلة عالم المعرفة (27)،
ترجمة سليم العويص.

# نهێلیزم

برادلی دۆوین

لە ئینگلیزییەوە: ئومێد فایەق قەرەداخی

نهیلیزم (هیچ گەرایی) ئەو باوەڕەیە کە تێکڕای بەهاکان بێ بنەمان و پێیوایە کە لە تواناد‌ا نییە هیچ شتێك بزانرێت یان پەیوەست بکرێت. ئەم بڕوایە بە زۆری لەگەڵ ئەوپەڕی ڕەشبینی و گومان گەراییەکی ڕیشەیدا پەیوەندە، کە بوون مەحکوم دەکات.

هیچ گەرایەکی ڕاستەقینە باوەڕ بە هیچ شتێك ناکات، هیچ شتێك ناکات، هیچ لایەنگرییەکیش ناکات، وە ڕەنگە جگە لە ویستێك بۆ داڕمان هیچ مەبەستێکی نەبێت.

لە کاتێکدا ژمارەیەکی کەم لە فەیلەسوفان بانگەشەی هیچ گەرابوونیان دەکەن، بەڵام نهێلیزم زیاتر پەیوەندی بە فریدریك نیچەوە هەیە کە باسی لەوە کردووە کاریگەریە داڕوخینەرەکانی ئەو بڕوایە لە ئاکامدا تێکرای باوەرە ئەخلاقی و ئاینی و میتافیزیکیەکان تێك دەشکێنێت و ڕێگا بۆ گەورەترین قەیران لە مێژوی مرۆڤایەتیدا خۆش دەکات.

لە سەدەی بیستەمدا باسە هیچ گەراییەکان "شکستی ئەپستمۆلۆژیا، تێکشکانی بەها و بێ مەبەستگەری گەردونی" هونەرمەندانی لێهاتوو، ڕەخنەگرانی کۆمەڵایەتی و فەیلەسوفانێکی هەبوو. لە ناوەراستی سەدەکەدا، بۆ نمونە، بوونگەراکان لە هەوڵەکانیاندا بۆ لاوازکردنی توانا تێکشکێنەرەکەی نهێلیزم هاریکاری ئاسانکردنی بنەماکانی ئەو بڕوایەیان کرد. لە کۆتایی سەدەکەشدا بێ ئومێدبوونی بوونگەرایی لە بەرامبەر نهیلیزمدا ڕێگای بۆ هەڵوێستێکی کەمتەرخەمانە چۆڵکرد کە زیاتر پەیوەست بوو بە دژە بنەڕەتگەراییەوە.

## بنەچەی نهێلیزم:

نهێلیزم لە وشەی (*nihil*)ی لاتینی یان (هیچ)ەوە هاتووە کە مەبەست لێی ئەوەیە هیچ شتێك لە ڕاستیدا نابێت ئەم وشەیە لە فرمانی (هیچی دەکاتەوە – *annihilate*)دا دەردەکەوێت واتە بوونە هۆی هیچ کردنەوە و تێکشکاندنی تەواوەتی.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا فریدریك جاکۆبی بۆ جوداکردنەوەی ئایدیالیزمی بڵندگەرایی بە چەشنێکی نەرێیانە، ئەم وشەیەی بەکارهێنا.

هەرچۆنێك بوو پاش دەركەوتنی وشەكە لە ڕۆمانەكەی ئیڤان تۆرجێنیڤدا بە ناوی (باوكان و كوڕان، 1862) بووە زاراوەیەكی باو. لەو ڕۆمانەدا نوسەر وشەی نهێلیزمی بۆ وەسفكردنی ئەو ڕەوتە زانستكاریە زیادەڕۆییە وشكە بەكارهێنابوو، كە لەلایەن كارەكتەرەكە (بازاڕۆڤ)ەوە نیشاندراوە كە ڕێنوما دەكات بۆ ڕێبازێكی سەراپا ماندەلكردن.

لە ڕوسیا، نهێلیزم لەگەڵ بزوتنەوەیەكی توندڕەوی بڵاودا (1860–1917)دا ناسرا، كە دەسەڵاتی دەوڵەت، كەنیسە و خێزانی ڕەددەكردەوە. پێشەوای بزوتنەوەكە "میكایل باكۆنین" لە نوسینێكی سەراتایدا نوسیویەتی هێشتا نهێلیزم پاڵپشتی خواستە زراوەكەیان دەكات، "با متمانەی خۆمان بدەینە گیانی هەمیشەیی كە تەنها تێكدەشكێنێت و لەناودەبات چونكە سەرچاوەیەكی خوڵقێنەری پەی پێنەبراوو هەمیشەیی هەموو ژیانە.. عەوداڵبوون بۆ تێكشكان دیسان سەودا سەرییەكی خولقێنەرانەیە!" (كاردانەوە لە ئەلمانیادا، 1842). ئەو بزوتنەوەیە بانگەشەی بۆ ڕێكخستنێكی كۆمەڵایەتی دەكرد، كە پشت بە ئەقڵانیەت و ماتریالیزم ببەستێت وەك تەنها سەرچاوەی مەعریفە و ئازادی تاكەكەس، وەك باڵاترین ئامانج. بەرەدكردنەوەی بەهای ڕۆحی مرۆڤ، نهێلیستەكان هەر بەشێوەی تاكەكەسێكی ماتریالیست دەسەڵاتی خودا و دینیان وەك نەیاری ئازادی سنوردارکرد. بزوتنەوەكە لە ئاكامدا شێواو بووە سەدایەكی كاولكردن و تێكشكاندن و ئاژاوەگێری، تا لە كۆتایی هەزار و هەشت سەد و حەفتاكاندا، نهێلیست هەر كەسێك بوو كە پەیوەندی هەبووبێت لەگەڵ گروپێكی نهێنی سیاسیدا كە بانگەشەی تۆقاند و كوشتنی بكردایە.

سەرەتاترین بۆچوونە فەلسەفیەكان كە پەیوەندییان بەوەوە هەبووبێت كە توانرا بێت پێشینەیەكی هیچ گەرانە جودابكرێنەوە، بۆچوونەكانی گومان گەراكان بوون. گومان گەراكان توانیان ڕاستییە نەریتییەكان وەك بۆچوونی پاساونەدراو سنوردار بكەن، بەوەی كە نكوڵییان لە شیاوی دڵنیابوون دەكرد. بۆ نموونە كاتێك دەیمۆسین (*C.371-322BC*) تێبینی ئەوە دەكات، كە "ئەوەی ئەم خۆزگە دەخوازێت باوەڕی پێ بكات، هەر ئەوەیە كە هەر كەسێك باوەڕی پێیەتی" (*olynthial*). دیمۆسین پشتگیری سروشتی هاوپەیوەندی مەعریفە دەكات.

گومان گەرایی قوڵ دواتر دەبەسرێتەوە بە هیچ گەرایی ئەپستمۆلۆژیەوە كە نكوڵی لە شیاوی زانین و ڕاستی دەكات، ئەم شێوەیەی نهێلیزم ئێستا بە دژە بنەرەتگەرایی پۆست مۆدێرنە هاوبەشی دەكرێت. لە ڕاستیدا دەتوانرێت بە چەند ڕێگای جیاواز نهێلیزم لێكبدرێتەوە:

–نهێلیزمی سیاسی:

وەك تێبینی كراوە، پەیوەندە بەو بڕوایە وە كە تێكشكاندنی هەموو ڕێكخستنە سیاسی، كۆمەڵایەتی و ئاینییە بەردەوامەكان بۆ هەر بەرەوپێشچوونێكی داهاتوو كارێكی پێویستە.

–نهێلیزمی ئاكاری یان نهێلیزمی ڕەوشتی، شیاوی بوونی بەهای ڕەوشتی یان ئاكاری ڕەها ڕەددەكاتەوە، لەبری ئەوە پێیوایە باشە و خراپە لێڵن. وە ئەو پێوەرانەی ئەوە دیاریدەكەن جگە لە فشاری كۆمەڵایەتی و عاتفی بەرهەمی هیچیدی نین.

–نهێلیزمی بوونگەرایی، ئەو بیرۆكەیە كە ژیان هیچ مانایەك یان نرخێكی ڕاستەقینەی نییە، وەبێ گومان ئەمرۆ ئەمە بڵاوترین بۆچوونی بەكارهێنراو و لێكدراوەیە بۆ وشەكە.

ماکس ستێرنەر (1806–1856) ڕەخنەکانی لە فەلسەفەی سیستەماتیکی و نکوڵی کردنی لە شتە ڕەهاکان و ڕەدکردنەوەی بۆ بیرۆکە ئەبستراکیەکانی هەر جۆرێك، زیاتر دەیخەنە نێو یەکەم هیچ گەرا فەلسەفیەکانەوە. لای ستێرنەر دەستەبەرکردنی ئازادی تاکەکەسی تاکە یاسایە، وە ئەو دەستەڵاتەی بە پێویستی دەست بەسەر ئازادیدا دەگرێت پێویستە تێکبشکێنرێت. تەنانەت لە پشت ستەمی دەوڵەتەوە ئەو جەورانە هەن کە لەلایەن کەسانی دیەوە دەسەپێنرێن لەبەرئەوەی سەراپای بوونیان بەربەستێکە و ئازادی تاکەکەس دەخاتە مەترسییەوە، بەم شێوە ستێرنەر داکۆکی لەوە دەکات کە بوون "شەرێکی بێ کۆتای هەر یەکێکە لە دژی هەموو" "من و تایبەتی من – 1907"

## فریدریك نیچە و نهێلیزم:

لە نێوان فەیلەسووفەکاندا فریدریك نیچە زۆرترین پەیوەندی بە نهێلیزمەوە هەیە. لای ئەو لە دنیادا هیچ یاسایەك یان بنەمایەکی بابەتی نییە جگە لەوەی کە خۆمان پێی دەدەین. بە تێپەڕاندنی ئەو ڕووانەی کە قەناعەتەکانیان لەسەر وەستاوە، نهێلیزم دەگاتە ئەوەی کە هەموو بەهاکان بێ بنەمان و ئەقڵیش کەموکوڕ و پەککەوتەیە. نیچە دەنوسێت "هەموو باوەڕێك، هەموو لەبەرچاوگرتنێکی وەك دەڵێن ڕاست، پێویستە هەڵەبێت لەبەر ئەوەی بەسادەیی هیچ جیهانێکی ڕاست نییە". "ویستی دەسەڵات 1883–1888" لای نیچە نهێلیزم پێویستی بە دەستبەرداربوونێکی ڕیشەیی هەیە لە سەراپای بەهاو واتا سەپێنراوەکان: نهێلیزم تەنها ئەو بۆچوونە نییە کە هەموو شتێك شایەنی ئەوەیە لەناو بچێت، بەڵکو کەسێك بەڕاستی شانی دەداتە ژێر نیلەکە، و تێکدەشکێنێت. "ویستی هێز"

نیچە باس لەوە دەکات کە هێزی سوتێنەری نهێلیزم ڕەهایە وە لە ژێر پشکنینە ڕقاویەکەیدا "باڵاترین بەهاکان خۆیان بێ نرخ دەکەنەوە. ئامانج نامێنێت و (بۆ) چیتر هیچ وەڵامێك نابینیتەوە" "ویستی دەسەڵات" بە ڕوونی هەموو باوەڕە بایەخ پێدراوەکان و ڕاستیە لەکەدار نەکراوەکان وەك نیشانەکانی ئەفسانەیەکی خۆرئاوایی کەموکوڕ دەخاتە ڕوو.

ئەم شکستەی مانا و پەیوەندی و مەبەست دەبێتە رمێنەرترین هێز لە مێژودا، و هێرشێکی سەراپایی توند بۆسەر ڕاستی پێکدەهێنێت کە هیچ کەمتر نەبێت لە گەورەترین قەیرانی مرۆڤایەتی:

ئەوەی دەیگێڕمەوە دیرۆکی دوو سەدەی داهاتووە، وەسفی ئەوە دەکەم کە دەیەت و ئەوەی کە چیتر ناتوانێت بەشێوەیەکی جیاواز بێت: "دەرکەوتنەوەی نهێلیزم".. ئێستا ماوەیەکە تێکرای کلتوری ئەوروپیمان بە کشانێکی پێچ خواردوودا کە لە دەیەیەکەوە بۆ دەیەیەکی دی گەشە دەکات، بەرەو کارەساتێك دەجوڵێنرێت: بەبێ ئارام و بە توندی، وەك ڕووبارێك کە دەیەوێت بگاتە کۆتاییەکەی، مل دەنێت" (ویستی هێز).

لە سەردەمی ڕەخنە قایلکەرەکانی نیچەوە، باسە هیچ گەراییەکان – شکستی ئەپستمۆلۆژیا، تێکشکانی بەها، و بێ مەبەستگەری گەردونی – هونەرمەندانی سەرقاڵ، ڕەخنەگری کۆمەڵایەتی و فەیلەسوفانێکی هەیە، کە ڕازی بوون بەوەی کە شیکردنەوەکەی نیچە ورد و تەواوە، بۆ نمونە، ئۆزواڵد سپینگلەر لە "دارمانی خۆرئاوادا (1926)" لێکۆڵینەوەی لە مەڕ چەند کلتورێك ئەنجامدا بۆ پشت ڕاستکردنی ئەوە کە ئەو شێوانەی نهێلیزم لە

راستیدا سیفەتێکی ئاشکرای شارستانیەتە دارِماوەکان بوون. لە هەر یەکێك لەو کلتورە شکستخواردوانەدا، کەلێیان دەکۆڵییەوە، سپینگەر تێبینی ئەوەی کرد کە نەریتە دینیە دێرین و هونەری و سیاسییەکانی سەدەکان لاوازبوون و لە کۆتاییدا بەهۆی کارە پیسەکانی هەندێ هێزی هیچ گەرای دیاریکراوە وە دارمێنراون: هیچگەرای فاوستی (***Faustain***) "ئایدیالەکان لەناو دەبات"، هیچ گەرای ئەپۆلینی "لێیان دەرِوانێت کە لەبەرچاوەکانیدا تێك دەشکێن" هەروەها هیچ گەرای هندی "لە ئامادەبوونی ئەواندا بۆ ناو خودی خۆی پاشەکشە دەکات"، پاشەکشەکردن بە زۆری بەو نەرێکردنەی حەقیقەت و چۆك دادانە هاوبەشی دەکرێت کە ئاینە رِۆژهەلاتیەکان پشتگیری دەکەن. ئەو پاشەکشەکردنە لە خۆرئاوا پەیوەندی بە رِووە جیاوازەکانی نغرۆبوون لە چێژە هەستیەکان و تاکگەرایی زانستخوازییەوە هەیە. لە لێکۆڵینەوەکەیدا سپینگلەر دەگاتە ئەو ئاکامەی کە شارستانیەتی خۆرئاوایی ئێستا لە قۆناغە پێشکەوتووەکانی دارِماندایە، بەهۆی هەر سێ شێوەکەی نهێلیزمەوە کە پێکەوە بۆ شلۆقکردنی دەسەلاتی ئەپستمۆلۆژیا و مەعریفەی بەهاگەری کاردەکەن. هەروەها لە سالی 1927دا مارتن هایدگەر تێبینی ئەوەی کرد کە نهێلیزم بەشێوەی جیاواز و شاراوە لەوەوپێش "دۆخە ئاساییەکەی مرۆڤ بوو" (پرسیاری بوون).

پێشبینییەکانی فەیلەسوفانی دی لە مەرِ کاریگەری نهێلیزم دژوار بووە. هێلمێت تیەلیکە، بۆ وێنە، لە دەرخستنی نیشانەکانی نهێلیزمی سەدەی بیستەمدا نوسیویەتی، کە "نهێلیزم وەکو خۆی تەنها یەك راستی هەیە کە بانگەشەی بۆ بکات ئەویش ئەوەیە کە لە کۆتایدا هیچێتی سەردەکەوێت

وە ژیانیش بێ مانایە" (نهێلیزم: بنەچە و سروشتەکەی، لەگەل وەلامێکی مەسیحی 1969).

لە رِوانگەی هیچ گەراوە، کەسێك دەتوانێت بگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ژیان تەواو ئەوەندە نا ئەخلاقییە کە هانی فەزاعەتی هاوشێوەی وەك تیرۆری سەردەمی نازی بدات، ئەوەش دەرئەنجامێکە تیەلیکە باوەرِی پێیەتی. هەروەها لە "نهێلیزم: رِیشەی توندرِەوی سەردەمی مۆدێرنە 1994"ی ئۆگن رۆسدا پێشبینیە رەشبینانەکان لە مەرِ کاریگەری نهێلیزم نیشاندراوە. رِۆس دەلێت، گەر نهێلیزم سەرکەوێت و لەسەر رێچکەکەی خۆی باش بێت، جیهانمان دەبێتە "جیهانێکی ساردی نامرۆیانە" کە تیایدا "هیچێتی، ناپەیوەستی و عەبەسیەت" بالا دەست دەبێت.

## نهێلیزمی بوونگەرایی:

لە کاتێکدا نهێلیزم زیاتر لە شێوەی گومان گەراییەکی قول یان رِێژەگەری باسی لێوەکراوە، لە زۆرینەی مەودای سەدەی بیستەمدا پەیوەستکراوە بەو باوەرِەوە کە ژیان بێ مەبەست و بێ مانایە. هیچ گەرایی و بوونگەرایی لەگەل ئەو هزرەیا دەستی پێ کرد کە ژیان بێ واتا و بێ مەبەستە. ئەم بۆچوونە وادەگەیەنێت کە بوون بۆ خۆی – سەرِاپای کردارەکان و ئازار چەشتن و هەست کردن لە کۆتادا پوچ و بەتالە.

لە "رووە تاریکەکە: بۆچوونەکان لە مەرِ پوچێتی ژیان 1991"دا ئالان پرات ئەوە دەخاتە رِوو کە نهێلیزمی بوونگەرایی بە فۆرمێك یان هەر فۆرمێکی دیدا، هەر لە سەرەتاوە بووەتە بەشێك لە نەریتی ئەقلانی خۆرئاوا. بۆ نموونە، تێبینیەکانی گومانگەرا ئەمپدۆکل کە پێیوایە "ژیانی مرۆڤەکان هێندە شتێکی ترۆیە کە لەراستیدا ژیان نەبێت"

هەمان جۆری ڕەشبینی لە ڕادەبەدەری پەیوەست بە نهێلیزمی بوونگەراوە، بەرجەستە دەکات. لە چاخە دێرینەکاندا، ئەم شێوە ڕەشبینییە قوڵە پێدەچێت لەگەڵ هەجێسیس (*Hegesis*)دا بگاتە لوتکەکەی. ئەو فەیلەسوفە باس لەوە دەکات لەبەرئەوەی پەرێشانی و ڕژدیەکانی ژیان یەکجار لە چێژەکان زیاترن، بەختەوەری شتێکی نەشیاوە، هەروەها لەوەوپاش ڕێگای خۆکوشتن خۆشدەکات. لە سەدەکانی دوایدا و لە مەودای ڕێنسانسدا ولیەم شکسپێر خوروبێژانە ڕوانگەی نهێلیستی بوونگەرای کورت کردووەتەوە، کاتێك لەم بەشە بەناوبانگەی نزیك کۆتایی (*Macbeth*)دا، ماکبێز هێڵنجدانی خۆی لە ژیان دەگێڕێتەوە:

بڕۆدەر، بڕۆدەر شەمعی بچوك

ژیان تەنها سێبەرێکی جوڵاوە، ئەکتەرێکی نەزانە کەلەسەر شانۆکە پۆز لێ ئەدات و کاتەکەی دەکوژێت

پاشان لەوە زیاتر نابیسترێت، چیرۆکێك گەوجێك دەیگێڕێتەوە، پڕە لە هەراو شێتگیری هیچ مانایەك نابەخشێت.

لە سەدەی بیستەمدا لە فەرەنسا لە ساڵانی چل و پەنجاکاندا، بزوتنەوەیەکی ناباوەڕکاری بوونگەرایی تەشەنەی کرد، کە بڵاوکردنەوەی نهێلیزمی بوونگەرایی لە شعوری خەڵکدا گرتبووە ئەستۆ. ناساندنی پێشبەندی بزوتنەوەکە لەلایەن جین –پۆڵ سارتەرەوە (1905–1980) "بوون پێش ماهیەت دەکەوێت" هەر زەمینەیەك یان بناغەیەك بۆ دامەزراندنی خودێکی جەوهەری یان سروشتێکی مرۆیانە بەدوور دەگرێت. بوونگەراکان پێیان وایە کاتێك واز لە وێناکردنەکان دێنین هیچێتی ژیان ئاشکرا دەبێت، هەروەها لای ئەوان هیچێتی نەك تەنها سەرچاوەی ئازادی ڕەهایە بەڵکو چاوگەی ترسی بوون و ژانی ویژدانییە. هیچێتی هەر تاکێك وەك جوداکراوەیەك دەردەخات کە فڕێ دەدرێتە نێو گەردونێکی نامۆ و نەسازاوەوە کە بۆ هەتایە کۆسپ دەخرێتە ڕێی زانینی ئەوەی کە بۆچی هێشتا پێویستی بەوەیە مانایەك بخوڵقێنێت. ئەوەش دۆخێکە کە هیچی لە عەبەسیەت کەمتر نییە. نوسین لە ڕوانگەی ڕۆشنگەری عەبەسیەتەوە، وەك ئەوەی ئەلبێرت کامۆ (1913–1960) تێبینی کردووە کە پێی وایە گێچەڵەکەی سیسیف کە مەحکوم کرا بە ململانێیەکی بێ کۆتاو بێ سود ئیرادەیەکی نایاب بوو بۆ مانەوەی مرۆڤ. (ئەفسانەی سیسیف 1942).

لە ئەدەبی بوونگەرایدا ڕێگە باوەکە ئەو ژانە ویژدانییە کۆپی دەکات کە لە پێکدادانمان لەگەڵ هیچێتیدا سەر هەڵدەدات. لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا چیرۆکێکی ڕاستەقینە هەیە کە بە نائومێدی ڕەنگکراوە، چونکە لە دونیایەکی پوچدا بەڕەهایی هیچ ڕێگایەکی پێشبەر نییە و هەر کۆرسە کردارێکیش گرفتاوییە. پەیمانی بەسۆزانەش بۆ داگیرکردن یان بۆخولقاندن وە یان بۆ هەرچییەك بێت، بۆ خۆی بێ مانایە.

کامۆس وەك بوونگەراکانی دی بەوە ڕازی بوو کە نهێلیزم، کە کێشەیەکی سەدەی بیستەم بوو، زۆرترین قسە هەڵدەگرێت: ئەگەرچی ئەو بە سۆزەوە باس لەوە دەکات کە تاك دەیتوانی بەرگەی کاریگەرییە داڕمێنەرەکانی بگرێت، بەناوبانگترین کارەکانیشی پەردە لەسەر ئەو قورساییە نائاساییە لادەدەن کە ڕووبەڕوویان بووەتەوە و دواتریش ئەو دۆخە قایلکەرانەی بونیادناوە. بۆ نمونە لە "نامۆ–1942"دا مۆرسۆلت ئەو گریمانانەی بوونگەرایی ڕەد دەکاتەوە کە لەسەریان پێکنەهاتووە و باوەڕی پێی لاواز بوو. هەر کەمێك بەر لە جێبەجێ کردنی

کوشتنی بێ تاوانێك، بۆی دەردەکەوێت کە ژیان بە تەنها هۆیەکی تەواوە بۆ ژیانی تەنگانەی ئەقڵی، ئەگەرچی ئەوە لە رووی دەقەوە وا دەردەکەوێت کەمتر قایلکەر بێت. هەروەها لە (*Galigula 1944*)دا ئیمپراتۆرە داخ لە دڵەکە بە لە مرۆڤ خستنی خۆی بەکردارەکانی بێ هەستکردن و توندوتیژی هەوڵدەدات بۆ قوتاربوون لە چەڵەمەی مرۆڤایەتی، شکست دەهێنێ و دواتر بە نهێنی کردەوەی کوشتنی خۆی ڕێکدەخات. هەرچی (تاعون 1947)یشە هیچێتی ئەوە نیشاندەدات کە کەسێك باشترین کاری دەکات لە ژیانێکی پوچدا. وە لە کۆتا رۆمانیشیدا "کەوتن 1956" کە کورتە ڕۆمانێکی گاڵتە ئامێزە، کامۆ باس لەوە دەکات کە هەموو کەسێك دەستەکانی سوورە لەبەرئەوەی هەموومان بەرپرسین لە خولقاندنی دۆخێکی پڕ لە پەشیمانی کە بە کردەو نەکردە پڕوپوچەکانمان بە هەمان شێوە خراپتر دەبێت. لەم کارانەو کارەکانی تری بوونگەراکاندا کەسێك ئەو سەرنجەی لا دروست دەبێت کە ژیان بە باوەڕەوە لەگەڵ بێ مانایی ژیاندا شتێکی نەشیاوە.

کامۆ تەواو لە مەترسیەکانی ناساندنی بوون وەك شتێکی بێ مانا، بە ئاگا بوو. و لە کارە فەلسەفیەکەیدا (یاخی – *Rebel* و 1951)دا هەر لە سەرەتاوە ڕووبەڕووی گرفتی نهێلیزم دەبێتەوە. لەم نوسینەدا بە درێژی باسی ئەوە دەکات کە چۆن شکستی مێتافیزیکی بە زۆری بەسەراپا ماندەڵکردن و سەرکەوتنی هیچگەرایی کۆتایی دێت. هیچ گەراییەك کە بەرقێکی قول، تێکشکانی نەخۆشانە و توندوتیژی ئەژمارنەکراو هەروەها مەرگ جودا دەکرێتەوە.

## دژە بنەڕەتگەری و نهێلیزم:

لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا (نهێلیزم) دوو شێوەی جیاوازی لەخۆگرتبوو. لە شێوەیەکیاندا "هیچ گەرا" بۆ جیاکردنەوەی ئەو پیاوە پۆست مۆدێرنە بەکاردەهێنرێت کە لێکچوویەکی، لە مرۆڤێتی خراو، نامۆ کراو، کەمتەرخەم و حەپەساوە و وزەی دەرونی رووەو نێرگسیەتی چێژخوازی یان بەسۆزبوونەوەیەکی قولێ ئاراستە دەکات کە زیاتر وەك توندوتیژی دەتەقێتەوە.

ئەم ڕوانگەیە لە ڕامانەکانی بوونگەراکانەوە لەمەڕ نهێلیزم، داتاشراوە کە لە هەر چاوەڕوان کردنێکی ئومێدبەخش داماڵدراوە و تەنها ئەزموونکردنی دەردو شکست و داهێزران بەجێدەهێڵێت.

دۆناڵد کرۆسبی، لە لێکۆڵینەوەکانیدا لە مەڕ بێ مانایی ژیان، دەنوسێت، کە چاوگەی نهێلیزمی مۆدێرنە بە پێچەوانەوە لە ئیلتیزامێکەوە بە ڕاشکاوی ئەقڵانییەوە سەرچاوە دەگرێت "هەر کە جوڵەکە دەستی پێکرد، پرۆسەی پرسیارکردن دەیتوانی بگاتە یەك کۆتایی، داتاشینی قەناعەت و بێ گومانی و پاشان داڕمان بەرەو نائومێدی" (تارمایی هیچ 1988) کرۆسبی بەردەوام دەبێت و دەڵێت کاتێك پرسیاری دڵسۆزانە بۆ قەناعەتی رەوشتی و ڕەزامەندی کۆمەڵایەتی فراوان دەکرێت، دەتوانێت ئەو هێزە بڵندبووانەش دەربخات کە لە کۆتادا شارستانیەتەکان تێك دەشکێنن. هەروەها (ئەزموونی هیچێتی 1968-1998)ی میکایل نۆڤاکس چیرۆکێکی هاوشێوە دەگێڕێتەوە. هەردوو لێکۆڵینەوەکەش وەڵامی دۆزینەوە تاریکەکانی بوونگەراکانی سەرەتای ئەو سەدەیەن. هەردووکیان بە گەشبینیەوە ڕێگاکانی دەربازبوون لەو دۆزەخە

باسدەکەن لە ڕێگای چڕبوونەوەیان لەسەر ئەو بەڵگە پۆزیتیڤانەی هیچ گەرایی ئاشکرایان دەکات، وەك توانا لیبراڵی و سەربەست و خوڵقێنەرەکان. بۆ نمونە نۆڤاك باسی ئەوە دەکات کە چۆن لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە بۆ دەرچوون لە نهێلیزم. لە پێناو بونیادنانی شارستانیەتێکی نوێدا کاربکەین. بەڵام بە پێچەوانەی ئەو کۆششانە بۆ زاڵبوون بەسەر نهێلیزمدا، کە لە سەرەوە تێبینی کران، کاردانەوە بێ هاوتاکەی پۆست مۆدێرنە هەیە کە پەیوەندە بە دژە بنەڕەتگەراکانی ئێستاوە. ئەو قەیرانە فەلسەفی، ئاکاری و ئەقڵانیانەی نهێلیزم کە فەیلەسوفانی مۆدێرنی بۆ زیاتر لە سەدەیەك ئەشکەنجەدەدا، گۆڕا بۆ بێزاریەکی کەم یان لەوەش سەرنج ڕاکێشتر گۆڕاوە بۆ خۆش قبوڵکردنێکی بێ مانایی لای ئەمان.

فەیلەسوفی فەرەنسی جین – فرانکۆیس لیۆتارد، پۆست مۆدێرنیزم وەك "بێ باوەڕییەك بەرەو ئەو دیوو گێڕانەوەکان" هەموو ئەو بنەڕەتە قایلکەرانەی کە بۆ لە دونیا گەیشتن پشتمان پێ بەستووە، جودا دەکاتەوە. ئەم گومانگەراییە قوڵە "هەرەمە ئەقڵانی و رەوشتیەکانی لەق کردووە، وە کارێکی کردووە کە بانگەشەی حەقیقەت گرفتاوی بێت. دژە بنەڕەتگەراکانی پۆست مۆدێرن کە دژیارانە لەسەر زەمینەی ڕێژەگەری وەستاون مەعریفە وەك راستییەکی ڕێژەیی و حەقیقەتیش وەك راستییەکی کاتی، تەنها تا ئەو ساتەی شتێکی گونجاوتر جێگای دەگرێتەوە، دەردەبڕن. (یادەوەری بیری (نرخی کاش)ی ولیام جێمس). بە هەمان شێوە جاکس دێریدا، بۆ وێنە، جەختە لەوە دەکاتەوە کە کەسێك هەرگیز ناتوانێت دڵنیا بێت لەوەی کە ئەوەی دەیزانێت چونیەکە لەگەڵ ئەوەی کە هەیە. وە لەبەرئەوەی مرۆڤ تەنها لە بەشێکی یەکجار بچووکی هەمووودا بەشداری دەکات، ناتوانێت هیچ شتێك بە دڵنیاییەوە وەربگرێت، وە شتە ڕەهاکان تەنها خەیاڵین). دژە بنەڕەتگەرای ئەمریکی ریچارد رۆرتی رونکردنەوەیەکی هاوشێوە دەدات "هیچ شتێك بناغەی کردەکانمان دانانێت، هیچ شتێکیش شەرعیەتیان پێنادات، هیچ شتێکیش گەشتن بە ڕێگای مەبەستەکان نیشان نادات". (لەمەنتیقەوە بۆ زمان بۆ نمایش 1986). رۆرتی دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەم کوێرە ڕێگا ئەپستمۆلۆژییە بە ڕوونی بەرەو نهێلیزم دەڕوات "بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نا مرۆڤ و نازمانەوانەکەدا چیتر توانای زاڵبوونمان نییە بەسەر ڕووداوە ئەگەر کراوەکان و ئازاری هێنانی ئایدیایەکی تر و گۆڕاندا، بەڵکو تەنها توانای ناسینەوەی ئەو ڕووداوانە و ئازارەکانمان دەبێت" (ئەگەری ڕوودان، گاڵتە، گۆشەگیری 1989".

بە پێچەوانەی ترسەکانی نیچە و قەلەقیەکەی بوونگەراکانەوە، لەلای دژە بنەڕەتگەراکان نهێلیزم دەبێتە ڕووکارێکی دی لەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی ئێستامان، کە کەسێك دەتوانێت بە خۆراگری زۆرباش لەگەڵیدا هەڵبکات. لە "پوچکردنەوەی نهێلیزمدا 1992" کارین کار باس لە وەڵامی دژە بنەڕەتگەراکان لەمەڕ نهێلیزم دەکات. هەرچەندە نهێلیزم هێشتا ڕێژەگەرییەکی گۆت بوو دەبزوێنێت و ئامرازە رەخنەییەکان ناهێڵێت، بەڵام کارین پێیوایە کە هیچ گەرای شاد ئەو رۆژە لەگەڵ خۆی دێنێت کە بە قایلمەندیەکی بێ گرفت بە بێ مانایی جوودادەکرێتەوە. کارین دەگاتە ئەو ئاکامەی کە گەشەیەکی لەو چەشنە یەکجار تۆقێنەرە. چونکە گەر ئەوەمان قبوڵ بوو کە هەموو ڕوانگەکان تێکڕا وەك یەك پەیوەندیدار نین، ئەو کات لوتبەرزی خۆبەشت زانی ئەقڵی و ئەخلاقی ئەوە دیاری

دەكات كە كام لەو روانگەيانە لە پێشترە. لەوەش خراپتر پوچكردنەوەی نهێلیزم ژینگەیەك بەدی دەهێنێت كە تیایدا ئایدیاكان بە بەرگرییەكی كەم دەتوانرێت بەهۆی هێزەوە بسەپێنرێت. لەبەرئەوە تەنها هێزێكی رەشۆكی چینە ئەقلانی و رەوشتییەكان دەستنیشان دەكات. ئەوەش دەرئەنجامێكە كە بەجوانی تێهەڵكێشی ئەوەی نیچە دەبێت كە دەریدەخات هەموو لێكدانەوەكان بۆ دونیا تەنها لێكدانەوەكانی ویستی هێزن.

## ئەنجام:

ئێستا سەدەیەك بەسەر ئەو دەمەدا تێپەڕیوە كە نیچە نهێلیزم و كاریگەرییەكانی لەسەر شارستانیەت دەرخست. هەروەك ئەو بۆخۆی تێبینی كرد كاریگەری نهێلیزم لەسەر كلتور و بەهاكانی سەدەی بیستەم ئەوەندە فراوان بووە كە سەدا بڵندە ئیلهام ئاساكەی بارێكی دەرونی لێڵ و مامەڵەیەكی باشی دوو دڵی و توڕەیی و تۆقاندنی بەرهەم دەهێنا. جێگای سەرنجە، نیچە كە خۆی گومانگەرایەكی ڕیشەیی بوو و سەرقاڵبوو بە زمان، مەعریفە و حەقیقەتەوە، پێشبینی زۆرێك لە بابەتەكانی پۆست مۆدێرنەی كردووە. لەوەش بە دواوە ئەمە بۆ خۆی یاریدەدەرە بۆ سەرنجدان لەوەی كە ئەو پێیوابوو كە لە ئاكامدا دەمانتوانی — بە نرخێكی ترسناك — لە رێگای نهێلیزمەوە كاربكەین. گەر لە پرۆسەی تێكشكانی سەراپای لێكدانەوەكان بۆ ژیان دەربازببووینایە پاشان رەنگ بوو بمان توانیایە ڕێگا راستەكەی مرۆڤ بدۆزینەوە.

من وا بە باش دەزانم، گەشتنی نهێلیزم سەرزەنشت نەكەم چونكە لەو باوەڕەدام كە نهێلیزم یەكێكە لە گەورەترین خاڵەكانی وەرگەران و چركەساتی قوڵترین خودشكانی مرۆڤایەتییە. یان مرۆڤ لێی چاك دەبێتەوە یان بۆ خۆی دەبێتە ڕابەری ئەو تەنگەژەیە، ئەوەش پرسیارە لە قودرەتی مرۆڤ، شتێكی شیاوە (تەواوی كارەكانی — بەرگی 13).

## سەرچاوە


*Encyclopaedia of philosophy.*

*By Bradley Dowden, Ph. D/ James Fieser, Ph. D*

*http: //www.iep.utm.edu/*

# فێمینیزم و فەلسەفەی پەروەردە

**سوزان ڕایز**

**لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف**

یەك لە فەیلەسوفە پەروەردەییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ناوی جەین ڕۆڵاند مارتین بوو، زۆر بەوردی ئیشی لەسەر چەمکی فێمینیزم (*Feminism*) دەکرد.

مارتین سەرپەرشتیکارێکی لێکۆڵینەوەی خوێندکاران بوو لە زانکۆدا لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا. مارتین وەك فەیلەسوفێکی فێمینیست هەستی بە غیابی دیالۆگی ژنان کردبوو لە ناوەندەکانی زانکۆدا. ئەو بەم شێوەیە بۆچوونەکانی خۆی دەخستە ڕوو: "کە یەکێك بیەوێت لە بارەی مەسەلەی ژنانەوە دیراسە بکات ڕەنگە هەوڵەکەی ناکامڵ بێت گەر لایەنی خودی (*Subject*) و بابەتی (*object*) فەرامۆش بکات. ئەمڕۆ لە زۆربەی دیراسە فەلسەفییەکاندا لایەنی خودی و بابەتی مەسەلەکانی ژنان پشتگوێ خراوە. یان بە دیوێکی تردا زۆربەی دیراسە فێمینستییەکان چەمك و پێناسەی فێمێنیزم تەواو ئاڵۆزە و دەقە فێمینستییەکان دەقی تەواو شاراوە و ئاڵۆزن (*Martin,* 1999.150)".

مارتین یەکەمین کەس بوو لە بارەی ڕەگەز و پەروەردەوە دەینوسی. ئەمەش لە دوو دەیەی ڕابردووداو تا ئەم ساتە وەختەش دەتوانین مارتین بە یەکەم فەیلەسوفی بواری پەوروەردە ناودێر بکەین. ئەمەش ڕێگەی بۆ زۆرێك لە فەیلەسوفانی ئافرەت خۆش کرد کە لە بارەی فەلسەفەی پەروەردەوە بنوسن و گرنگی بەو بوارە بدەن بە تایبەت ئافرەتانی زانکۆ. هەرچەندە ئەوە مایەی شۆك نەبوو. بە شێوەیەکی گشتی ئەوان قسەیان لەسەر کێشەکانیان و چەمکی فێمینیزم دەکرد زیاتر لە پیاوان. زۆرێك لە فێمینیست و ڕەخنەگر و ڕۆشنفکرەکان سەرقاڵی کەشف کردن و دیراسەکردنی چەمکی فێمینیزم بوون و زۆر بە شێوەیەکی فراوان دیالۆگیان لەو بارەیەوە دەکرد. هەر لەو سۆنگەیەشەوە ئەوان هۆگری فەلسەفەی پەروەردە دەبوون بێ گوێ دانە جیاوازی ڕەگەزەکان، بۆ نمونە نوسین لە بواری چەمکی "ئەخلاق" لای فەیلەسوفان کارێکی ئەستەم بوو. بە مانایەکی تر نوسین لە بارەی "پەروەردەی

ئەخلاقی" لانی کەم بەبێ بززنی مەعریفەیەك سەبارەت بە چەمکی فێمینیزم ئاسان نەبوو. لێکۆڵەرەوە فێمینستییەکان خاوەن بەهرە و توانایەکی کارامە بوون بۆ دیالۆگ لە بارەی "گۆڕانکاری کارا"وە بە گوێرەی پەروەردە لە ڕووی ئەکادیمیاوە. ئەمەش لەوانەبوو ئاسان نەبێت بەو پێیەی گرتنە ئەستۆی ئەم کارە تاکو تەرایی پێوە دیار بوو. یەکخستنی گوتاری فێمینیست بەهاوبەشی سەرجەم ئافرەتە فێمینیستەکان پێویست بوو. لە جیاتی ئەوە زۆرێك لە لێکۆڵەرەوە فێمینیستەکان سەرگەرمی ئیشکردن بوون لەسەر تیۆرێکی ڕاستەقینە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو لە لیبراڵەوە بۆ بونیادگەری.

لە هەوڵی وەدەستهێنانی گوتارێکی جیاواز هەندێك تەعبیریان لە فێمینیزم دەکرد وەك "کۆ" *Feminisms* زیاد لە فێمینیزم وەك "تاك" *Feminism*. بەڵام ئەوەی گرنگ بوو بەربەرەکانێ و ململانێ *struggle* ی ئافرەتە فێمینیستەکان بوو.

مارتین لە سەرەتاوە بە ئاگا بوو لە هەڵە گواستنەوەی ئایدیاکان یاخود کەم شارەزایی ژنان، تەنانەت پیاوانیش لەو کەم شارەزاییە لە بارەی فێمینیزمەوە بێ بەش نەبوون.

هەر بۆیە مارتین بۆخۆی سەرپەرشتی تێژە مێژوویییە گرنگەکانی دەکرد لە بوارەکانی فەلسەفەی پەروەردەدا کە لەلایەن ژنانی فێمینیستەوە دەنوسرانەوە.

چەندین ساڵ مارتین هەوڵی دەدا ئەو دیراسانە پەسەند بکات کە کاریگەرییان جێدەهێشت لە فەلسەفەدا بە جۆرێك کە تەعبیریان لە فکری فێمینستی دەکرد. بۆ نمونە زۆربەی دیراسە فەلسەفییەکان باس کردن بوو لە (ژن) *woman* نەك چەمکی فێمینیزم بەشێوەیەکی فەلسەفی.

هەر لەو بوارەدا "نیل نۆدینگ" دوو دیراسەی لە ژێر ناونیشانی "گوتاری ژن و ڕەگەز" و "پەروەردەی ئەخلاق"ەوە بلاّو کردەوە. هەر بۆیە زۆربەی گوتارەکانی نۆدینگ لە بازنەی چەمکی "ڕەگەز" و "ئەخلاق"دا دەخولانەوە.

دووەمین چاودێری کردنی مارتین لە بواری فەلسەفەی پەروەردەدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1980 کە زۆرێك لە نوسەران پێیان وابوو کە تەجرەبەی کچان و ژنان گەڕانەوەیە بۆ ئاگایی لە لێکۆڵینەوە فێمینستییەکاندا.

هەر بۆ ئەم مەبەستەش زۆرێك لە فەیلەسوفەکانی بواری پەروەردە لە ژێر کاریگەری فکرەی فیمینیستیدان بەتایبەت دیراسە و راڤەکردنەکانی کچان و ژنانی کارا لە بارەی فیمینیزمەوە، فێمینیستەکان تەحەددای هەر عەقڵێکی محافیزکاریان دەکرد گەر جیاکاری بکردایە لە نێوان تاکەکاندا بەتایبەت لە مەیدانی سیاسەتدا.

یەك لەو نوسەرە فیمینیستانەی کە بانگەشەی ریفۆرمی دەکرد فەیلەسوفی بواری پەروەردە (ماری لیچ) بوو، کە بانگەشەی ریفۆرمی دەکرد لە پەوەردە و مامۆستاوە تا سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگە.

لیچ پێی وابوو ناکرێت لە وەزیفەی پەروەردە و فێرکردندا پشت بە بۆچونی زۆرینە ببەستین، لیچ پێی وابوو کە ژنان خۆیان بەرپرسیارن سەبارەت بە ئەو ئەرکەی کە لەسەر شانیانە لە بواری فێرکردندا وەك مامۆستایەك، لیچ مشتومڕی لەسەر گەشەکردنی پەروەردەی مامۆستا دەکردەوە، ئەو پێی وابوو پراکتیزەکردنی پەروەردە هەنگاوێکە بۆ تێگەیشتن لە نێوان رەگەزەکاندا (نێرومێ)، کە ئەرکی سەرەکی گەشەپێدانی دیدگای مامۆستایانە سەبارەت بە تێگەیشتن لە یەکسانی رەگەزەکان.

فیمینیستەکان گەورەترین کاریگەریان لەسەر ئەوە هەبوو کە تێڕوانینی مامۆستا یان خوێندکاران لە بارەی "یەکسانی" ڕەگەزەکانەوە بگۆڕن فیمینیستەکان لەو دەمەدا بە فراوانی ڕەخنەیان لە فۆرمی کۆمەڵگەی باوکسالاری و سیستەمی دەسەڵاتی کۆمەڵگە دەگرت.

بەم شێوەیە گرنگترین پرسیار کە ململانێی پێویست لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرێت کە "مەشقی فێرکەران" لە بارەی "دەسەڵات"ەوە چ فۆرمێك لە خۆ دەگرێت (1996، *luke*). بەڵام هەندێ نوسەری تر تەرکیزیان لەسەر "ڕەگەز" دەکردەوە کە پابەندن بە خولیای زانین و ئەگەرەکانی فێربون (1986، *Belenky*).

هەروەها چەمکی "سێکس" لە زۆرێك لەو رونکردنەوەو بەیانکردنانەدا ببونە سەردێری دیراسەی زۆرێك لە فەیلەسوفانی بواری پەروەردە (1996، *Rice*). بەو پێیە چەمکی فێمینیزم لە دیراسەی فەیلەسوفانی ئەو سەردەمەدا ڕەنگی دابووەوە، بەجۆرێك کە تایبەتمەند بوو لە بواری پەروەردەدا. بۆ نمونە سارا رۆدیك مشتومڕی لەسەر جۆرێك لە پاراستن و گەشەکردن دەکرد بە جۆرێك کە "ڕازیبوونی کۆمەڵایەتی" لەخۆ دەگرت (1989 *Ruddik*).

هەروەها ڕۆدیك ئیشی لەسەر چەمکی (دایکایەتی) دەکرد بە جۆرێك کە میتافیزیك و چەمکی توانایی *capability* و چەمکی چاکە *virtue* ی لە خۆدەگرت. لە دیدگای ڕۆدیکەوە گرنگی (دایکایەتی) لە گرنگی (پەروەردە)دا بەدەردەکەوت.

زۆرێك لەو بەرهەمانەی کە لەلایەن فێمینیستەکانەوە لە ساڵانی شەستەکاندا بڵاودەکرانەوە تەنانەت تا ئەم کاتەش باسکردن بوو لە ئەزمون و بەرژەوەندی ژنان و کچانی چینی مامناوەند *middle class* بە تایبەت ژنان و کچانی سپی پێست. ئەمەش زیاتر ئەو ژنانەی دەگرتەوە کە بەشداری ئەزموونە جەماوەرییەکانیان دەکرد.

هەر بۆ ئەم مەبەستە لە دەیەی ڕابردوودا زیادبوونی ژمارەیەکی بەرچاو لەو فێمینستانە دەبینین کە گەشەکردنێکی هەستیار بەخۆوە دەبینن وەك جیاوازییەك لە نێوانیاندا کە پەیوەندی بە ڕەگەز، چین، کەلتور و سێکسەوە هەیە لە نێو سەرجەم ئەو فاکتەر و ململانێیانەدا کە پەیوەندییان بە چەمکی یەکسانی *equality*یەوە هەیە.

لە فەلسەفەی پەروەردەدا گەشەکردنێکی بەرچاوی "جیاوازی" هەیە. ئەندریێ تۆمبسۆن مشتومڕی لەسەر هەڵوێستەکردن لە بارەی ئەبستمۆلۆجیای ڕەشپێستەکان و ئاسیاوی و سینییەکانەوە دەکرد. بەدیوێکی تردا تۆمبسۆن مشتومڕی لە بارەی ئەو فێمینستانەوە دەکرد کە بەربەرەکانی جیاکاری ڕەنگ "مەبەست لە سپی پێست و ڕەشپێستە –وەرگێڕ–" دەکرد. بەجۆرێك کە تیۆرێکی فەلسەفەی پەروەردە و نەریتزانی بەرهەم بێنێت *Thompson* 1998.

هەموو ئەم ڕاستییانەش ئەوە دەگەیەنن کە ژمارەیەکی بەرچاو لەو دیراسە و بیر و بۆچونانە سەر بە ڕێچکە و هەنگاوەکانی مارتین بوون، بە تایبەت لە بارەی ئاگایی و وشیاری لە نێو ڕەگەزەکاندا کە تەنها بە "فەلسەفەی پەروەردە" دەتوانرێت گوتارێکی ڕاست و دروست بەرهەم بێت.

**سەرچاوە**

***Encyclopedia of Philosophy of Education***

## ئەدەبی نامە

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەکانی چیخۆفو ئۆڵگاکنیپەر

**لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد**

"ئەم نامانە بەشێکن لە کۆمەڵێك نامەی زۆر کە لە نێوان ئانتۆن چیخۆڤ نوسەرو ئۆڵگا کنیپەری ئەکتەری شانۆدا لە ساڵی 1898 و ساڵانی دواتر نوسراون کە ئەنجامەکەی بە هاوسەریی ئەو دوو هونەرمەندە شکایەوە. بەشی یەکەمی ئەم نامانە لە گۆڤاری "سێڤ"ی ژمارە 2دا بڵاوکراونەتەوە".

"بێگەرد"

**کنیپەر**

**29 ئاب - موسکۆ**

چوار ڕۆژە ڕۆیشتوویتو وا هەست دەکەم حەزم لێیە نامەت بۆ بنووسم. زۆر زووە؟ بە ڕاستیی دوێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵتا بپەیڤم دڵم بە جۆش هاتبوو، حاڵم زۆر خۆشبوو، عەسری ڕۆژی شەممە ڕۆژی دڵخوازی هەفتەیە بۆ من، دەنگی زەنگی کڵێسا ئاسوودەم دەکات (گوێم لە دەنگتە کە دەڵێیت ئای ئەڵمانیی بە سۆز) لە ماڵی ئێوەوە گوێم لە زەنگی پەرستگای "ستراستنو"[1] بوو، بیرم لە تۆ کردەوە، بەڵام نەمتوانی هیچتان بۆ بنووسم. "نمیروڤیچ" لە دوای پرۆڤەکە لەگەڵما هاتو زۆر لامان مایەوە.

چیخۆڤ بەڕێزو ئازیز، هاوڕێی خۆشەویست، دەزانیت ڕۆڵی (ئانا)یان لە شانۆگەریی "مرۆڤە تەنیاکان"دا بە من سپاردووە!! دەتوانیت بیر لەوە بکەیتەوە کە چەندە خۆشحاڵم! (...) لە بارەی شانۆوە ئیتر بەسە، پاشان دێینەوە سەری.

دوای ڕۆشتننت حاڵم باش نەبوو، دڵم پڕبوو لە خەم، ئەگەر "ڤیشنیفسکی"م لەگەڵدا نەبوایە دەگریام، ئیدی نەمتوانی بنووم، بە خەیاڵ لەگەڵ تۆدا سەفەرم دەکرد، حاڵت چۆنە؟ سەرمات نەبوو؟ هاوسەفەرەکانت چۆن بوون؟ بێزارکەر، ئاسایی یان باش بوون؟ ئەم پرسیارانە لە مێشکمدا گڕ دەخۆن، هیچ وەڵامم بۆیان هەیە؟

ئەو سەبەتە چکۆڵەو جوانەی توێشووی سەفەرەکەتان بەکارت هات؟ شیرینیەکانت تاقی کردەوە؟ بەسە، خەریکە ماندووتان دەکەم.

دوای ئەو شیّو هەورە نزمو خۆڵەمێشییەی ئێرە، دەبێت باشور ئێوەی هێنابێتەوە سەر خۆتان، بینینی خۆرو دەریای بریسکەداری باشوور گیانێکی تازە بە مرۆڤ دەبەخشێت، سەرقاڵی خانوو کردنیت، دەزانم دەتەوێت بچیت بۆ "سینانی"[2] لە کەنار دەریادا پیاسە دەکەیتو لە ئاوەکانی ئەویّ دەنۆشیت، بەڵام کنیپەری ئەکتەرت لەگەڵدا نیە.

ڕۆژێك دوای ڕۆیشتنی تۆ "ئەکتەر" ئەمەندە خەمبار بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەڵێنی دابووە خوشکت، سەری لە ماڵەوەتان نەدا، ڕۆژی هەینی هەر لە جێگادا بوو تا بە سەرئێشەیەکی زۆرەوە تێی پەڕاند، دوێنیّ خوشکت لێرە بوو، گوێم لە دەنگە خۆشو ئارامەکەیو پێکەنینەکەیەتی، زۆرم خۆش دەوێت.

دوێنیّ لە پێش پرۆڤەدا چووم بۆ ماڵتان (...) لە ژووری کارکردنتا قەنەفەیەك هەیە، وێنە گەورەکەت بەسەر دیوارەکەوە زۆر دڵگیرە، من بۆ ئەو قەنەفەیە، ڕاست بەرانبەر وێنەکەت، بلیتێکی وەرزیم بڕیوە کە هەمیشە دەبێت بێمو لەوێدا دابنیشم، دوێنیّ پرۆڤەی "ڤانیا" نەکرا. "نیمرۆڤیچ" هات، دەفتەری بەڕێوەبەریە گشتیەکەی خۆی کردەوەو دوای چەندو چونێکی زۆر پرۆڤەی دوێنی ّدواخرا. عەسری دوێنیّ هەموو تیپەکە، بەخێرهاتنەوەی "ستانسلافسکی"یان کرد، حاڵی زۆر چاکترە، چالاك، بە وزەو توانا بوو، ئەمڕۆ "ئیڤانی ترسناك"مان پێشکەش کرد. تێکڕا ستافەکە چاکبوون.

"سانین" ئەوەندە چووبووە دەورەکەیەوە زۆری نەمابوو بە پشتا بکەوێت.

ئەمڕۆ منو خوشکت چووین بۆ "مالی" بۆ ئەوەی دوا پرۆڤەی "ئیگمونت"[3] ببینین "فدوتوڤا"[4] ئێمەی لە ڕیزی دووەما دانا، لە پێش سەرانو بەڕێوەبەران "تلیاکوفسکی"[5] "نیلووفا"[6] و هاوڕێکانیانەوە.

من دەمتوانی بە جوانی بیانبینم، شانازییەکی تەواو! کە باری سەرنجی خۆیان دەردەبڕی بە زۆر بەرمان لە پێکەنینی خۆمان دەگرت. ژێر چەکمەکانی "یوژین"[7] زۆر سپی بوو، کورسیەکە خراپ بوو، پشتێنە بارانیەکەی "یوژین"یان پیّ خۆش نەبوو، یەك وشەیان دەربارەی شانۆکە نەوت. ئەی حاڵەتی دەموچاویان! یادی تۆو باسەکەتم کردەوە کە دەربارەی "خاڵ ڤانیا" کردت. لەناوەوەمدا خەریك بو لە پێکەنیندا لێك ببمەوە "فدوتوڤا"ی بێچارە فرمێسکی دەڕشت، بە ڕاستیی دەگریا، هەر تەواو بە ڕاستیی، چونکە ئەو چیرۆکە مێژووییە بە ڕاستیی ڕوویداوە. لەم سەردەمەدا ئیدی کیّ دەتوانێت گوێی لە وشەکانی لە بابەتی "مەرگ لە ڕێی نیشتماندا" بێت؟ تۆیش نەتدەتوانی بۆ چرکەساتێك لەگەڵماندا لە پاڵ ئەم هاوڕیّ تازانەدا بیت. بێگومان تیا دەچوویت. "کوندراتیف"[8]م بینی، زۆری پیا هەڵدامو هانیدام بچمە تیپەکەیانەوە. دەتوانم بە کورتی بڵێم کە پەیم بە ماهیەتی ڕاستەقینەی هونەر شناسان بردووە. جەنابی نووسەر، دیارە دەمەوێت سەرتان بیەشێنم، وانیە؟

ئەگەر پێت باشبوو نامەیەکی کورتو خۆشم بۆ بنووسە، ئەگەر حەزیشت لێنەبوو هیچ (...) هەموو ڕۆژێك نانی نیوەڕۆ دەخۆیت؟ کەواتە باش بنوو، چاك بخۆو ئاگات لە تەندروستی لەشت بێت.. دەستت دەگوشم.

ئۆلگاکنیپەر

**چیخۆف**

**3 سپتامبەر - "یالتا"**

ئەکتەری ئازیز، من وەڵامی هەموو پرسیارەکانت دەدەمەوە. سەفەرەکەم باش بوو، هاوسەفەرەکانم ڕێگایاندام لە قەرەوێڵەی خوارەوەدا بنووم. پاشان تەنیا منو ئەمریکاییەکی لاو لە

فارگۆنەکەدا بووین. ڕۆژانە چەند جارێك هەر جارە چەند فنجانێك چام دەخواردەوە، هەموو ئەو شتانەی لەناو سەبەتەکەدا بوو خواردم، بەڵام وا دەزانم کە دەست بە سەبەتەو لە وێستگەکاندا بەملاو بەولادا گەڕان بۆ ئاوی گەرم، بۆ مرۆڤ گەلێك سووکەو زیان بە ئابڕووی شانۆی هونەری دەگەیەنێت. هەوای "کورسك"[9] سارد بوو، وردە وردە گەرمی کردو کە گەیشتینە "سوڤاستوپول"[10] ئیتر تەواو گەرم بوو، لە "یاڵتا" چوومە خانووەکەم، ئێستا لەگەڵ سەگە وەفادارەکەمدا "مستەفا" کە پاسەوانیم دەکات دەژیم، هەموو ڕۆژێك نانی نیوەڕۆ ناخۆم چونکە شار لێرەوە دوورەو خواردن دروستکردن لەسەر وەجاخ بۆ ناوبانگی مرۆڤ باش نیە. شەوان پەنیر دەخۆم (...) دیسان چوومەوە سەردانی دوکتۆر "سەردین" و خێزانەکەی. زۆر بە خۆشیەوە تەماشای وێنەکەتیان کردو پێکەوە شیرینیمان خوارد، حاڵی ئەویش باشە، من ئیتر ئاوی کانزایی ناوچەیی ناخۆمەوە. چی تر؟ زۆر بە دەگمەن دەچمە باخ، لە ماڵەوە دادەنیشمو بیر لە تۆ دەکەمەوە. کە بە پاڵ "باخچەسەرا"دا تێپەڕیم یادی سەفەرەکەی هەردووکمانم کردەوە. ئەکتەری لە ڕادەبەدەر ئازیز، خاتوونی گەلێك بەنرخ، خۆزگا دەتزانی خوێندنەوەی نامەکانت چ چێژێکم دەدەنێ، من بەڕێزەوە سەرتان بۆ دادەنوێنم، ئەوەندەی تەوێڵم بدات لە زەویی چاڵێك کە حەڤدە مەتر قووڵ بێت، خووم بە تۆوە گرتووەو ئێستا زۆر خەمبارم، کە بیر لەوە دەکەمەوە تا بەهار ناتبینمەوە خەریکە شێت بم (...) هەوای "یاڵتا" خۆشە، بەڵام لەم دوو ڕۆژەی دواییدا باران هێند دەبەنگانەو بێ وەستان دایکردووە هەموو لایەکی کردۆتە قوڕو چڵپاو کە ناچاری کردووین کەوشی لاستیك لەپێ بکەین، شێ هێند زۆرە کە هەزار پێ بە دیواردا هەڵدەزنێو بۆقو بێچوە تیمساح لەناو باخەکاندا گەمە دەکەن. ئەو مارە سەوزەی سەر گوڵدانەکە کە پێتان دام، من تا ئێرە بە سەلامەتی لەگەڵ خۆمدا هێنامو ئێستا خۆی لەبەر خۆر هەڵخستوە. هێزێکی دەریایی سوپا هاتۆتە ئێرەو من بە دووربین تەماشایان دەکەم. دەیانەوێت "ئۆپەریتێك" لەسەر شانۆ نمایش بکەن، ئەم مێروە فێرکراوانەش لە خزمەتی هونەری پیرۆزدان! پارەم نیە، میوانیش هەر بەردەوامە، زۆربەی کاتەکان تەمەڵت دەکەنو تەمەڵیش بێکەڵكو پووچە.

پشتی دەستان دەگوشمو ماچی دەکەم. تەندروست بیتو خۆشحاڵو شاد، کار بکە، چالاکبە، پڕبە لەسۆزو گۆرانی بڵێو ئەگەر کاتیشت هەبوو کەمێك بیر لەم نوسەرە بکەرەوە کە هەمیشە لە خزمەتت دایەو دڵسۆزانە دەستخۆشیت لێدەکات.

ئا. چیخۆف

### کنیپەر
### سەرەتای سپتامبەر - "موسکۆ"

سڵاوت لێبێت نووسەر، حاڵتان چۆنە؟ من تووڕەمو لەوە ڕەنجاوم کە تۆ ناتەوێت نامەیەك بنووسیتو ئەکتەرت فەرامۆش کردووە، هەرچۆنێکە خوا پشتو پەناتان بێت. هیوام شادیتانە، ئەمشەو شەوێکی نائاساییە، منو مانگەشەو، حەزدەکەم لە شار دەربچمو لە فەزای ئازاددا بژیم. تۆیش دێیت؟ خوات لەگەڵ، خوات لەگەڵ نووسەر، تەندروست بیت.

ئولگاکنیپەر

### چیخۆف
### 9 سپتامبەر- "یاڵتا"

(...)

سڵاو ئەکتەری بەنرخو ئازیز، سڵاو ئەی هاوسەفەری ئازیزی ڕێی "یاڵتا"! سڵاو ئەی

بەختەوەریی من! "ماشا" دەڵێت نامەکەم بە دەست نەگەیشتووە، چۆن دەبێت؟ من زۆر دەمێکە هەر لە دوای گەیشتنی نامەکەتەوە ناردومە.

حاڵت چۆنە؟ کاردەکەیت؟ پرۆڤەکان چۆنن؟ بە ڕاست هەواڵی تازە نیە؟ "ماشا" و دایکم هاتن، ڕاستە سێ کەسین بەڵام پێویستمان بە خانوویەکی گەورەترە، ئێرە بۆ ژیان دەشێت، تەلەفوون هەر سەعاتەو زەنگێکی بێزارکەر لێدەدات. بێ مۆسکۆیی بێزارت دەکات. هەروەها بێ تۆییش ئەکتەری ئازیز، کەی یەکتری دەبینینەوە؟

لە"ئالیکساندەر لینسك"[11] لە(پترۆزبورگ)ەوە تەلگورافێکم پێگەیشت، دەیانەوێت "خاڵ ڤانیا" بخەنە سەرشانۆ، دەمەوێت سەرێك لە شارو بازاڕ بدەم، ئاگاداری خۆت بە، شادو بەختەوەر بیت، نووسەر لە یاد نەکەیت، من لەبیر نەکەیت ئەگینا یان خۆم غەرق دەکەم یان لەگەڵ مەغۆلی یەك چاودا دەبمە هاوسەر.

دەستەکانت چەند جارێك ماچ دەکەم.

ئانتوان چیخۆڤ هەمیشەی تۆ

**کنیپەر**

**10 سپتامبەر - "مۆسکۆ"**

دوێنێ ساڵێکی تەواو بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕی کە بۆ یەکەمجار بە یەکدی گەیشتین. لە "هانتینگ کلاب" کاتێ پرۆڤەی "مەلی دەریا"مان دەکرد، لە بیرتە نووسەری ئازیز؟

کە بیستم بڕیارە نووسەر ئەو شەوە لەوێ بێت گیانم چ لەرزێکی تێکەوت، دەتوانیت بیری لێبکەیتەوە؟ کەچی وا ئێستا دانیشتوومو بێ هیچ ترسێك‌و تەنانەت بەوپەڕی دڵنیاییەوە نامە بۆ ئەو نووسەرە دەنووسم. ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر خۆشە. گەرمەو ئاسمان شینە. ئەگەر هەموو شتەکانم بە دڵ بێت دەمەوێت ئەمڕۆ بڕۆمە دەرەوەو بچمە شارو هەوایەکی پایز هەڵمژم. تا دەگەمە شانۆ چێژ لە بلواری "تورسکوی"[12] وەردەگرم، بە ڕاستی بلوار لەم ڕۆژانەدا جوانە.

منی داماو! شەقامەکان دەدەمە پێوە! دوێنێ زۆرم حەز لێبوو نامەت بۆ بنووسم، بەڵام تەنانەت دەقیقەیەك کاتم نەبوو، بەیانیەکەی پرۆڤەمان لەسەر "خاڵ ڤانیا" کرد. سەعات پێنج "ئیڤانی ترسناك" و پاشان ڕێك چووین بۆ قوتابخانەی "فیلارمونیك" بۆ ئەوەی لە بارەی "مرۆڤە تەنیاکان"ەوە قسەبکەین (...) ئەمڕۆ تەماشای پەردەی سێ‌و چواری "ڤانیا"مان کرد. قەرارە بەیانی دەست بە دوا پرۆڤەی "ترسناك" بکەین‌و پاشان تەواو بکەوینە سەر "خاڵ ڤانیا" ڕۆڵی "سونیا"[13] بۆ "لیلینا"[14] ڕۆڵێکی زۆر مەزن دەبێت، بەڵام نازانم ڕۆڵی من لە "ئیلینا"[15]دا چۆن دەبێت. من زۆرباش لەو تێدەگەم، بەڵام ئایا دەتوانم بە ئاسانی ڕۆڵەکەی ببینم؟

"سارا مورزوڤ"[16] هەمیشە لەوێ چەقیوە، ئامادەی پرۆڤەکان دەبێت‌و تا شەو دەمێنێتەوەو تەواو خۆی ماندوو کردووە. بێگومان هەموومان بەو کارەی پێدەکەنین.. وا دەزانم ئەمڕۆ تا سبەی درەنگ بێت کە بە ڕەسمی داوای هەقدەست بکات، بەڵام چۆن، خودا دەیزانێت. بەلای ئەوەوە منیش ناتوانم ڕۆڵی "ئیلنا" ببینم، چونکە من وەك ئەو مێردێکی خراپم نیەو ئەزموونی ئەوم نیە.

منیش بڕیارم داوە بە دوای مێردێکی وادا بگەڕێم، هیوادارم یارمەتیم بدەیت. ئەم کارەم بۆ دەکەیت؟ لە ڕاستیدا ئەمە لە بەرژەوەندی نمایشنامەکەی تۆیشدایە. ئەگەر کارێکی وام کرد لەوانەیە ئیدی ببمە ئەکتەرێکی زۆر باش (...) سوپاس بۆ وێنەو شیرینیەکان‌و سوپاس بۆ

نامەکەیشت. دڵم بۆ تاقە دێڕێکیش خەریکە دەبێت بە خوێن، ناڕەحەت بووم، وام دەزانی ئیتر ناتەوێت نامەم بۆ بنووسیت، تۆ وا بیرناکەیتەوە کە هۆگرت بووبم؟ لەسەر هەموو شتێك بۆم بنووسە، هەموو شتێك (...).

سڵاوم بە خوشکت و دایکت بگەیەنە، هیوادارم هەموو شتێك بە باشی و خۆشی بەڕێوەبچێت.

دەستان دەگوشم و گۆنای ڕاستتان ماچ دەکەم، شادبیت.

ئۆڵگاکنیپەر

**کنیپەر**

**21 دیسامبەر - "مۆسکۆ"**

وا دەزانم ساڵانێك بەسەر ئەو نامەیەدا تێپەڕیوە کە دواجار بۆم ناردیت، نووسەری ئازیز، من وای بۆ دەچم کە تۆ ئیدی بیر لە من نەکەیتەوە. بۆ لێرە نیت؟ هەوا گەرمە، بە ڕاستیی هاوینە، حەزدەکەم دوای پرۆڤە چایەکت لەگەڵدا بخۆمەوە، بە کاغەزی یاری فاڵ بگرمەوە و لە بارەی شانۆوە قسە بکەم. ئەم ڕۆژانە گەلێك سەرقاڵم. هەموو ڕۆژێك پرۆڤەیە و تەنیا ئەمڕۆ ئازادم. بەم زوانە شانۆگەریەکان دەستپێدەکەن، ترسناکە، هەموویان تووڕەن، بۆ یەکەم شەوی نواندنەکە تاقە بلیتێکیش نەماوە. بلیتەکانی "هنشل" هەمووی فرۆشراوە، یەکەم یەك شەممە "مەلی دەریا" پێشکەش دەکەین، چەندە بە تامە بینینی ڕۆڵی ئەو ژنە درێوە. دەیانویست "شەوی دوانزەهەم"یش لە کۆتایی هەفتەدا نمایش بکەن، بەڵام من زۆر بە توندی ڕەتم کردەوە. بەیانیان "ڤیولا"[17] بەو دەورە قورسەوەوە بەو نواندنە خێرایەو، عەسر "ئارکادینا"[18] تەواو شەکەتم دەکات، هەر نابێت بیری لێ بکرێتەوە. ڕەنگە نمایشی کۆتایی هەفتەیان "ئانتیگونە"[19] بێت. "خاڵ فانیا" بێ "ساتروف" و (ستانسلافسکی) پرۆڤە دەکەین. ئەو بە "ئیڤانی ترسناك"ەوە گیری خواردووە. گوایە پەردەی سییەم هەمووی خرۆشاندوون. هێند بە گەرمی کاردەکەین و وا ئارەقە دەڕێژین دەڵێی کەس ناتوانێت بۆ چرکەساتێك بمانوەستێنێت. ئاه چیخۆڤ نووسەر، خۆزگا شەوی یەکەمی نمایشەکە تۆیش لێرە بویتایە، چەند خۆش دەبوو! بەڵام دیارە شتێکی لە "مۆسکۆ" باشترت پەیدا کردووە، تۆ لەگەڵ "یاڵتا" و "ماڵی خۆتان"دا ڕاهاتوویت. مۆسکۆو، شانۆی ئێمەو، ئەکتەرەکانت لە بیری خۆت بردۆتەوە.

ئۆڵگا کنیپەر

**کنیپەر**

**26 دیسامبەر - "موسکۆ"**

ئەرێ نووسەری ترسناك تۆ شەرم ناکەیت کە پێم دەڵێیت "وەك مار پێوە دەدەم؟" ئەی نووسەری ناپاك، من کەم دەنووسم؟ ئەگەر کەمیش بنووسم لەبەرئەوەیە کە دەترسم نامەکانم سەرت بخەنە ئێش، ئەگەرنا من ئامادەم زۆر زیاتر لەگەڵتا بپەیڤم (...)

ئەو ڕۆژەی دەست بە بلیت فرۆشتن کرا خەڵکیی لە نیوەی شەوەوە لە چاوەڕوانیدا بوون، ڕیز، باوەڕ نەدەکرا، نزیکەی 2500 کەس (...) تەنانەت تاقە بلیتێك بۆ شەوی یەکەمی "ترسناك" نەماوەتەوە، تێکڕا هەموو بلیتەکانی "ترسناك" و "مەلی دەریا" و "فیودور" فرۆشراون. هەموو شاگەشکە بووین، گەلێك خرۆشابووین (...) وا ئەزانم پێتان خۆش بێت بزانن کە "شالیاپین"[20] لە کۆتایی پرۆڤەی "ترسناك"دا ئامادە بوو، ئەمەندەی لا باش بوو لە خۆشیا مشتەکۆڵەیەکی بە

دیوارەکەدا کێشا. دیکوری شانۆی "ترسناك" بێ وێنەیە.

ئەمڕۆ حاڵم چاکترە، دوای نیوەشەو بوو کە لە دوا پرۆڤە گەڕامەوەو شتێکم خوارد، وا ئێستا بۆت دەنووسم دەبێت بێ دواکەوتن بڕۆم بۆ دوا پرۆڤەی "فیودور" لەگەڵ "فیودور"ی تازەدا. ئاوو هەوا ناجۆرە. سارد، باران و بەفر.

ئەمڕۆ زۆر بە جۆرێکی سەرنجڕاکێش پرۆڤەی "شەوی دوانزەهەم"مان کرد. خەریکە وردە وردە فێری دڵەڕاوکێی دنیای ژنی جوان، پێش خزمەتی، ماچ، نیگای دڵخوازانە، هێوری، خۆشەویستی، موسیکا، لەگەڵ شانۆی لێبوك و بێماناو تەنزی گرانی ئینگلیز دەبین. من بزانم نمایشنامەیەکی سەرنجڕاکێش دەبێت. ئەم هەفتەیە پرۆژەی "خاڵ ڤانیا" ناکەین.

(...)

ئیتر دەبێ پەلە بکەم و بچم بۆ شانۆ، خوات لەگەڵ تا نامەیەکی تر. نووسەری ئازیز، لە من تووڕەمەبەو خۆشت بوێم و کەمێك لە بیری مندابە، وێنەیەکی خۆتانم بۆ بنێرە بە ئیمزای خۆتەوە، با تا ڕادەیەك گەورە بێت، چونکە ئەم وێنەیەت کە لە ناوەڕاستی مێزەکەمدا دامناوە بچووکەو چاویشت غەمگین دەنوێنێت.

سڵاوی گەرمم بە دایك و خوشکت بگەیەنە دەستەکانت دەگوشم

ئۆڵگاکنیپەر

چیخۆف

29ی سێپتامبەر - (یاڵتا)

نامە هزرمەندانەکەتم لەگەڵ ماچێکی لاجانگی ڕاستداو نامەیەکی ترتان لەگەڵ وێنەیەکی خۆتدا پێگەیشت. ئەکتەری ئازیز گەلێك سوپاس گوزارم. ئەمشەو نواندن دەستپێدەکات و من لەوەڵامی نامەکەتاندا پیرۆزبایی وەرزی نوێی دەستپێکردنی شانۆتان لێدەکەم و دنیایەك هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم.

بەتەمابووم تەلەگراف بۆ دوو دەرهێنەر بنێرم و پیرۆزبایی لەهەمووان بکەم، بەڵام کە ئەوان خۆیان هەواڵێکیان نەدابێ و تەنانەت هەواڵی سالانەش، وەك ئەوەی کە ماوەیەك لەمەوبەر لەچاپەمەنییەکاندا بڵاوبۆوە، بۆیان نەناردبم و لەلایەکیتریشەوە ئەو ژنە (ڕێکسانڤا[21]) هێشتا لە "مەلی دەریادا" دەور دەبینێت، لەبەر ئەمانە وام بە چاك زانی وایان پیشان بدەم کە لێیان زویرم، بۆیە پیرۆزبایی تەنیا لە تاقە کەسێك دەکەم.

کەمێك باران لێرە باری، وەلێ ئاسمان بێگەرد بووەوە ئێستا هەوا ساردە، دوێنێ شەو ئاگر بەر بووەوە، لە باڵکۆنێکەوە چاوم لە بڵێسەی ئاگرەکە بڕی و بە شێوەیەکی سەیر هەستم بە تەنیایی کرد. ئێستا هەمیشە لە ماڵەوەم، لە ژووری نان خواردندا فراوین دەکەین و دەنگی پیانۆیش بەرزە.

یەك پوولم نیە، ئەگەر شتێکیشم هەبێت دەبێت لە خاوەن قەرزەکانمی بشارمەوە، ئەم حاڵەتە تا هاتنی "مارکس"[22] لە دیسامبەردا هەروا دەمێنێتەوە.

حەزدەکەم شانۆنامەیەکی جوانتان بۆ بنووسم، بەڵام بە بیرمدا نایەت. بۆ ڕۆژی کردنەوە نە شانۆگەرییەکم هەیەو نە شتێکی تازەی سەرنجڕاکێش کە سەرقاڵی بم. هەر ئەوەم هەیە کە هەیە. چاوەڕێی هیچ شتێك نیم، بێجگە لە گۆڕینی ئاووهەوا کە دەشێت لە هەر چرکەساتێکدا ڕووبدات.

لە "ئەلکساندەر لینسکی"[23] بە تەمان "ئیڤانۆڤ"و "مەلی دەریا" نمایش بکەن، هیوادارم

تەندروست بیت ئەکتەری ئازیز، خانمە بیٚ وێنەکە، خودا یاوەرتان بێت، هەردوو دەستت ماچ دەکەمو سەرم لە بەردەمتدا دادەنەوێنم. لە بیرم نەکەیت.

دڵسۆزت ئا. چیخۆف

## کنیپەر

### 29 دیسامبەر - مۆسکۆ

خەوم نیە، شانۆگەری "ترسناک"مان نمایش کرد، هەمووومان هەستێکی زۆر خراپمان تێگەڕا، هیچ رووناکیەکم لە زەینا نیە، وەلیٚ گومانم لەوە نیە کە نەدەبوو کردنەوەی وەرزی دووی شانۆی هونەری بەو شێوەیە بێت. لە پێش هەموو شتێکەوە "ستانسلافسکی" نەخۆشە، ئەو ویستی لە پێش نواندنەکەدا هەواڵی نەخۆشیەکەی ڕابگەیەنرێت، ئەگەرچی گشت گروپەکە لەگەڵ ئەو ڕایەدا نەبوون، ئەمە کاریگەریەکی ناخۆشی لە سەرمان دانا. خەڵکی پێی خۆشە خودی نمایشەکە ببینێت (...) جەماوەر زۆر بە ساردیەوە پێشوازی لە نمایشەکە کرد، پشتی پەردەیش دۆخێکی زۆر نائارامی هەبوو، من ئەم شتە تەنیا بۆ تۆ، جەنابی چیخۆڤ ئازیز، تەنیا بۆ تۆ دەنووسمو بەس. حەتمەن تۆ باشتر دەرک بەوە دەکەیت کە دەڵێم چی، ناتوانم بڵێم تا چ ڕادەیەك بێزارو ناڕەحەتم، ئێستا هەمو شتەکان بەسەریەکدا تێك چرژاونو سبەی خراپتر دەبێت (...) "نیمروڤیچ" ڕاستی کرد، دەبوو ئێمە ڕۆژی کردنەوەی شانۆمان بە "خاڵ ڤانیا" دەستپێبکردایە. لە ئێستاوە دەزانم سبەینیٚ ڕۆژنامەکان چۆن دەمارمان دەردێنن، ئەوان پێشتریش لە دەرفەتێکی وا دەگەڕان.

(...)

ئێستا بەرچاوڕوونیەکت هەیە، چەند ناخۆشە باس لە هەڵەو کەمو کورتیەکانی شانۆی خۆشەویستو تازەمان بکەین. دڵخۆشی خۆم بەوە دەدەمە کە نمایشی ئایندەمان هێندە ناخۆش نابێت. ئەی تۆ بۆ بێدەنگیت؟

ئەکتەری خەمبارت

## چیخۆف

### 30 سپتامبەر - "یالْتا"

(...)

ئاووهەوای "یالْتا" تەواو ساردە، (...) زۆرم پیٚ خۆش بوو ئێستا لە مۆسکۆ بوومایە. ئەکتەری ئازیز، من وێنەم بۆ نەناردوویت چونکە وێنەم لە خۆتەوە پێنەگەیشتووە، ماری ئازیز، من هەرگیز نەم وتووە تۆ وەك "مار پێوە دەدەیت" بەڵام تۆ وەك مارێکی گەورە، وەك مارێکی مەزن وایت، ئەمە تاریفی ئێوە نیە.

دەستەکانت دەگوشمو ئەوەندە سەرمت بۆ دادەنەوێنم تا بە زەویەوە بنووسێت. خانمی زۆر بەڕێز، بەم زووانە دیاریەکی ترت بۆ دەنێرم.

دڵسۆزت ئا. چیخۆف

## کنیپەر

### 2 ئۆکتۆبەر - "مۆسکۆ"

دوێنیٚ "مەلی دەریا"ی ئازیزمان خستە سەر شانۆ، بە خۆشحاڵیەوە نمایشمان کرد. شانۆگەریی بوو (...) ڕۆڵەکان باش بوون، "ستانسلافسکی" دەڵێت ڕۆڵی من چاکترینیان بوو، ئەو سەر شانۆیەی کە "تریگورین"ی لێیە ئێستا باشترە، زۆر لە یەکەم دیمەن ڕازی نیم. تووڕە دەبمو بە پەرۆشەوە جووڵەکانم بەجیٚ دێنم. نوسەری ئازیز لەم لایەنەوە دڵنیا بن، دەڵێن دوێنیٚ "رکسانڤا" زۆر باش بووە، شوێنی وەستانەکانی چاك ئەنجامداوە، بۆڵەی نەکردووە "مایرهولْد" پێی وتم تێکڕای بینەران بە حاڵەتێکی جیاجیاوە گوێیان لێدەگرت. پەردەی

سێیەم ئاسایی بینەرانی زۆر غەمبار کردو پەردەی چوارەم زیاتر چێژی تیا دروستکردن.

ئەو نامەیەم لە بارەی شانۆگەریی "ئیڤانی ترسناك"ەوە کە پڕ بوو لە نائومێدی گەیشتە دەستان؟ هەڵوێستی ڕۆژنامەکان زۆرباش بوو، لەملاو ئەولاوە ڕەخنەی چاك نووسرا، مانای وایە شانۆکەمان ئیتر ڕەگاژوەو من بەمە زۆر خۆشحاڵم، باری تەندروستی ستانسلاڤسکی هێشتا تەواو باش نیە، هەرچەندە دوێنێ لە ڕۆژانی دی باشتر دەوری دەبینی. ژەنراڵ "ترپوف" ئەو دیمەنەی قەدەغەکردووە کە "ئیڤان" لە کڵێسە دێتە دەرەوە، ڕێگا نادات ئەندامی دەستەی ئەمینداریەتی کڵێسە درودی میحراب بخوێنێت، یان ناهێڵێت چرای ئەیقونەکان بخەینە سەرشانۆ، تۆ دەڵێی چی؟ ڕوسیا وڵاتێکی شکۆمەندە! هەروەها وتوویانە دەبێت پەردە پێش ئەوە داگیرێت کە خەڵکی "کریکین" پارچەپارچە دەکەن. من لەگەڵ ئەمەیاندام، سەرشانۆ زۆر واقیعیو خامە، من لە پرۆڤەکاندا دەچوومە دەرەوە، تێکم دەدات! بە هەموو ئەمانەوە "ترسناك" فرۆختێکی باشی هەیە، ڕۆژی دوو شەممە ئیدی کار لەسەر "خاڵ ڤانیا" دەکەین.

بۆ نانووسیت؟ هەست بە نیازەکەی ناکەیت؟ ناتەوێت بنووسیت؟ دەمبەخشیت کە ئەم هەموو پرسیارانە دەکەم (...) ئاگاداری تەندروستی خۆت بە، بگەڕێ، هەوا پاکەکەی باشوور هەڵمژە، دەستت لە نێو دەستمدا دەگوشم، ماچێکی ڕاستەقینەم بۆ "ماشا" دڵسۆزیەکی قووڵم بۆ دایکت. منیش زوو زوو دەنووسم.

دڵسۆزت ئۆڵگا کنیپەر

## پەراوێز

1-Strastone

2-Sinani لە نامەکاندا چیخۆفو ئۆڵگا بەردەوام بە ئاوەڵناوی "نووسەر" و "ئەکتەر" یەکتر ناودێردەکەن.

3-Egmont

4-لە ئەکتەرە دیارەکانی (مالی)و مامۆستای نواندنی ستانسلافسکی.

5-Telyakovsky

6-Nelidov

7-yuzhin

8-Kondrativ

9-Korsk

10-Svastopol

11-Alexandoer Linsk

12-Toeskoy

13-Sonya

14-Lilina

15-Elena

16-Saramorozov هاوڕێی ست نسلافسکیو یەکێك لە گەورە هاوکارانی شانۆی هونەری مۆسکۆ کە زۆر کۆمەڵی ماڵی پێیان دەکرد.

17-Viola

18-Arkadina

19-Antigona

20-Fyodoy chalyapin (1873-1938) گۆرانی بێژی بەناوبانگی بوسی ڕوسیو هاوڕێی "ستانسلافسکی" دەوری سەرەکی ئەو لە "گودنف"دا بوو لە ئۆپێرای "موسورگسلی"دا.

21-ڕێکسانڤا یەکێکە لەو ئەکتەرانەی کە ڕۆڵی (نینا)ی دەبینی.، چیخۆف نواندنی ئەوی پێ خۆش نەبووەو پێشنیازی ئەوەی کردووە ناوەکەی لابەرن.

22-Marx

23-Alexander Linsky.

# تیۆریی ئەدەبی

## پێناسەیەکی زۆر پوخت

**جاناتان کالێر**

**لە فارسییەوە: عەبدولخالق یەعقووبی**

### سەبارەت بە نووسەری ئەم کتێبە

جاناتان کالێر ساڵی 1944 لە دایکبوو، ساڵی 1964 لیسانسی ئەدەب و مێژووی وەرگرت و لە زانکۆی ئاکسفۆرد ماستەری ئەدەبی بەراوردکاری (1968) و دوکتۆرای زمانە مۆدێرنەکانی (1972) وەدەستهێنا. تێزی دوکتۆراکەی سەبارەت بە پێکهاتەخوازی بوو.

لەیەکەم کتێبیدا، فلۆبێر: کاربردی ناقەتعی بوون (1974) رەوشتی فۆرمالیستی رەخنەی نوێی بە یارمەتی نیشانەناسی پێکهاتەخوازانە بەکارهێناوە. کالێر بە یارمەتی یەکێك لە چەمکە باوەکانی فۆرمالیستەکان واتە تەنز، خوێندنەوەیەکی نیشانەناسانەی ئاسەواری گۆستاڤ فلۆبێری بە دەستەوە داوە.

کتێبی دووهەمی، بوتیقاپێکهاتەخواز: پێکهاتەخوازی، زماننناسی، و شیکردنەوەی ئەدەب (1975) دەسنوسێکی دیکەی تێزی دوکتۆراکەی بوو کە پێیداچووبۆوە. کالێر لەم کتێبەدا بە شێوەیەکی تێر و تەسەلتر باسی بوتیقاو تیۆری گێڕانەوە لە چوارچێوەی پێکهاتەخوازیدا کردووە. ئەم کتێبە خەڵاتی جیمز راسێل لووێلی ئەنجومەنی زمانی مۆدێرنی بردەوە.

ساڵی 1977 بوو بە مامۆستای زمانی ئینگلیسی و ئەدەبی بەراوردکاری لە زانکۆی کرنێل. کالێر هەڵە هەڵگری چەند گۆڤارێکی تایبەت بوو، هەر وەتر ئەندامی ئەنجومەنی زمانی مۆدێرن و ئەنجومەنی نیشانەناسی ئەمریکاش بوو.

هەندێ لە کتێبەکانی تری بریتین لە: سوسور، گەڕان بەدوای نیشانەکاندا: نیشانەناسی، ئەدەب، پێکهاتە هەڵوەشێنی (1981)، سەبارەت بە پێکهاتە هەڵوەشێنی: تیۆری و رەخنە لە دوای پێکهاتەخوازی (1982) کە وەرگێڕ دراوەتە سەر چەندان زمان، بارت (1983) و لە قاب گرتنی نیشانە: رەخنە و بنەماکانی (1988).

تیۆری ئەدەبی (1997)، واتە ئەم کتێبەی بەردەستمان، تازەترین کتێبی کالێرە کە زانکۆی ئاکسفۆرد چاپی کردووە و بڵاوی کردۆتەوە بەردەنگانی ئەم کتێبە پتر خوێندکارانی زانکۆ و خوێنەرانی ناپسپۆری بواری تیۆری ئەدەبین.

کالێر لەم کتێبەدا قورسایی بابەتی تیۆری ئەدەبی بە سانایی و شیرنایی زمان و شێوازی نووسینەکەی قەرەبوو دەکاتەوە و گەرەکێتی خوێنەرانی تەرە لەمجۆرە بابەتانە بگەڕێنێتەوە بۆ نێو باوەشی باسوخواسی لەم چەشنە.

جیا لەمانە پێموایە رۆژی ئەوە هاتووە کە کتێبخانەی کوردی دەلاقەیەکی تازەی بەروودا بکرێتەوە تا کتێبگەلێکی لەمجۆرەش لەسەر قەفەزەکانی خۆی دابنێت. خوێنەری کورد و خوێندکاری گەنجی کورد ماڤ رەوای خۆیەتی لەسەر دەستی شارەزایانی ئەم باسانە بچێتە نێو جیهانی تازە بابەتی تیۆری ئەدەبی و لەم سۆنگەیەوە بە چاوێکی وردبینانەتر لە ئەدەب و باسە ئەدەبییەکان بڕوانێ. هەوڵی من ئەوەیە زمانی کوردی لەم جۆرە بابەتە پێویستانە بێبەش نەبێت و بەردەوام لە تەقەللای نۆژەنکردنەوەی خۆیدا بێت. خواستی من لەم وەرگێڕانەدا ئەوە بووە کە لەسەر دەستی زمانێکی سادە و سانا و بێ گرێوگۆڵ بابەتە پێویستەکانی تیۆری ئەدەبی، کە هەندێ جار بە پێچ و پەنان، بۆ نێو مێشکی خوێنەری کورد بگوازمەوە. هیوادارم لانیکەمی ئەم خواستەم بێتە دی.

## پێشەکی

لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو کتێبانەی کە دەیانەوێ باسی تیۆری ئەدەبی بکەن زنجیرەیەك لە "قوتابخانەکانی" رەخنە پێناسە دەکرێن. تیۆری وەك کۆمەڵێك دید و "رووکردی" نەیار دەکەوێتە بەر باس کە هەر دید و رووکردێك خاوەنی هەڵوێستی تیۆریکی خۆیەتی. بەڵام ئەو بزوتنەوە تیۆریکانەی کە لەم کتێبانەدا دەناسێنرێن وەك پێکهاتەخوازی، پێکهاتە هەڵوەشێنی، فێمینیسم، دەروونشیکاری، مارکسیسم، و نویێ مێژووییگەری — گەلێ لایەنی هاوبەشیان هەیە، هەر بۆیە خەڵکان تەنیا باسی تیۆرییە تایبەتەکان ناکەن، بەڵکو باسی "تیۆری" (بە گشتی) دەکەن. بۆ ناساندنی تیۆری باشتر وایە باسی کێشە و داوا هاوبەشەکان بکەین تا ئەوەی قوتابخانە تیۆریکەکان هەڵسەنگێنین. باشتر وایە سەبارەت بەو دەمەتەقە گرینگانە قسان بکەین کە "قوتابخانەیەك" لە هەمبەر "قوتابخانە"یەکی تردا دانانێن، بەڵام لەوانەیە پۆلێن کردنە گرینگەکانی نێو بزوتنەوەکان دەستنیشان بکەن. ئەگەر بێت و تیۆری هاوچەرخ وەك کۆمەڵێك دید یان رەوشتی راڤە تاوتوێ بکەین کە پێکەوە رقەبەرایەتی دەکەن، بەشی هەرە زۆری خۆشی و تواناکانی لە کیس دەچێ، خۆشی و تواناییەك کە لە سۆنگەی بۆ شەڕ بانگکردنی عەقڵی مرۆڤ لە گۆڕەپانێکی بەرفراواندا، و دۆزینەوەکانی لە چلۆنایەتی خولقاندنی مانا و بیچم گرتنی شوناسە ئینسانییەکاندا دێتە دی. من وام بە باش زانیوە کە زنجیرەیەك باس بێنمە ئاراوە، و ناوەندی باسەکە بکەمە ئەو باسوخواسە گرینگانەی کە هاتوونەتە گۆڕێ و پێموایە زۆر شتیان تێدایە کە بۆ فێربوون بەکەڵکن.

سەرەڕای ئەمانە، ئەو کەسەی کتێبێك سەبارەت بە پێناسەی تیۆری ئەدەبی دەخوێنێتەوە، ماڤ خۆیەتی چاوەڕوانی خوێندنەوەی روونکردنەوەیەك بێت سەبارەت بە دەستەواژە گەلێکی وەك پێکهاتەخوازی و پێکهاتە هەڵوەشێنی.

لە پەیوەستی ئەم كتێبەدا ئەم قوتابخانە و بزوتنەوانەم بە كورتی پێناسە كردووە، كە دەكرێ هەر لە سەرەتاوە بخوێندرێنەوە یان دواجار بخوێندرێنەوە یان ئەوەی بەردەوام ببنە سەرچاوەیەك بۆ بابەتەكان. هیوادارم خوێندنەوەی ئەم كتێبە بە تام و لەزەت بێ!

## بەشی یەكەم

### تیۆری چییە؟

ئیمڕۆكە لە باسوخواسی لێكۆڵینەوەی ئەدەبی و كولتووریدا سەبارەت بە تیۆری زۆر شت دەبیسین – تكایە سەرنج بدەن مەبەستی من تیۆری ئەدەب نییە، مەبەستم "تیۆری" رووت و ویشك و برینگە. بۆ ئەو كەسەی لە دەرەوەی ئەم مەیدانە بێت، ئەم شێوە كاربردە دڵنیام شتێكی زۆر سەیر و سەمەرە دێتە بەر چاو. دەخوازن بپرسن: "تیۆریی چی؟" خاڵی سەرسووڕهێن ئەوەیە كە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە گەلێ ئەستەمە. نە تیۆری سەبارەت بە شتێكی تایبەت لە ئارادایە، نە تیۆرییەكی كامڵ و پڕ بە پێست سەبارەت بە كۆمەڵێك شت بە گشتی. جاری وایە وێدەچێ تیۆری پتر لەوەی شیكردنەوەی شتێك بێت، خۆی جۆرێك چالاكی و هەڵسووڕان بێت، – كارێكە كە مرۆڤ دەیكات یان نایكات. لەوانەیە مرۆڤ سەری بە كاری تیۆرییەوە قاڵ بێت، لەوانەیە تیۆری وەك وانە بڵێتەوە یان بیخوێنێتەوە، لەوانەشە رقی لە تیۆری بێت یان لێی بترسێ. بەڵام هیچ كام لەمانە بۆ تێگەیشتن لە چییەتی تیۆری هێندە بە هانامانەوە نایەن.

دەڵێن "تیۆری" سریشتی لێكۆڵینەوەی ئەدەبی گۆڕیوە، بەڵام مەبەستی ئەوانەی ئەم قسەیە دەكەن، تیۆری ئەدەبی، واتە شیكردنەوەی سیستماتیكی سریشتی ئەدەب و شێوازەكانی لێكدانەوەی ئەدەب، نییە. كاتێك كەسانێك گلەیی لەوە دەكەن كە ئیمڕۆكە لێكۆڵینەوەی ئەدەبی لێوانلێو بووە لە تیۆری، مەبەستیان ئەوە نییە كە بۆ نموونە تێڕامانێكی لە ڕادەبەدەر لەسەر سریشتی ئەدەب هەیە، یان سەبارەت بە لایەنە تایبەتەكانی زمانی ئەدەب باسوخواسان دێتە ئاراوە. بە هیچ كلۆجێك وا نییە. مەبەستیان شتێكی ترە.

مەبەستی وان لەوانەیە رێك ئەوە بێ كە پتر لەوەی پێویستە، سەبارەت بە بابەتی غەیرە ئەدەبی قسان دەكرێ و سەبارەت بەو بابەتە گشتییانەی كە پێوەندییان بە ئەدەبەوە ئاشكرا نییە چییە و چۆنە باس و دەمەتەقە دەكرێ و دەقی خۆبەدەستەوە نەدەری دەروونشیكاری و سیاسی و فەلسەفی دەخوێندرێنەوە. تیۆری بۆتە كۆمەڵێك ناو (زۆر بەشیان بیانی)، مەبەست، بۆ وێنە، ژاك دریدا–یە، میشل فۆكۆ و لوس ئیریگاری و ژاك لاكان و جودیت باتلێر و لویی ئالتۆسێر و گایاتری ئیسپیواك–ە.

### دەستەواژەی تیۆری

ئێ باشە، دەیجا تیۆری چییە؟ بەشێك لە گرفتەكە بۆ سەر خودی دەستەواژەی تیۆری دەگەڕێتەوە كە ئاماژە بە دوو لایەن دەكات. لەوانەیە مەبەست لە تیۆری شتێكی وەك "تیۆری نیسبییەت" بێ كە كۆمەڵەیەكی سەقامگرتووی پێكهاتوو لە چەند گوزارەیەكە. بەڵام لەلایەكی ترەوە، وشەی تیۆری كاربردێكی زۆر ئاساییشی هەیە.

"ژیان و ئازاد[1] بۆچی لە یەك جیا بوونەوە؟"

"راستت بوێ تیۆری و رای من ئەوەیە كە..."

تیۆری لێرەدا هەڵگری چ واتایەكە؟ یەكەم شت، دەبێ بڵێم تیۆری دەربڕی جۆرێك "مەزەندە

کردن"ە. بەڵام تیۆری و مەزەندە پێکەوە جیاوازییان هەیە. ئێمە کاتێك دەڵێین "وا مەزەندە دەکەم کە..." بە مانای ئەوەیە کە وەڵامێکی راست بۆ ئەم بابەتە هەیە، بەڵام من بە رێکەوت نایزانم: "وا مەزەندە دەکەم کە ژیان لە دەس بۆڵە بۆڵی ئازاد وە ئامان هات، بەڵام ئەو کاتەی هاڤالەکەیان کەژاڵ[2] بێت تێدەگەین ئەسڵی کێشەکە چی بووە." بەڵام تیۆری مەزەندەکردنێکە کە لەوانەیە نەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئەو شتەی کەژاڵ باسی دەکات، شیکردنەوەیەکە کە سەلماندنی راستی یان ناڕاستییەکەی لەوانەیە کارێکی ئەستەم بێت.

بێژەری رستەیەکی لەم دەستە "تیۆری و رای من ئەوەیە کە.." هەر وەتر دەربڕی ئەم راستیەیە کە خەریکە شیکردنەوەیەك بە دەستەوە دەدات کە حاشا هەڵنەگر نییە. چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکەین کە دوا بە دوای ئەو رستەیەی سەرەوە بڵێ: "تیۆری و رای من ئەوەیە کە لەیەك جیابوونەتەوە چونکی ماوەیەکە ئازاد و نەرگیس دڵیان بەیەکەوەیە و هاموشۆیان هەیە."

ناکرێ بەمە بڵێین تیۆری. بەبێ زیرەکی و زانایییەکی ئەوتۆش لە بواری تیۆری دارشتندا بۆمان هەبوو بەو ئاکامە بگەین کە ئەگەر ئازاد و نەرگیس دڵیان بەیەکەوە بووە، لەوانەیە هەر ئەمە بیری کەژاڵی سەبارەت بە ئازاد گۆڕیبێت. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەمەیە کە ئەگەر بێژەرەکە بیگوتایە "تیۆری و رای من ئەوەیە کە ئازاد دڵی بە نەرگیسەوەیە و هاموشۆی دەکات،" لەکتوپڕ بوونی ئەم پێوەندییە وەك مەزەندە و گومانی لێدێت و ئیتر بە شتێکی قەتعی داناندرێ و هەر بۆیە دەبێتە تیۆرییەکی گریمانکراو. بەڵام، بە گشتی، هەر چەشنە دەربڕین و شیکردنەوەیەك، بۆ ئەوەی ببێتە تیۆری، دەشێ نەك هەر ئاشکرا و حاشا هەڵنەگر نەبێت، بەڵکو هەندێ گرێوگۆڵ و پێچوپەناشی تێدابێ: "تیۆری و رای من ئەوەیە کە ژیان هەمیشە لە دڵی خۆیدا ئاشقی باوکی بووە و ئازاد هیچ کات نەیتوانی ببێتە ئەو مرۆڤەی کە ژیان دەیخواست." تیۆری دەشێ شتێکی زیاتر لە گریمانە (فرضیە) بێت: ناشێ حاشا هەڵنەگر و روون و ئاشکرا بێت، دەشێ لە تیۆریدا و لە نێوان چەندان رەگەزیدا کۆمەڵێك پێوەندی بە پێچوپەنا و سیستماتیك هەبێ، و نەکرێ بە هاسانی قبووڵ بکرێت یان توور هەڵدرێت. ئەگەر ئەم رەگەز و هۆکارانەمان لە بیر بمێنێ، ساناتر دەتوانین لەو شتە بگەین کە پێی دەڵێن "تیۆری".

## تیۆری وەکوو ژانر

تیۆری لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا شیکردنەوە و تاوتوێکردنی سریشت یان شێوەگەلی هەڵسەنگاندنی ئەدەب نییە (ئەگەر چی بابەتگەلی لەم چەشنە بەشێکن لە تیۆری و لەم کتێبەدا، بە تایبەت لە بەشی 2 و 5 و 6 باسیان لێدەکەین). تیۆری لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا بریتییە لە کۆمەڵێك کاری فیکری و هزرڤانی و هەندێك نووسراوە کە دەسنیشانکردنی سنوورەکانی کارێکی هەتا بڵێی ئەستەمە. ریچارد رورێتی، فەیلەسووف ناسراو، باسی ژانرێکی نوێ و تێکەڵاو دەکات کە لە سەدەی نۆزدەدا دەستییپێکرد: "لەسەردەمانی گۆتە و ماکیاوێلی و کارلایل و ئیمێرسن-ەوە، جۆرێکی تازەی نووسین هاتە ئاراوە کە نەهەڵسەنگاندن و نرخاندنی باشییە رێژەییەکانی بەرهەمگەلی ئەدەبییە، نە مێژووی هزر و ئەندێشەیە، نە فەلسەفەی ئەخلاقی و نە پێشگۆییکردنی کۆمەڵایەتییە، بەڵکو بریتییە لە سەرومڕی ئەم شتانە، کە لە نێو بۆتەی ژانرێکی نوێدا

تواونەتەوە." ساکارترین ناوێك كە بۆمان هەیە بۆ ئەم ژانرە هەمەڕەنگە هەڵبیژێرین تیۆرییە کە لە ساتەوەختی ئێستادا بەو شوێنەوارە دەگوترێ کە دەسەڵاتی ئەوەیان هەبێت هزر لە گۆڕەپانگەلێکی جیا لەو گۆڕەپانانەی کە بە ڕواڵەت ئی خۆیانە بێننە مەیدانی بەرەنگاری و ململانێ، و ئاراستەکەی بگۆڕن. ئەمە سادەترین شیکردنەوەی ئەو تایبەتمەندییەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشتێك بڵێین تیۆری. ئەو شوێنەوار و ئاسەوارەی کە بە تیۆری ناویان زڕاوە لەو دیو سنووری گۆڕەپانی سەرەکی کار و ئەرکی خۆیان کاریگەر و شوێندانەرن.

ئەم شیکردنەوە سادەیە پێناسەیەکی رازیکەر و دڵخۆشکەرە نییە، بەڵام وێدەچێ بۆی هەبێ داگری ئەو شتە بێ کە لە دەیەی 1960–وە ڕوویداوە: ئەو کەسانەی کە لە گۆڕەپانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا کار دەکەن کەڵکیان لە نووسراوەکانی دەرەوەی گۆڕەپانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی وەرگرتووە، چونکی لێکدانەوەیەك کە ئەم نووسراوانە سەبارەت بە زمان، یان زەین، یان مێژوو، یان کولتوور بە دەستەوەیان داوە شیکردنەوەگەلێکی تازە و نۆژەن و قەناعەتپێهێنەر لەمەڕ کێشە دەقی و کولتوورییەکان دەخاتە بەردەم ئەوان. تیۆری بەم مانایە کۆمەڵێك ڕەوشت و میتۆد نییە بۆ هەڵسەنگاندن و تاوتوێکردنی ئەدەب، بەڵکو گۆڕەپانێکی بێ سنوورە پێکهاتوو لە کۆمەڵێك نووسراوەی سەبارەت بە هەر شتێکی بیرتان بۆی دەچێ، لە بە پێچوپەناترین پرسەکانی فەلسەفەوە هەتا شێوازە بگۆڕەکانی ئاخافتن و تێفکرینی خەڵکان سەبارەت بە لەشی مرۆڤ. ژانری "تیۆری" ئاسەواری مرۆڤناسی، مێژووی هونەر، هەڵسەنگاندنی فیلم، لێکۆڵینەوەی پێوەندیدار بە نێرمایی (جنسییەت)، زمانناسی، فەلسەفە، تیۆری سیاسی، دەروونشیکاری، لێکۆڵینەوەی زانستی، مێژووی کۆمەڵایەتی و فیکری، و کۆمەڵناسی دەگرێتە بەر. ئەم ئاسەوارە بە باسوخواسی نێو ئەم گۆڕەپانانەوە سەرقاڵ بوون، بەڵام بۆیە بوونەتە "تیۆری" چونکی تێڕوانین یان لێکدانەوەکانیان بۆ ئەو کەسانەی کە لەو لقانەدا کار ناکەن ئیلهامبەخشن یان بەکەڵك بوون. ئەو ئاسەوارەی کە دەبنە "تیۆری" شیکردنەوەگەلێك بە دەستەوە دەدەن کە خەڵکانی تر دەتوانن لە لێکۆڵینەوەی مانا، سروشت و کولتوور، کارکردی دەروونی مرۆڤ، پێوەندی نێوان ئەزموونی گشتی و ئەزموونی تاکەکەسی و پێوەندی نێوان هێزە گەورەترەکانی مێژوویی و ئەزموونی تاکەکەسی بەکار بێنن.

## کاریگەریێتی تیۆری

ئەگەر بێت و تیۆری بە پێی کاریگەرێتی کردەییەکەی (عملی) پێناسەی بکەین، واتە وەك شتێك کە تێڕوانینی خەڵك دەگۆڕێ و دەبێتە هۆی ئەوەی سەبارەت بەو بابەتانەی لێیدەکۆڵنەوە و هەڵسوکەوتی خۆیان لە لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانەدا بە شێوەیەکی جیاواز لە شێوەکانی پێشوو بیر بکەنەوە، دەشێ ئەم پرسیارە بێنینە گۆڕێ کە ئەم کاریگەرێتییانە کامانەن؟

کاریگەرێتی سەرەکی تیۆری پرسیارکردنە لە "عەقڵی باو": تێڕوانینی دامەزراو لەسەر بنچینەی عەقڵی باو لە هەمبەر پرسگەلی وەك مانا، نووسین، ئەدەب، تەجرەبە. بۆ وێنە، تیۆری لە مەڕ خاڵەکانی خوارەوە پرسیار بە ڕەوا دەزانێ:

–باوەڕ بەوەی مانای گوتە یان دەقێك هەر هەمان شتە کە بێژەرەکەی "لە زەینیدا هەڵیگرتووە"

-یان باوەڕ بەوەی نڤیسار شێوە دەربڕینێکە کە ڕاستییەکەی لە شوێنێکی تر، لەو تەجرەبە یان دۆخەی کە دەریدەبڕێ، خۆیا دەبێ،

-یان باوەڕ بەوەی ڕاستەقینە (واقیع) واتە شتێك کە لە کاتێکی دیاریکراودا "بوونی بێت".

تیۆری گەلێ جار ڕەخنەگری کەللەڕەقی بیرو بۆچوونی باوە، و جیا لەمە، هەوڵێکە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە کە ئەو شتەی ئێمە بە "عەقڵی باو"ی دەزانین و پێمانوایە شتێکی حاشا هەڵنەگرە لە ڕاستیدا پێکهاتەیەکی مێژووییە، تیۆرییەکی تایبەت کە ئیتر هێندە سروشتی دێتە بەر چاو کە تەنانەت وەك تیۆری لێی ناڕوانین. تیۆری، کە ڕەخنەگری عەقڵی باوە و چەمکە جێنشینەکانی ئەو عەقڵە دەدۆزێتەوە، پێویستی بە پرسیار کردن لە بنچینەیترین سەرەتا یان گریمانەکانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبییە، بنکۆڵکردنی هەر شتێك کە لەوانەیە وەك شتێکی حاشا هەڵنەگر گریمان دەکرێ: مانا چییە؟ نووسەر چییە؟ خوێندنەوە چییە؟ "من" یان بکەرێك کە دەنووسێ، دەخوێنێتەوە، یان کارێك دەکات، چییە؟ دەق چۆن چۆنی لەگەڵ ئەو دۆخەی کە تێیدا دەخوڵقێن پێوەندی یان هەیە؟

بۆمان هەیە چ نموونەیەك بۆ "تیۆری" بە دەستەوە بدەین؟ وا باشە لە بری قسەی زۆر و بۆر سەبارەت بە تیۆری، یەکڕاست سەرێك بە نێو ماڵی چەند نووسراوەیەکی ئەستەمی دوو کەس لە بەناوبانگترین تیۆریستانی هاوچەرخدا بکەین تا بزانین چییان لێ هەڵدەکرێنین. من باسی دوو بابەتی پێوەندیدار بەڵام لێکدژ دەکەم کە لەواندا هزرگەلی دامەزراو لەسەر بنەمای عەقڵی باو سەبارەت بە "جنس"، "نووسین"، و "تەجرەبە" ڕەخنەیان لێگیراوە.

## فۆکۆ سەبارەت بە جنس

میشیل فۆکۆ، توێژەری فەرەنسەیی مێژووی هزر، لە کتێبێکدا بە ناوی "مێژووی هەستی جنسی" خۆی گوتەنی لە "گریمانەی سەرکوتکردن" دەکۆڵێتەوە: لەم بیرۆکە باوە کە جنس شتێکە کە سەردەمانی ڕابردوو، بە تایبەت سەدەی نۆزدە، سەرکوتیان کردووە و سەردەمی مۆدێرن شەڕی بۆ کردووە تا ئازادی پێبەخشیوە و ڕزگاری کردووە. بە قسەی فۆکۆ، "جنس" نەك هەر شتێکی سروشتی نەبووە کە سەرکوتکراوە، بەڵکو لە ڕاستیدا بیرۆکەیەکە بە پێچوپەنا و پڕ لە گرێوگۆڵ کە لەسەر دەستی هەموو جۆر و چەشنەکانی دابی کۆمەڵایەتی و لێکۆڵینەوە و باسوخواس و نووسراوە بە کورتی "گوتارەکان" یان "بەستێنە گوتارییەکان" - کە لە سەدەی نۆزدەدا کۆ ببوونەوە، پێکهاتووە. هەمەجۆر و چەشنی قسە و باس - قسە و باسی پزیشك، مەلا، ڕۆماننووس، دەرونشیکار، ئەخلاقگەرا، یارمەتیدەری کۆمەڵایەتی، سیاسەتمەدار - کە ئێمە دەیانلکێنینەوە بە سەرکوتکردنی هەستی جنسی، لە ڕاستیدا بە شێوازی جۆراوجۆر شتێکیان بەرهەمهێناوە کە ناوی دەنێین "جنس". فۆکۆ دەڵێ: "چەمکی جنس ئەم هەلەی ڕەخساند کە ڕەگەزەکانی پێوەندیدار بە ناسینی جەستە، کار کردەکانی ژین ناسی، ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکان، هەست و خواستەکان و چێژ و لەزەتەکان لە یەکێتییەکی ساختە و دەسکرددا کۆ ببنەوە، و ئەو توانایییەی بە مرۆڤ بەخشی تاکوو لە ئەم یەکێتییە ساختەیە وەك هۆکار و مانایەکی گشتگیر و نهێنییەك کە دەشێ لە هەموو شوێنێك بە دوایدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە کەڵك وەربگرن." فۆکۆ حاشا لە

کردەوەی جەستەیی دەستێکەڵکردنی جنسی یان جنسییەتی ژین ناسانە و ئەندامە جنسییەکانی مرۆڤ ناکات. ئەو باسی ئەوە دەکات کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕێگای نوێ هاتە ئاراوە بۆ ئەوەی هەمە جۆر و چەشنی شتی هێزەکی (بالقوە) تەواوەن جیاواز، لەیەك تەوەرەی تاقانەدا (جنس) کۆببنەوە: کردەوەگەلێکی تایبەت، کە ئێمە پێیاندەڵێین جنسی، جیاوازیگەلی ژین ناسانە، ئەندامەکانی لەش، پەرچەکرداری دەروونی و گرینگتر لە هەمووان واتاگەلی کۆمەلآیەتی. شێوازی ئاخافتنی خەڵکان سەبارەت بەم رەفتار و هەڵسوکەوت، و هەست، و کارکردە ژین ناسانانە، و شێوەی رووبەڕوو بوونەوەیان لە هەمبەر ئەوان، شتێکی جیاواز، و یەکێتییەکی ساختەی بەناوی "جنس" خوڵقاند کە دواتر وەك رەگەزێکی بنەڕەتی بۆ شوناسی تاکەکەس دەهاتە ئەژمار. دوای ئەمە، بەراوەژووبوونەوەیەکی گرینگ هاتە ئاراوە و هەر ئا ئەم شتەی کە "جنس"یان پێدەگوت بە هۆکاری چەشنەکانی ئەو دیاردانە لە قەڵەم درا کە پێکەوە کۆببوونەوە تا ئەم بیرۆکەیە پێکبێنن. ئەم پرۆسەیە گرنیگی و دەورێکی نوێی بە هەستی جنسی بەخشی و بوو بە هۆی ئەوەی کە هەستی جنسی ببێتە نهێنی و رازی سریشتی تاکەکەس. فۆکۆ، کاتێك باسی گرینگایەتی "مەیلی جنسی" و "سروشتی جنسی"ی ئێمە دەکات، ئەم پرسە دێنێتە ئاراوە کە ئێمە گەیشتووینەتە ئەو شوێنەی کە چاوەڕوانی دەکەین لەسەر دەستی شتێك تێمانبگەن کە سەدەهای سەدە بە شێتی لە قەڵەم دەدرا... شوناسمان لە شتێکەوە سەرچاوە بگرێت کە بە مەیلێکی بێ ناو دەناسرا. ئەو گرینگایەتییەی کە بۆی قایلن، ئەو ترسە تێکەڵ بە حورمەتەی کە لە دەوریمان ئاڵاندووە، ئەو زەحمەتەی کە لە پێناوی ناسینیدا دەیکێشین، هەمووی لێرەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەو راستییەش کە بە درێژایی سەدەهای سەدە لە رۆحیشمان بۆمان گرینگتر دەنوێنێ هەر لێرەوە سەرچاوە دەگرێ.

نموونەیەك لەو پرۆسەیەی کە "جنس"ی کردە رازونهێنی بوونی تاکەکەس، کە سەرچاوەی سەرەکی شوناسی تاکەکەسە، داهێنانی "هاوجنس خواز" وەك تایپ (جۆر)، یەکێك لە "جۆرەکانی بوونەوەران"، لە سەدەی نۆزدەدایە. لەسەردەمانی پێش ئەم داهێنانە کردەی دەستێکەڵکردنی جنسی لە نێوان کەسانی هاو جنس دەبووە هۆی روو رەشی (وەك نێربازی)، بەلآم لەم سەروبەندەدا ئیتر ئەم کردانە بریتی نەبوون لە کۆمەڵێك کردار بەڵکو بە پرس و کێشەی شوناس–یان دەزانی، کێشەکە ئیتر ئەوە نەبوو کە کەسێك کردەیەکی ناڕەوا و حەرامی کردووە، بەڵکو ئەمە بوو کە ئەو کەسە کەسێکی "هاوجنس خوازە". فۆکۆ دەڵێ نێربازی بریتی بوو لە کردارێك، بەلآم "لەو زەمان و سەردەمەدا کەسی هاوجنس خواز ببووە یەکێك لە بوونەوەران." جاران باسوخواسی کردارگەلی هاوجنس خوازانە لە گۆڕێدا بوو کە لەوانە بوو کەسانێك بە کردەوە بیکەن، لەم سەردەمەدا کێشەکە لە راستیدا کێشەی ناوەند یان جەوهەرێکی جنسی بوو کە هەر لە بنەڕەتەوە دابینکەری بوونی تاکەکەس دەهاتە ئەژمار: ئایا ئەم کەسە هاوجنس خوازە؟

بەپێی شیکردنەوەی فۆکۆ، گوتارگەلی پێوەندیدار بە داب و بنەما جۆراوجۆرەکانی کۆمەلآیەتی – شێوەی هەڵسوکەوتی پزیشکان، مەلاکان، کاربەدەستانی حکوومەتی، یارمەتیدەرانی کۆمەلآیەتی، و تەنانەت رۆماننووسان لەهەمبەر ئەو دیاردانەی کە بەپێی پێناسەی ئەوان "جنسی"ین،–

"جنس" پێکدێنن. بەڵام ئەم گوتارانە جنس وەك شتێکی کە پێش خودی ئەم گوتارانە بووبێتن پێشکەش دەکەن. بیرمەندانی مۆدێرنیش زۆربەیان ئەم بۆچوونەیان قبووڵ کردووە و ئەو گوتار و دابە کۆمەڵایەتیانەیان شەرمەزار کردووە کە لە راستیدا خۆیان خەریکی داهێنان و رێکخستنی ئەوانن. لە لێکۆڵینەوەی فۆکۆدا ئەم پرۆسەیە بەراوەژوو دەبێتەوە و جنس نەك وەك هۆ (علت)، بەڵکو وەك هۆکرد (معلول) شیدەکرێتەوە، واتە بەرهەمی ئەو گوتارانەیە کە دەخوازن چالاکی و کاروباری مرۆڤان لێکبدەنەوە و پێناسە و رێکوپێکیان بکەن.

لێکۆڵینەوەی فۆکۆ نموونەیەکە لە شیکردنەوەیەك کە لە گۆڕەپانی مێژووەوە هاتووە و بۆتە "تیۆری"، چونکی خەڵکانی تر لە بواری دیکەدا ئیلهامیان لێوەرگرتووە و بە کاریان هێناوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە تیۆرییەك نییە سەبارەت بە هەستی جنسی بە مانای کۆمەڵێك ئەسڵی بابەتیانە کە لاڤی جیهانگیر بوون لێبدات. ئەو شتەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەیڵێ ئەمەیە کە رەوتی شکڵ گرتنی مێژوویەکی تایبەتی شیکردۆتەوە، بەڵام دیارە کە کارەکەی حاسڵێکیٚ زیاتر و بەرفراوانتری بە دوادا دێت. دنەتان دەدا کە بە چاوی گومانەوە لەو شتانە بڕوانن کە تا ئێستا بە سروشتی و سەقامگیر دەزانران. واتە پرسیار لە خۆتان بکەن کە ئایا بۆی نییە بە پێچەوانەوە راست بن؟ واتە ئەم شتانە هەر لە بنەڕەتەوە لە سۆنگەی گوتارەکانی کارناسان، ئەو بوارە پێوەندیدارانە بە گوتارگەلی ئەو زانستەی کە پێیانوایە پێناسەی دەکەن بە دیهاتوون؟ بە پێی لێکدانەوەی فۆکۆ، ئەوە هەوڵ و تێکۆشان بۆ زانینی هەقیقەت سەبارەت بە مرۆڤەکانە کە "جنس"ی وەك راز و نهێنی سریشتی مرۆڤ بە دیهێناوە.

## بزووتنی تیۆری

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بیرۆکەیەی کە بۆتە تیۆری پێشنیاری ئەو "بزوتن"ە سەرنجراکێشانەیە کە مرۆڤەکان دەتوانن لە کاتی تێفکرین لە بابەتی دیکە کەڵکیان لێوەربگرن. یەکێك لەم بزوتنانە ئەم بۆچوونەی فۆکۆیە کە دژوازی گریمانکراوی نێوان هەستی جنسیی سروشتی و هێزی کۆمەڵایەتی (دەسەڵات) کە ئەو هەستە سەرکوت دەکەن لەوانەیە لە راستیدا هاودەستانە بێت: هێزی کۆمەڵایەتی ئەو شتە (جنس) بەدی دێنن کە بە ڕواڵەت بۆ ئەوە تێدەکۆشن کە بیخەنە ژێر رکێفی خۆیان. بزووتنێکی تر – لە راستیدا خەڵاتەکەی ئێمە – ئەوەیە کە پرسیار بکەین لە شاردنەوەی ئەم هاودەستی و پیلانە لە نێوان دەسەڵات و جنس، کە دەڵێن دەسەڵات دەیچەپێنیٚ و سەرکوتی دەکا، چ شتێك وە دەست دیٚ، کاتێك ئەم وابەستەییە دوو لایەنەیە دژوازی لە قەڵەم بدریٚ نەك وابەستەیی دوو لایەنە، چی روو دەدا؟ وەڵامێك کە فۆکۆ بە دەستەوەی دەدات ئەمەیە کە بەمجۆرە دەستڕۆیشتوویی هەمەلایەنەی دەسەڵات دەشاردرێتەوە: مرۆڤ پێیوایە کە لە ڕێگای بەرگریکردن لە جنس لە هەمبەر هێرشی دەسەڵات خۆڕاگری دەنوێنیٚ، لە کاتێکدا لە راستیدا خەریکە بە تەواوی بەپێی ئەو ڕێسایانەی کە دەسەڵات دەسنیشانی کردوون دەجووڵێتەوە. بە وتەیەکی تر، چونکی وێدەچیٚ کە ئەم شتە، واتە "جنس" لە دەرەوەی هەرێمی دەسەڵاتە – واتە شتێکە کە هێزی کۆمەڵایەتی لە خۆراییی هەوڵ دەدەن بیخەنە ژێر رکێفی خۆیان – کە وایە دەسەڵات چوارچێوەدار و بەرتەسك دێتە بەر چاو، بۆیە هەر لە بنەڕەتەوەش ئەوەندەی کە پێمانوابوو دەسەڵات بە هێز نییە

(ناتوانى جنس بخاتە ژێر ركێفى خۆى). بەڵام ئەوەى راستى بێت دەسەڵات دەست رۆيشتووييەكى هەمەلايەنەى هەيە، و لە هەموو شوێنێك ئامادەيە.

بەبۆچوونى فۆكۆ، مرۆڤەكان دەسەڵات وەگەڕ ناخەن، بەڵكو "دەسەڵات/ مەعريفە" دەخەنەگەڕ: دەسەڵات لە قەوارەى مەعريفەدا، يان مەعريفە وەك دەسەڵات. ئەو شتەى پێمانوايە لە مەڕ جيهان دەيزانين – ئەو چوارچێوە چەمكييەى كە وايانلێكردووين لە قاڵبى ئەودا بير لە جيهان بكەينەوە – دەسەڵاتێكى زۆر دەخاتە گەڕ. دەسەڵات/ مەعريفە، بۆ وێنە، دۆخێكى هێناوەتە گۆڕێ كە لەودا جنسى ئێوە، پێناسەتان پێدەبەخشێ. دۆخێكى هێناوەتە گۆڕێ كە ژن وەك كەسێك دەناسێنێ كە وا گريمان دەكرێ بوونى ئەو ژنە وەك تاكێكى كۆمەڵ لە گرەوى ئەو پێوەندييە جنسييەدايە كە لەگەڵ پیاوێكدا هەيەتى. ئەم بيرۆكەيە كە جنس لە دەرەوەى دەسەڵات و بەرامبەرى دەسەڵات وێستاوە مەيدانى دەستتێوەردانى دەسەڵات/ مەعريفە دەشارێتەوە.

چەند خاڵێكى گرينگ سەبارەت بە ئەم نموونەيەى تيۆرى لە ئارادايە كە دەشێ باسيان بكەين. تيۆرييەك كە فۆكۆ لێرەدا هێناويەتە گۆڕێ لێكۆڵينەوەييە –لێكۆڵينەوەى چەمكێك– بەڵام سەرەڕاى ئەوە لە هەناوى خۆيدا هەڵگرى مەزەندەكردنيشە، بەو واتايە كە چ شاهيد و بەڵگەيەكى شايانى پێشكەشكردن لە ئارادا نييە تا بێت و دروستبوونى ئەم گريمانەيە دەربارەى هەستى جنسى بسەلمێنێ.

(گەلێ نيشانەهەن كە شيكردنەوەكەى فۆكۆ پاساو هەڵگر دەنوێنن، بەڵام تاقيكارى و سەنگى محەكێكى قەتعى بۆ سەلماندنى دروستبوونى ئەو شيكارييە لە گۆڕێدا نييە.) فۆكۆ بەم جۆرە لێكدانەوەيە دەڵێ "رەخنەى رەگەزناسانە": دەرخستن و لە هەرادانى ئەم شتە كە چۆن چۆنى رەوتى گوتارى بابەتى بە رواڵەت زاتيى، وەك "جنس"، بەرهەم دێنن. ئەم چەشنە رەخنەيە هەوڵ نادات پێمانبڵێ جنس "لە راستيدا" چييە، بەڵكو دەيەوێ ئەوە نيشان بدا كە ئەم چەمكە چۆناو چۆن بەدى هاتووە. دەبێ هەروەتر سەرنج بەمەش بدەن كە فۆكۆ لێرەدا هەر لە بنەڕەتەوە باسى ئەدەب ناكات، گەرچى ئاگامان لێيە كە تيۆرييەكەى بۆ ئەوانەى سەرقاڵى كارى لێكۆڵينەوە لەسەر ئەدەبن گەلێ سەرنجڕاكێش بووە. سەرەتا ئەوەى كە ئەدەب دەربارەى جنسە، ئەدەب يەكێك لەو شوێنانەيە كە بيرۆكەى جنس لەوێدا پێكهاتووە، شوێنێك كە تێيدا پەرە بەم بيرۆكەيە دەدرێ كە قووڵترين شوناسى مرۆڤەكان بەو مەيل و خواستەوە گرێ دەدرێ كە لە هەمبەر مرۆڤێكى ديكە هەستى پێدەكرێ. شيكارى فۆكۆ هەم بۆ ئەوانەى كە لە رۆمان دەكۆڵنەوە و هەميش بۆ ئەوانەى كە لە روانگەى هاوجنس خوازانى ژن و پياو و موتالاّى جنسييەتى بە گشتى، سەرقاڵى لێكۆڵينەوە لەسەر ئەدەبن خاوەنى گرينگايەتى بووە. فۆكۆ زياتر لە هەر شتێك لە سۆنگەى داهێنانى شتى مێژوويى نوێ كاريگەرى هەبووە: شتى وەك "جنس"، "سزا"، و "شێتى" كە جاران پێمانوانەبوو كە خاوەنى مێژووى خۆيان بن. لە ئاسەوارى فۆكۆدا ئەم شتانە وەك پێكهاتەيەكى مێژوويى لێياندەكۆڵدرێتەوە و هەر بۆيە هانمان دەدەن تا سەرنج بدەين كە رەوتى گوتارى دياردەيەكان، يەك لەوان ئەدەب، چلۆن لەوانەيە چوارچێوەى ئەو شتانەى كە بە ئەسڵێكى حاشا هەڵنەگرمان دەزانى داڕشتووە.

## دریدا سەبارەت بە نڤیسان

واباشە دووهەمین نموونەی "تیۆری" – کە بە ئەندازەی پێداچوونەوەی فۆکۆ لە مەڕ مێژووی هەستی جنسی شوێندانەر بووە بەڵام خاوەنی هەندێك تایبەتمەندییە کە پیشاندەری کۆمەڵێك "جیاوازی"ی هەناوی تیۆرییە – لەو لێکۆڵینەوەیەی ژاك دریدا، فەیلەسووفی هاوچەرخی فەرەنسەیی، بێنینەوە سەبارەت بە باسی نڤیسان و تەجرەبە لە دانپیانان –ی ژان ژاك رۆسۆ. رۆسۆ نووسەری سەدەی هەژدەی فەرەنسەیە کە بە باوەڕی گەلێ کەس کارێکی کرد بیرۆکەی مۆدێرنی "من"ی تاکەکەسی بەدی بێت.

بەڵام با سەرەتا لە پێشینەی کێشەکە بکۆڵینەوە. فەلسەفەی رۆژاوا بە شێوەیەکی نەریتی لە نێوان "راستەقینە" و "رواڵەت"دا جیاوازی داناوە، واتە جیاکاری لە نێوان شتەکان و نواندنەوەیان، و هزر و ئەو نیشانانەی کە ئەو هزرە دەردەبڕن. نیشانە، یان نواندنەوەکان لەم روانگەیەوە چ نین جگە لە رێگایەك بۆ گەیشتن بە راستەقینە، هەقیقەت، یان بیرۆکەکان، و دەشێ لە روونترین و شەفافترین ئاستی شیاودابن، ناشێ بەردەست و پێ بگرن، ناشێ لەسەر ئەو هزر یان هەقیقەتەی کە دەینوێنن شوێندابنێن یان بیشێوێنن. لەم چوارچێوە فیکرییەدا، ئاخافتن راستەوخۆترین دەرکەوت یان بوونی هزر هاتۆتە ئەژمار، لە کاتێکدا کردەی نڤیسان، کە لە نەبوونی بێژەردا کار دەکات، وەك نواندنەوەی دەسکرد و وەرگیراو لە ئاخافتن لە قەڵەم دراوە، وەك هێمای بەشێوەی هێزەکی سەرلێشێوێنەری نیشانەیەك.

رۆسۆش کاتێك دەڵێ: "زمانەکان بۆ ئاخافتن دروست بوون، نڤیسان تەنیا دەوری تەواوکەری ئاخافتن دەگێڕێ" هەر لەم نەریتە پەیڕەوی دەکات، نەریتێك کە بۆتە پاژێك لە عەقڵی باو. لێرەدایە کە دریدا لێمان دێتە پێشێ و پرسیار دەکات: "تەواوکەر یانی چی؟" لە قامووسی وێبستر وشەی تەواوکەر بەم چەشنە پێناسەکراوە: "شتێك کە شتێکی تر کامڵ دەکات یان شتێکی پێزیاد دەکات." ئایا نڤیسان لە رێگەی هێنانە ئارای شتێکی پێویست کە شوێنی بەتاڵە ئاخافتن کامڵ دەکات، یان شتێکی پێزیاد دەکات کە ئاخافتن بێ ئەویش کاری خۆی بێ عەیب و کەمایەسی بەڕێوە دەبات؟ رۆسۆ گەلێ جار نڤیسان وەك زیادییەکی رووت، پێزیادبوویەکی ناپێویست، تەنانەت "یەکێك لە نەخۆشینەکانی ئاخافتن" باسی دەکات: نڤیسان بریتییە لەو نیشانانەی کە ئەگەری تێنەگەیشتن و خراپ تێگەیشتن دێنێتە گۆڕێ، چونکی نڤیسان لە نەبوونی بێژەرەکەیدا دەخوێندرێتەوە و بێژەرەکەی لە بەردەست نییە تا بابەتەکە شیبکاتەوە یان راستیکاتەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەی رۆسۆ نڤیسان بە زیادییەکی نا پێویست لە قەڵەم دەدا، لەبەرهەمەکانیدا نڤیسان وەك شتێکی تەواوکەر یان قەرەبووکەرەوەی کەمایەسییەکی ئاخافتن دێنێتە هەژمار: بەردەوام باسی نڤیسان دووپات دەکاتەوە تا کەم و کورتییەکانی ئاخافتن، بۆ نموونە ئەگەری خراپ تێگەیشتن، قەرەبووکاتەوە. بۆ وێنە، رۆسۆ لە دانپیانان–ی خۆیدا، کە دەسپێکەری بیرۆکەی من وەك راستەقینەیەکی "دەرونی"یە کە بۆ کۆمەڵگا نەناسراوە، دەڵێ بڕیاری داوە دانپیانان–ی خۆی بنووسێ و خۆی لە چاوی کۆمەڵگا بشارێتەوە چونکی لە کۆمەڵگادا خۆم "نەك هەر لە دۆخێکی لاوازتر، بەڵکو وەك کەسێکی تەواو جیاواز لەوەی هەم (نیشان دەدەم).. ئەگەر خۆم لەوێ ئامادە دەبووم خەڵك هەرگیز نەیاندەناسیم." کەواتە بەرای

رۆسۆ من–ی دەروونیی "راستەقینە"ی ئەو جیاوازە لە من–ەی کە لە وتوێژەکانی دەگەڵ ئەوانیتردا دەردەکەوێ، و ئەو بۆ کاملٚ کردنی ئەو نیشانە گومڕاکەرانەی ئاخافتنەکانی پێویستی بە نڤیسانە. لێرەوە دەردەکەوێ کە نڤیسان پێداویستییە چونکی هەنووکە ئاخافتن خاوەنی ئەو تایبەتمەندییانەیە کە پێشتر دەخرانە پاڵ نڤیسان. ئاخافتن، وەك نڤیسان، لە کۆمەڵێك نیشانە پێکهاتووە کە ئاشکرا و روون نین، لە خۆوە ئەو مانایەی بێژەر مەبەستێتی بە دەستەوە نادات، بەڵکو هەڵگری لێکدانەوە و راڤەن.

نڤیسان تەواوکەری ئاخافتنە، بەڵام ئاخافتنیش خۆی هەر لە بنەڕەتەوە تەواوکەرە: رۆسۆ باسی ئەوە دەکات کە منالاٚن خێرا فێری ئەوە دەبن کە بە یارمەتی ئاخافتن "لاوازیی خۆیان قەرەبووکەنەوە.. چونکی بەبێ ئەزموونێکی زۆریش دەکرێ لەوە تێبگەین کە جوولانەوە لەسەر دەستی ئەوانیتر و وەگەڕخستنی جیهان تەنیا لە سۆنگەی بزووتنی زمانەوە چەندە کارێکی چێژبەخشە." دریدا، لە بزووتنێکدا کە لایەنی دیاریکەری تیۆرییە، ئەم بابەتە تایبەتە وەك نموونەی پێکهاتەیەکی هاوبەش یان وەك مەنتقێك شیدەکاتەوە: "مەنتقی تەواوکەر بوون"ێك کە ئەو لە بەرهەمەکانی ڕۆسۆدا دۆزیویەتەوە. ئەم مەنتقە پێکهاتەیەکە کە لەودا ئەو شتەی کە کاملٚ دەبێ (ئاخافتن) خۆی پێویستی بە کاملٚ کردن دەبێ، چونکی وەدەردەکەوێ هەر ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە کە لە بنەڕەتدا پێمانوابوو کە تەنیا تایبەتمەندی دیاریکراوی تەواوکەرە (نڤیسان). لێرەدا هەولٚ دەدەم پتری شیبکەمەوە.

ڕۆسۆ پێویستی بە نڤیسانە: چونکی ئاخافتن بە خراپ لێکدەدرێتەوە. گشتگیر قسان بکەین دەڵێین پێویستی بە نیشانە هەیە چونکی خودی شتەکان بەش ناکەن و بەس نین. رۆسۆ لە دانپیاناندا ئەڤینی سەردەمی مێردمناڵی خۆی لە هەمبەر مادام دوواریێرن وەسف دەکات کە رۆسۆ لە ماڵەکەیدا دەژیا و پێی دەگوت "دایە".

ئەگەر بمەوێ بە وردی باسی ئەوە بکەم کە وەبیر هێنانەوەی دایکی خۆشەویستم لەو کاتەی کە ئیتر لای ئەو نەبووم وای لێدەکردم چ هەڵسوکەوتێکی شێتانەم هەبێ باسێکە و نابڕێتەوە. هەزاران جار تەختی خەوەکەم ماچ دەکرد، کاتێك وەبیر دەهاتەوە کە لەسەر ئەم تەختە گەلێ جار خەوتووە، پەردە و شتومەکی نێوماڵم ماچ دەکرد، چونکی ئی ئەو بوون و دەستە جوانەکەی وێیان کەوتبوو، تەنانەت تەختی ژوورەکەم ماچ دەکرد کە خۆم لەسەری درێژ دەبوومەوە، چونکی بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو بەسەریدا رۆیشتووە.

ئەم شتە جۆراوجۆرانە لە نەبوونی ئەودا وەك تەواوکەر یان جێنشینی ئامادەبوونی ئەو(دایە) دێنە ئەژمار. بەڵام دوایی دەبینین کە تەنانەت لە بەردەم ئەو ئەم پێکهاتەیە، ئەم پێویستییەبە تەواوکەر، بەردەوام دەبێ. رۆسۆ لە درێژەی بابەتەکەیدا دەڵێ، جاروبار تەنانەت لەبەردەم ئەو کاری هێند سەیر و سەمەرەم دەکرد کە تەنیا ئەڤینە هەرە مەزنەکان دەیانتوانی کاری وایان لێبوەشێتەوە. رۆژێك لەسەر سفرە، کە خەریکبوو تازە پارووویەکی دەخستە زاری، لە ناکاو گوتم موویەك بە پارووەکەوەیەتی. پارووەکەی لە دەمی دەرهێناوە و لەسەر دەوریەکەی داناوە. بە تامەزرۆییەوە دەستم دایە پارووەکەی و خستمە دەمم و خواردم.

ئامادەنەبوونی ئەو (دایە)، ئـەو کاتـەی رۆسۆ

ناچارە بە جێنشین یان نیشانەکانی ئەو قەناعەت بکا کە وەبیر هێنەرەوەی ئەون، سەرەتا لە بەرامبەر ئامادەبوونی ئەودا دادەنرێ بەڵام دوایی دەبینین کە ئامادەبوونی ئەو کاتی چێژ وەرگرتن نییە، یان وەدەست خستنی راستەوخۆی شتەکە، بەبێ نیاز بە تەواوکەر یان نیشانەکان، لەبەردەم ئەویشدا هەر هەمان پێکهاتەیە بوو. رووداوی ترسناکی خواردنەوەی ئەو پاروەی کە دایك لە دەمی دەریهێناوە هەر لەم سۆنگەیەوەیە. بەم شێوەیە دەکرێ درێژە بە زنجیرەی جێنشینەکان بدرێ. تەنانەت ئەگەر رۆسۆ سەردەمانێك بیتوانیبا، بە قەولی خۆمان، بیکاتە "ماڵی خۆی" و دەستی بەسەردا بگرێ، دیسان وای هەست دەکرد کە لە چنگی دەرباز دەبێ، تەنیا دەکرێ چاوەڕێی بەیەك گەیشتنی بێت یان ئەم بەیەك گەیشتنە وەبیر خۆی بێنێتەوە. خودی "دایە"ش جێنشینی ئەو دایکەیە کە رۆسۆ هەرگیز چاوی پێینەکەوت – ئەو دایکەی کە ئەگەریش ببوایە دیسان بەشی نەدەکرد و بەس نەبوو، و وەکوو هەموو دایکانی دیکە نەیدەتوانی تەواو رازیمان بکات و پێویستی بە تەواوکەر هەبوو.

دریدا دەڵێ: "لە هەناوی ئەم زنجیرە لە نێو زنجیرەیەی تەواوکەرەکاندا یاسایەك خۆیا دەبێ: یاسای زنجیرەگەلی پێوەندیدار بە یەکی بێ کۆتایی، لە کاری بەرفراوانکردنی بێ بڕانەوەی ئەو نێوبژێکەرە تەواوکەرانەی کە هەستی هەر ئەو شتە بەدی دێنن کە دوای دەخەن: واتە کاریگەرێتی خودی ئەو شتە بەدی دێنێ، کاریگەرێتی ئامادەبوونی راستەوخۆ، یان هەر ئەو تێگەیشتنەی کە سەرچاوە بووە. (لێرەوە) راستەوخۆیی دێتە بەرهەم. هەموو شتێك لەسەر دەستی نێوبژێکەرەکانەوە دەسپێدەکات. ئەم نیشانە یا تەواوکەرانە لە راستیدا ئەم هەستە دێننە ئاراوە کە شتێکی (وەك دایە) بۆ بەدەستهێنان لە گۆڕێ دایە. ئەو شتەی لەم دەقانەوە هەڵیدەکرێنین ئەمەیە کە بیرۆکەی شتی ئەسڵی لە سۆنگەی (بیرۆکەی) نوسخە بەدەڵەکان بەرهەم دێن، و ئەو شتە ئەسڵییە هەمیشە دوا دەکەوێ – و قەرار نییە قەت وەچنگ بکەوێ. ئەنجام ئەوەیە کە ئەوەمان بۆ دەسەلمێندرێ کە وێنای (تصور) پشت ئەستوور بە عەقڵی باوی ئێمە لە مەڕ راستەقینە وەك شتێك کە بوونی هەیە، و وێنای ئێمە لە مەڕ شتی ئەسڵی وەك شتێك کە سەردەمێك بوونی بووە، قابیلی وەدەستهێنان نییە: تەجرەبە هەموو کات ئاتاجی نێوبژێکەریی نیشانەکانە و شتی "ئەسڵی" وەك هۆکاری نیشانەکان و تەواوکەرەکان بەرهەم دێت."

بە بۆچوونی دریدا، ئەو شتەی لە دەقەکانی رۆسۆدا، وەك زۆر دەقی تر، باسی دێتە ئاراوە ئەمەیە کە لەبری ئەوەی ژیان بەشتێك بزانین کە نیشانە و دەقگەل پێی زیاد دەبن تا (دەروازەی ماناکانی) بکەنەوە، دەشێ ژیان خۆی لێوڕێژ لە نیشانەکان بزانین، کە پرۆسەگەلی دەلالەت ئەو جۆرەیان لێ کردووە کە هەیە. لەوانەیە نووسراوەکان بڵێن کە راستەقینە پێش دەلالەت دەکەوێ، بەڵام ئەوەی راستی بێ ئەوە نیشان دەدەن کە، بە پێی گوتەی بەناوبانگی دریدا، "*Ilnya pas de hors- texte*" "شتێك لە دەرەوەی دەق بوونی نییە." ئەو شتەی وەدەست دێت تەنیا دەقێکی تر، نیشانەگەلێکی تر، و زنجیرەگەلێکی تەواوکەری دیکەیە. دریدا دەڵێ:

ئەو شتەی هەوڵمان داوە تا لە ڕێی شوێن پێ هەڵگرتنی هەودای پێوەندی "تەواوکەری مەترسیدار" وە نیشانی بدەین ئەمەیە کە لەو شتەی ناوی دەنێین ژیانی راستەقانیی ئەم بوونەوەرانەی خاوەن "گۆشت و خوێن"،.. هیچ کات شتێکی جگە

لە نووسراوە نەبوو، هەرگیز شتێکی جگە لە تەواوکەر و دەلالەتگەلی جێگرەوە نەبوونە کە تەنیا دەتوانن لە زنجیرەیەکی پێکهاتوو لە پێوەندیگەلی جۆراوجۆردا دیارکەون.. و هەر بەم جۆرە هەتا دوایی، چونکی لە دەقدا خوێندوومانەتەوە کە ئەو ئامادەبووە رەهایە، سروشت، شتێك کە لە ڕێگەی وشەگەلێکی وەك "دایکی راستەقینە" و هتد ناومان هێناوە، هەمیشە پێشتر لە چنگمان دەرباز بووە، و هیچ کات بوونی نەبووە، و خوێندوومانەتەوە کە سەرەتای مانا و زمانی نووسراوە وەك ونبوونی ئامادەبوونی سروشتییە.

مەبەست ئەوە نییە کە ئامادەبوونی "دایە" یان ئامادەنەبوونی، یا رووداوێکی "راستەقینە" و رووداوێکی "داستانی" جیاوازییان پێکەوە نییە. مەسەلەکە ئەمەیە کە ئامادەبوونی ئەو چەشنێکی تایبەتی ئامادەنەبوونی لێ دەردێ، کە دیسان پێویستی بە کۆمەڵێك نێوبژێکەر و تەواوکەر هەیە.

## لەسەر دەستی ئەم نموونانە چی تێدەگەین

فۆکۆ و دریدا زۆر جار لە نێو گرووپی "پاش پێکهاتەخوازان" (چاو لە بەشی پەیوەست بکەن)دا جێگەیان بۆ دابین دەکەن، بەڵام ئەم دوو نموونەیە لە تیۆری کۆمەڵێك جیاوازی بەرچاویان لەگەڵ یەك هەیە. تیۆریی دریدا خوێندنەوە یان راڤەیەکی دەق بە دەستەوە دەدا و لە نێو دەقدا هەست بە بوونی مەنتق و لۆژیکێك دەکات. بیری فۆکۆ لە سەر بنەمای دەق نییە — لە راستیدا، ئاماژەکردنی ئەو بە کەمی بەڵگە یان گوتارەکان سەرسوڕهێنەرە— لەبری ئەمانە، فۆکۆ چوارچێوەیەکی گشتی بۆ تێفکرین لەمەڕ دەق و گوتارەکان بەعام دادەڕێژێ. تەفسیر و شرۆڤەی دریدا نیشان دەدا کە شوێنەواری ئەدەبی خۆیان، وەك دانپیانانەکان–ی رۆسۆ، تا چ رادەیەك تیۆرین: کۆمەڵێك باسوخواس، کە بە ڕاشکاوی زەینین، سەبارەت بە نڤیسان، خواست، و جێنشینی یان پڕ کردنەوە دێننە ئاراوە، و لە هەندێ ڕێگاوە کە خۆیان بە ڕاشکاوی دەستنیشانی ناکەن، دەستمان دەگرن کە چۆن چۆنی سەبارەت بەم بابەتانە بیر بکەینەوە، بەڵام فۆکۆ نایەوێ نیشانمان بدا کە دەق تا چ ڕێژەیەك زانایانەن یا خاوەنی ئاوەزن، ئەو دەیەوێ پێمان بڵێ کە گوتاری پزیشکان، بیرمەندان، رۆماننوسان و ئەوانی تر تا چ ڕادەیەك لە بەدیهێنانی ئەو شتانەدا شەریك و برابەشن کە خۆیان پێیان وایە تەنیا خەریکن لێی دەکۆڵنەوە. دریدا نیشانمان دەدا کە شوێنەواری ئەدەبی تا چ ڕادەیەك تیۆرین، فۆکۆ پێمان دەڵێ کە گوتارەکانی زانست تا چ ڕادەیەك بۆیان هەیە شت دابهێنن و بەرهەمهێنەر بن.

سەرەڕای ئەمانە، ئەم دوو تیۆری داڕێژە لە داواکاری و ئەو پرسیارانەی کە دوا بە دوایان سەرهەڵدەدەن کۆمەڵێك ناکۆکی بەدی دەکرێ. دریدا پێیوایە ئەوەمان نیشان دەدا کە دەقەکانی رۆسۆ چی دەڵێن یان چیمان پیشان دەدەن، کەواتە، ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئەو شتەی دەقی رۆسۆ دەیڵێ ئایا ڕاستە یان نا. فۆکۆ پێیوایە خەریکە چرکەساتێکی مێژوویی تایبەت شی دەکاتەوە، کە واتە پرسیارێك کە دێتە گۆڕێ ئەمەیە کە ئایا سەرومڕی بۆچوونە پەرەپێدراوە بەربڵاوەکانی ئەو کات و شوێنەکانی تریش دەگرێتەوە یان نا. بەڵام هێنانە ئارای پرسیارگەلێکی پەیجوویانەی وەك ئەمانە خۆی بە مانای ئەوەیە کە ئێمەش هاتووینەتە نێو مەیدانی "تیۆری"یەوە و پراکتیکی دەکەین.

ئەم دوو نموونەیە لە تیۆری پیشاندەری ئەوەن کە تیۆری پێویستی بە کردەی زەینی هەیە:

شەنوکەوکردنی خواست، زمان و هتد، کە بیرۆکە باو و پەسەندکراوەکان دەکێشێتە نێو مەیدانی ململانێ (مەیدانی ئەوەی شتێکی سروشتی هەیە بە ناوی "جنس"، مەیدانی ئەوەی نیشانەکان ڕەنگدانەوەی واقیعێکی لەوەپێش هەبوو-ن.). لەم ڕێیەوە، مرۆڤ دنە دەدەن تا سەبارەت بەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی واندا لەوانەیە دەربارەی ئەدەبیات تێبفکرێ سەرلەنوێ بیر بکاتەوە. ئەم نموونانە هێز و وزەی وەگەڕخەری سەرەکیی ئەم تیۆرییانە دوایی دێننە بەرچاو، کە لە راستیدا هەر هەمان خستنە ژێر تیشکی ڕەخنەی تەواوی ئەو شتانەیە کە بە شتی سروشتی لە قەڵەم دەدرێن، سەلماندنی ئەو راستیە کە ئەو شتەی بە شتێکی سروشتی زانراوە یا ڕاگەیاندراوە لە راستیدا بەرهەمێکی مێژوویی و کولتوورییە. لە ڕێی هەندێ نموونەوە دەکرێ لەم رووداوە بگەین: کاتێك ئارتا فرانکلین لە سترانەکەیدا دەڵێ: "کارێك دەکەی وا هەست بکەم خۆم ژنێکی سروشتیم"، وێدەچێ خۆشحاڵە لەوەی کە هەڵسوکەوتی پیاوێك لەگەڵی، شوناسی جنسیی "سروشتیی" ئەویان سەلماندووە. بەڵام رستەبەندی ئەو، "کارێك دەکەی کە وا هەست بکەم وەك ژنێکی سروشتی وام" دەربڕی ئەو راستییەیە کە ئەم شوناسە بە ڕواڵەت سروشتی یان سەقامگیرە نەخش و نیگارێکی دەسکردی کولتوورییە، هۆکارێك کە لە نێو کولتووردا ساز و پەروەردەکراوە: ئەو "ژنێکی سروشتی" نییە بەڵام دەشێ کارێك بکرێ کە هەست بکات ژنێکی سروشتییە. ژنی سروشتی بەرهەمێکی کولتوورییە.

تیۆری کۆمەڵێك باسوخواسی وەك ئەمانە دێنێتە ئاراوە، ئایا پاراستنی ریزبەندی و بنکە کۆمەڵایەتییەکانی بە ڕواڵەت سروشتی و هەروەتر خووخدەی تێفکرینی کۆمەڵگایەك، بەرهەمی پێوەندیگەلی ئابووریی ژێرخانی و شەڕ و جەنگی لە سۆنگەی دەسەڵاتن، یان ئەوەی کە دیاردەگەلی ژیانی وشیارانە لەوانەیە بەهۆی وزەگەلێکی ناوشیار بێت، یان ئایا ئەو شتەی من یان سووژە (زەینی ناسکار) ناوی دەنێین لە سیستمەکانی زمان و کولتوور و لە ڕێگای ئەوانەوە بەدی دێت، یان ئەو شتەی ئێمە وەك "ئامادەبوون" "ئەسڵ" یان "ئەسڵی" ناوی دەنێین، لە نوسخەی بەدەڵەوە بەرهەم هاتبێت، ئەنجامی دووپات بوونەوەیە.

دەیجا، کەواتە، تیۆری چییە؟ چوار خاڵی سەرەکی تا ئەم شوێنە دیار کەوتوون.

1-تیۆری نێوان کۆرسێکی - گوتارییە کە لە دەرەوەی هەرێمی سەرەکیی خۆی کاریگەرە.

2-تیۆری لێکۆڵینەوەیی و گریمانەییە- هەوڵێکە بۆ ئەوەی ئەم راستییە بدۆزینەوە کە ئەو شتەی جنس یان زمان یان نڤیسان یان مانا یان سوژەی پێدەڵێن چی لەخۆ دەگرێ.

3-تیۆری ڕەخنەگرتنە لە عەقڵی باو، واتە ڕەخنەگرتن لە ئەو چەمکانەی کە وەك شتێکی سروشتی دێنە ئەژمار.

4-تیۆری شایانی تێڕامانە، تێفکرینە لە مەڕ تێفکرین، شەنوکەوکردنی ئەو بابەتانەیە کە بۆ سەرەندەر کردن لە شتەکان، لەمەڕ ئەدەبیات و لایەنەکانی تری گوتاری، بەکاریان دێنین.

لە ئاکامدا (دەکرێ بڵێین) تیۆری ترسهێنەرە. ئێمرۆکە یەکێك لە مەترسیدارترین تایبەتمەندییەکانی تیۆری ئەوەیە کە کۆتایی نییە. شتێك نییە کە بکرێ هەرگیز دەستی بەسەردا بگیرێ، کۆمەڵێك دەقی دەستنیشانکراو نییە کە بکرێ فێری ببی تا "تیۆری بزانی". باڕستایەکی بێ حەد و سنوورە لە نووسراوەی ئەو گەنج و بێ

قەرارانەی، سەبارەت بە رەخنەگرتن لەو چەمکە رێنوێنیکەرانەی کە گەورەترەکان ساز و پەروەردەیان کردووە، شتی پێ زیاد دەکەن و پەرە بە کاری بیرمەندانی نوێ لە هەرێمی تیۆریدا دەدەن و کاری بیرمەندانی کۆنتر کە لە بیرکراون سەر لە نوێ دەدۆزنەوە. کەواتە تیۆری سەرچاوەیەکە بۆ ئازاردان، سەرچاوەی ئیفادە لێدان و خۆ بە زل زانینی بەردەوام: "چی؟ لاکان —ت نەخوێندۆتەوە! چۆن دەتوانی باسی شیعری لیریك بکەی بێ ئەوەی سریشتی ئاوێنە ئاسای سووژەی بێژەر لە بەرچاو بگری؟" یا "چۆن دەتوانی سەبارەت بە رۆمانی سەردەمی ویکتۆریا شت بنووسی بێ ئەوەی شیکردنەوەی فۆکۆ سەبارەت بە ریزبەندی جنسی و هیستریك سازی جەستەی ژنان و سەلماندنی دەوری دەسەڵاتی ئیستیعمار لە سازدانی سوژەی دایك — شاری لە کاری گایاك ئسپیواك بە کاربێنی؟" جاری وایە تیۆری وەك حوکمێکی شەیتانی خۆ دەنوێنێ کە واتان لێدەکا دەقی ئەستەم لە بوارگەلی نائاشنادا بخوێننەوە، کە لەودا بە ئاکام گەیاندنی ئەرکێك پشوودانی بەدوادا نایات، بەڵکو ئەرکێکی ئەستەمی تر بە دوای خۆیدا دێنێ. (ئیسپیواك؟ باشە، بەڵام رەخنەی بنیتا پێری —ت لەسەر ئیسپیواك چی؟ خوێندووەتەوە؟")

مومکین نەبوونی پەیداکردنی دەسەڵات بەسەر تیۆریدا یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانی خۆراگرتن لە هەمبەر ئەودایە. هەر چەندەش پێتان وایە باش دەزانن، هیچ کات ناتوانن دڵنیابن کە ئایا "ناچارن لە خوێندنەوەی" ژان بودریار، میخائیل باختین، والتێر بێنامین، ئالین سیزو، سی. ئیل، ئار. جیمز، مێلانی کلاین، یا یولیا کریستوا یا دەتوانن بێ گوێ پێدان لە بیریان بکەن. (هەڵبەت ئەم مەسەلەیە پابەندە بەوەی ئێوە "کێ"—ن و دەتانەوێ کێ بن.) شکی تێدا نییە کە بەشێکی زۆری ئەو هەستی نەیارییە لەگەڵ تیۆری لەم راستییەوە سەرچاوە دەگرێ کە دانپیانان بە گرینگیی تیۆری واتە قبووڵ کردنی دەروەستییەکی بێ کۆتایی، خۆ خستنە ناو ئەو بارودۆخەوە کە تێیدا هەمیشە شتگەلێکی گرینگ هەیە کە نایزانن. بەڵام لە ژیان خۆیشیدا هەر ئەم دۆخە لە ئارادایە.

تیۆری ویستی دەسەڵات لە ئێوەدا دەورووژێنێ: هیواتان ئەوە دەبێ کە لە رێی خوێندنەوەی تیۆری دەستتان بە چەمکگەلێك رابگات کە بتوانن بە یارمەتی ئەوان ئەو دیاردانە رێکوپێك بکەن و تێیان بگەن کە پێوەندیان بە ئێوەوە هەبێ. بەڵام تیۆری ئەگەری دەسەڵات دەسرێتەوە، هۆیەکەشی تەنیا ئەوە نییە کە هەمیشە شتگەلێکی زیاتر هەیە کە دەشێ بزانرێ. بەڵام هۆیەکەی تری، کە وردتر و ژان هێنەرترە، ئەمەیە کە تیۆری خۆی واتە پرسیار کردن لە دەسکەوت و ئەو گریمانانەی کە دەسکەوتەکانی لەسەر دامەزراون. زاتی تیۆری بە خوری کردنەوەی رێسەکانە، چون گومان لە پێشەکی و گریمانەکان دەکا، لەو شتانەی کە پێتان وابوو دەیزانن، کەواتە کاریگەرێتی تیۆری قابیلی پێشبینی کردن نین. دەسەڵاتتان وە دەست نەهێناوە، بەڵام هەر لەو شوێنەشدا نین کە پێشتر بوون. بە شێوەیەکی نوێ بیر لە بابەتە خوێندراوەکانی خۆتان دەکەنەوە. کۆمەڵێك پرسیاری جۆراوجۆرتان هەیە کە بیهێننە ئاراوە، و لە مانای ناراستەوخۆی ئەو پرسیارانەی کە سەبارەت بە بابەتە خوێندراوەکانتان دێنە گۆرێ باشتر دەگەن.

ئەم پێناسەیە کورتە ئێوە بەسەر تیۆریدا زاڵ ناکات، هۆیەکەشی تەنیا ئەمە نییە کە زۆر کورتە،

بەلأم سەر دێڕی گرینگیی هێڵی فیكری و چوارچێوەكانی باسەكەتان بۆ دیاری دەكات، بە تایبەت ئەوانەی پێوەندییان بە ئەدەبیاتەوە هەیە. چەند نموونەیەك لەم لێكۆڵینەوانە لەم بابەتە كورتەدا بە دەستەوە دراون و بەو هیوایەی خوێنەران لە تیۆری وەك شتێكی خاوەن بەهاو سەرنجڕاكێش تێبگەن و دەرفەت بۆ چێشتنی زەڕڕەیەك لە مەزەكانی تێفكرین بە غەنیمەت بزانیبایە.

## پەراوێز

1–ناوەكانی دەقی سەرچاوە "لۆرا" و "مایكێل" بوون.

2–لە دەقی سەرچاوەدا "مێری" بوو.

## سەرچاوە

نظرية ادبي، معرفي بسيار مختصر، جاناتان كالر نشر مركز، 1382، تهران، صص 1–37.

# چاوەڕوانی

**خورخە لویس بورخیس**

**لە فارسییەوە: حەمە ڕەسووڵ حەسەن پوور**

تاکسی لە پێش ژمارە 4004ی شەقامی باکووری ڕۆژئاوای (بۆینێس ئایرێس) دایبەزاند. هێشتا کات نەگەیشتبۆ نۆی بەیانی. پیاوەکە بە دڵنیاییەوە، چنارە پیسەکان، چوارلای خاکی دەوروبەری هەرکام لەوان. خانووی کەشخە بە باڵکۆنی بچووکەوە، دەرمانخانەکەی پەنای و چوارچێوەی تاریکی پێشانگای ڕەنگ و کەلووپەل فرۆشییەکەی سەیر کرد.

لەولاتری شۆستەکەوە شوورەی دوور و درێژو بێ پەنجەرەی خەستەخانە بەرزبۆوە، لەولاترەوە تیشکی هەتاو بەسەر گوڵخانەکاندا بڵاودەبۆوە. پیاوەکە بە خۆیگوت: هەموو ئەم شتانە (کە ئێستا بە ویستی خۆیان و بە هەڵکەوت و بەبێ هیچ نیزامێکی دیاریکراون، وەك ئەو شتانەی لە خەودا دەیانبینم) بە تێپەڕینی زەمان، گەر خواوەند بیهەوێت هەر بە نەگۆڕی و ناچاری و ڕاهاتن دەمێننەوە.

لەسەر جامی دەرمانخانەکان بە پیتی کاشی نووسرابوو: بیرسلۆئیبر، جوولەکەکان، بەرە بەرە خەریکی دەرکردنی ئیتالیاییەکان بوون، کە (کرئۆل)ەکانیان وەدەرنابوو، واباشتر بوو، پیاوەکە واپێباشبوو لەگەڵ هاورەگەزەکانیدا هاموشۆی نەبێت.

شۆفێری تاکسییەکە یارمەتیدا تاکوو ساکەکەی دابەزێنێ، ئاخرەکەی ژنێك بە مرچ و مۆنی و ماندووییەوە دەرگای کردەوە. لێخورەکە لەسەر کوشنەکەی دراوێکی ئاسنی دایەوە بە مشتەرییەکەی. (بیست سەنتاووی ئۆرۆگۆیایی) کە شەوێ لە ئوتێلی (میلۆ)، بە سەری بردبوو لە گیرفانیدا مابۆوە. چل سانتیی دایە لێخورەکە و بیری کردەوە، دەبوو – بە چەشنێك هەڵسوکەوتم کردبایە کە هەموو فەرامۆشیانکردبایە. دوو هەڵەم کردن، "پووڵی ولاتێکی دیکەم داو دەرمخست گرینگی بەم هەڵەیە دەدەم".

بە دوای ژنەکەدا دالانی چوونە ژوورەوەی حەوشەکەیبڕی، ئەو هۆدەیەی بۆیان لەبەر چاوگرتبوو، خۆشبەختانە بەرەو رووی حەوشەی دووهەم دەکرایەوە. قەرەوێڵە ئاسنەکەی

ئاسنگەرەکان لە رواڵەتیان خستبوو، شتێکی سەیر و سەمەرەیان لێ پێکهێنابوو کە لقی داری مێوو لاولاویان دێنایەوە پێش چاو. لە هۆدەکەدا کەنتۆرێکی درێژی داری سنەوبەری لێبوو لەگەڵ مێزێکی تەختەدا، کەنتۆرێکی رێك دەگەڵ زەوی، پڕ لە کتێب و مێزێکی ئارایشت و لەگەنێك و دۆلکەیەکی ئاو، جێ سابوون و شووشەیەکی گەورەی بۆر و نەخشەیەکی دەورووبەری بۆینێس ئایرێس و وێنەیەکی عیسای لەخاچدراو، دیوارەکانی رازاندبۆوە. کاغەز دیوارییەکی رەنگ زریشکی بە تاوس کلك چەترییەوە بۆ رازاندنەوە. تەنیا دەرگای هۆدەکە بەرەو حەوشە دەکرایەوە و پێویست بوو کورسییەکان جێگۆڕکێ پێکرابان هەتا جێیەك بۆ جانتاکە بکرێتەوە.

خاوەن خانوو بە هەموو شتێك رازی بوو کاتێك ژنەکە ناوەکەی پرسی گوتی: ویلاری نەك وەك نارەزایی دەپرمینی بە دزییەوە و نەك بۆ سووکایەتی و بەکەم گرتنی بەڵام شتێکی هەستپێدەکرد بەڵکە لەبەرئەوەی ئەم ناوە ئازاری دەدا بۆیە نەدەکرا بیر لە ناوێکی دیکە بکاتەوە.

بە دڵنیاییەوە ئۆگری ئەم هەڵەیە ئەدەبییە نەبوو بوو کە وەرگرتنی ناوی نەیارەکەی دەتوانێت جۆرێك لە فێڵ و تەڵەکەی تێدا بێت.

لە پێشدا ئاغای ویلاری قەت ماڵی بە جێنەدەهێشت، پاش چەند حەوتوویەك عادەتی گرت ئێوارێ تاوێکی بچێتە دەرێ، شەوێکی چوو بۆ سینەمایەك کە سێ کۆڵان لەولاتر بوو، قەت لە پێشەوەی ریزی دوایی رۆنەدەنیشت، هەموو جارێ هێندێك پێش تەواوبوونی فلیم یان شانۆییەکە هەڵدەستاو دەرۆیشت. هەموو کاتێکیش سەیری چیرۆکی پیاو خراپەکانیدەکرد، بێشك ئەم چیرۆکانە هەڵەیان تێدا بەدی دەکرا، بەو وێنانەی کە لە بەسەرهاتی ژیانی ویشدا دەشیا بدۆزرێنەوە. ویلاری هەستی بەوانە نەکرد، چونکە بیرو بۆچوونی یەکسانی هونەرو شتی راستەقینە بۆی بێگانە بوو. بە راشکاوی تێدەکۆشا شتەکەی خۆشبوێن، دەیەویست پێشبینی بکات بە چ مەبەست گەلێك ئەم شتانەی نیشاندەدەن. بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی رۆمانیان خوێندوتەوە، قەت خۆی وەك کەسایەتییەکی چیرۆکەکان چاولێنەدەکرد. قەت نامەو تەنانەت بەیاننامەیەکی بە دەستنەگەیشت بەڵام بۆ هیوایەکی نادیار یەکێك لە بابەتەکانی رۆژنامەی دەخوێندەوە، لە ئاخری رۆژێدا یەکێك لە کورسییەکانی بە دەرگاکەیەوە دەناو لە کاتێکدا چاوی دەبڕییە ئەولاو ئەملای سەر دیواری بینایە چەند قاتییەکەی ڕووبەڕوویان، لێبڕاوانە (ماتە)کەی فڕ دەکرد. ساڵانی تەنیایی فێریانکردبوو کە رۆژەکان لەبیر و مێشکیدا وەك یەکبن، بەڵام لە بەندیخانە یان لە خەستەخانەشبێ تەنانەت رۆژێکیش نییە کە شتێك لە پڕێکدا روونەدات.

وەك بەندیخانەی تر، لەوێش تەسلیم بە وەسوەسەی ژماردنی رۆژ و سەعاتەکان بوو بوو. بەڵام ئەم بەندیخانەیە جیاواز بوو چونکە کۆتایی نەدەهات. مەگەر ئەوەی رۆژنامەیەکی بەیانی هەواڵی مردنی "ئەلیخاندرۆ ویلاری" رابگەیەنێت. هەروەها لەوانەبوو هیلاری تا ئێستا مردبێت و لەم کاتەدا ئەم ژیانە لە خەونێك بەدەر هیچی دیکە نەبێت. ئەمە نارەحەتی دەکرد، چونکی نەیدەتوانی بزانێ ئاسودەییە یان رۆژ رەشیە.

بە خۆیگوت: ئەمشێوە بیرکردنەوە نابەجێیە و گرینگی پێنەدا. لە رابوردوویەکی دووردا کە کەمتر لەبەر تێپەڕینی زەمانەوە دوور بوو هەتا بەهۆی دوو، یان سێ رووداوی لە بیرنەکراو. عەشقێکی بێباکانەو ئارەزووی شتی زۆریکردبوو.

ئەم ورە بەرزییە کە رقی پیاوان و عەشقی هێندێ ئافرەتی بزاوتبوو، ئیتر بە تەمای شتی تایبەتی نەبوو، تەنیا ئاواتی درێژە پێدانبوو. شەوانە تامی (ماتە) تامی توووتنی رەش، هێڵێکی درێژ و باریك و لێڵی لە حەوشەکەدا دەهاتە بەرچاوان کە بۆ بیانوو بەسبوو.

گەماڵێکی پیر لە ماڵەکە بوو و ویلاری لەگەڵیدا بوو بوو بە دۆست، بە زمانی ئیسپانیایی، ئیتالیایی و بە یارمەتی ئەو چەند وشەیەی کە لە کاتی منداڵیدا لە زاراوەی گوندی لە یادی مابوون لەگەڵی دەدوا. ویلاری تێدەکۆشا تەنیا لە زەمانی ئێستادا بژی بەبێ گەرانەوە بەرەو دواوە، یان پێشبینی کردنی داهاتوو، بەڵام یەکەمی کەمتر لە دووهەمی گرینگی بۆی هەبوو.

بیری کردەوە بە چەشنێکی نادیار هەستی پێکرد کە رابوردو هەویرێکە زەمانە دەگڵیدا، رێککەوتووە.

بەم هۆیەوە کە کاتی ئێستای بەبێ سێ و دوو لێکردن دەبێتە رابوردوو. هێندێ رۆژ تێکۆشانی رواڵەتی رازی بوونی بەخۆیەوە دەگرت، لە کاتێکی ئەوتۆدا هێندێك پێچراوەتر لە سەگەکە بوو. شەوێکی بریسکەیەکی توند، وەك ئەوەی کارەبا گرتبێتی لە ئاخیری ئەوکیدا، شەکەتی کرد و لە هەناسەدان کەوت.. ئەم کارە سامناکە لە پاش چەند چرکە دووپاتبۆوە. جارێکی نزیك بوولێڵەی بەیانی. سبەینەی ئەو رۆژە ویلاری بە دوای ماشێنێکی دا نارد کە لە پێش عەیادەی دوکتۆرێکی ددان لە ناحیەی "ئونسە" دایبەزاند، لەوێ ددانیان کێشا.

ئەو لەم تاقیکارییە دژوارەدا نەترسنۆکتر لە خەڵکی دیی بوو نە لەوانیش ئارامتر. شەوێکی دیی کاتی گەڕانەوە لە سینەما هەستیکرد یەکێك خۆی لێداوە، بە رق و قین و دڵدانەوەیەکی نادیار لە کابرای موزاحیمی روانی وجنێوێکی پیسی پێدا. کابرا ماتبوو، بە پتەپت داوای لێبوردنی لێکرد. پیاوێکی باڵابەرزی جوانکیلەی موورەش لەگەڵ ئافرەتێکی بە قیافە ئاڵمانی، ئەو شەوە ویلاری دووپاتیدەکردەوە کە ئەوانی نەناسیوە، بەم حاڵە هەتا چوارپێنج رۆژ دواتر لە ماڵ نەهاتەدەر. لە نێو کتێبی کەنتۆرێکدا کتێبی "کۆمیدی ئیلاهی" تێدا بوو بە شیکاری کۆنی (ئاندێر ئۆلی)، ویلاری زیاتر لەبەر هەست بە بەرپرسایەتیکردن تا کونپشکنی (کنجکاوی)، سەرگەرمی خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئەساسییە بوو. پێش ئەوەی نانی نیوەڕۆیی بخوات سروودێکی دەخوێندەوە لە پاشانیش بە سەرنجەوە یادداشتەکانی، سزاکانی دۆزەخی بە دوور لە راستی یان زێدەرۆیی نە دەژمارد و بیری نەدەکردەوە (دانتێ) ئەوی بە دوایین ئاڵقە تاوانبار دەکرد. ئەو جییەی ددانەکانی "ئۆگۆلینۆ" هەتا هەتایە پشت ملی (رۆجێری) دەجوون.

وا دەهاتە پێش چاوان تاوسەکانی کاغەز دیواری رەنگ زرشکییەکە بۆ خۆراکی خەونێکی بزوز تایبەتکراون، بەڵام ئاغای ویلاری قەت خەونی بە کەپرێکی سامناکەوە نەدیت کە لە باڵندەی زیندووی تێکەڵ و پێکەڵ دروستکرابێت. کاتی بەیانی یان خەونێکی دەدی کە سەر دێرەکەیان هەمیشە وەك یەك وابوون بەڵام کاتەکەیان فەرقی هەبوو.

دوو پیاو و هیلاری دەمانچەیەکیان بە دەستەوەیە، دەهاتنە ژوورێ، یان کاتی هاتنەدەر لە سینەما، هێرشیان بۆ دەبرد، یان دیسانەکە هەرسێك پێکەوە ئەو کابرا نەناسراوەبوون کە خویان لێدابوو، یان لە حەوشێدا بە خەمناکی چاوەڕوانیبوون و بە ڕواڵەت ئەویان نەدەناسی.

لە پاش خەون دیتنەکە، دەمانچەکەی لە چەکمەجەی مێزەکەدا هەڵدەگرت (لە راستیدا لەو جێیەی دەمانچەیەکی هەبوو) و تەقەی لە پیاوەکان دەکرد، بە دەنگی چەکەکە لە خەویٚ هەڵدەستا بەلاٚم قەت خەونێك بە تەنیٚ نەبوو، لە خەونێکی دیکەدا، هێرشەکە دیسان دووپات دەبۆوە و لە خەونێکی دیدا ئەو دەبوو دیسان بیانکوژیٚ.

لە بەیانییە تاریکی مانگی (ژووئیە)دا قوت بوونەوەی نەناسراوێك (نەوەك دەنگی دەرگاکردنەوە) لە خەویی راچڵەکاند. بالاٚ بەرزەکە لە تاریکاندا، لەو جێیەی بە چەشنێکی سەرسوڕهێنەر دیوە کە ساکار ببۆوە (لە خەونێکدا کە ئاکامی ترسانبوون) هەموو کات روونتر لەوەبوون، لەسەر هەستبوو بەبیٚ جووڵە و زۆر لەسەرخۆ و بە چاوی داچۆڕاوەوە دەتگوت قورسی چەکەکان خواریان کردۆتەوە "ئەلیخاندرۆ و ویلاری" و نەناسراوێك ئاخرەکەی پێیگەیشتبوون.

بە ئاماژەیەکەوە داوایلێکردن راوەستن و گەرایەوە بۆ لای دیوارەکە دەتگوت خەونەکەی سەرلەنویٚ بۆتەوە.

گەلۆ بەم شێوە هەڵسوکەوتیکرد تا بەزەیی ئەوانەی دەیانەویست بیکوژن، بجووڵێنیٚ، یان لەبەرئەوەی هەڵگرتنی ڕوداوێکی سامناك موشکیلەی کەمترە یان بیرلێکردنەوەو چاوەڕوانی بیٚ برانەوەو –یان – و لەوانەشە ئەمەیان قورستر بێت – بۆ ئەوەی پیاوکوژەکان خەونێك بن هەروەك ئەوەی زۆر جاران لەم جێیە و لەم سەعاتەدا خەون بوون؟

لەم کەش و هەوایە خەیاڵییەدا بوو کە تەقە ئەوی لە پیٚ خست.

## سەرچاوە

گۆڤاری جستوجو/ ل 36 تا 39/ ژمارە 149.

# پەشیمانی

Kate Chopin
لە ئینگلیزییەوە: بەختیار سابیر حەمە

مامزێل ئۆرێلی خاوەن لەش و لارێکی پتەو و دوو روومەتی ئالْ بوو، تەمەن ڕەنگێکی ماش و برنجیی بە رەنگە خورمایییەکەی قژی بەخشیبوو، چاوەکانی پڕ لە ئیرادەبوون. لە کێڵگەکەیدا شەپقەیەکی پیاوانەی لەسەر دەکرد و لە وەرزی سەرماشدا پاڵتۆیەکی کۆنی سەربازی رەنگ شینی لەبەردەکرد و هەندێك جاریش جوتێك پوتی درێژی لەپێ دەکرد. مامزێل ئۆرێلی هەرگیز بیری لە شوکردن نەکردبووەوە، هیچ کاتێکیش خۆشەویستی نەکردبوو. لە تەمەنی بیست ساڵیدا داواکاری هەبوو، بەڵام رەتیکردبووەوە و تاکو ئێستاش کە تەمەنی گەیشتۆتە پەنجا ساڵی هیچ کاتێك پەشیمان نەبۆتەوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو لەم گەردونەدا تەنها دەژیا و هیچ هاودەمێکی نەبوو جگە لە سەگەکەی کە ناوی (پۆنتۆ) بوو، چەند زنجییەك کە لە کوخەکانی ئەمدا دەژیان و لە کێڵگەکانیشیدا کاریان دەکرد، چەند مریشکێك و هەندێك مانگاو دوو هێستر و ئەو تفەنگەش (کە راوی ئەو بازانەی پێدەکرد کە مریشکەکانی دەخوارد) و هەروەها ئیمانەکەشی. بەیانییەکیان مامزێل ئۆرێلی لەبەر هەیوانەکەیدا وەستابوو، کەوتبووە دەریای بیرکردنەوەو پەنجەکانی لەسەر لێوەکانی دانابوو. لەناکاو چەند منداڵێکی وردیلە بەدەرکەوتن هەر وەك ئەوەی لە هەورەکانەوە باریبن. هاتنی ئەم منداڵانە شتێکی چاوەڕواننەکراو و جێی سەرسوڕمان بوو، لە هەمان کاتیشدا پێیخۆش نەبوو. منداڵی دراوسێ نزیکەکەی بوون کە ناوی ئۆدێلی بوو، لە راستیدا زۆریش نزیك نەبوو. نزیکەی پێنج دەقیقەیەك دەبوو ئەو ژنە گەنجە و چوار منداڵەکەی بەدەرکەوتبوون. ئیلۆدی کردبووە باوەشی و دەستی تی نۆمی گرتبوو بە دوای خۆیدا رایدەکێشا بە چەشنێك کە دیاربوو منداڵەکە پێیخۆش نەبوو، مارسیلێن و مارسیلێتیش بە هەنگاوە نارێکەکانیان دوای کەوتبوون. هێندە گریابوو چاوەکانی خوێنیان تێزابوو، پەشۆکاوییەکی زۆر بە رووخسارییەوە دیاربوو. لەلایەکەوە لە گوندەکەی دراوسێیانەوە جوابیان بۆ ناردبوو کە دایکی توشی نەخۆشییەکی کوشندە

هاتووه و زۆر هیلاکە، لە لایەکی ترەوە مێردەکەی لەویٚ نییە و چووە بۆ تێکساس کە بەلای ئەمەوە یەك ملیۆن میل دوور بوو، هەروەها ڤالسینیش بەخۆی و گالیسکەکەیەوە چاوەڕێی دەکرد تا بیبات بۆ وێستگەکە. "مامزێل ئۆرێلی، ئەمەوێت چاوێکت لەم منداڵانەوە بێت تا دەگەڕێمەوە. دڵنیابە هەر ڕێگەچارەیەکی ترم شك ببردایە، هەرگیز ئەم ئەرکەم نەدەخستە سەرشانی تۆ! وابزانە منداڵی خۆتن، ئاگات لێیان بێت من، لەویٚ، نازانم وەك شێتم لێهاتووە لە تاو منداڵەکان، لە تاو لیۆن کە لە ماڵ نییە و ڕەنگە ئەو دایکە هەژارەشم نەمابێت!".. هەر ئەم ئەگەرە ناخۆشەش بوو وای لە ئۆدێلی کردبوو کە بەو پەلە پروزێیە ئەو خێزانە نامورادە جێبێڵێت. ئۆدێلی منداڵەکانی لە ژێر سێبەری داڵانە تەسك و نزم و درێژکۆلەکەی خانووەکەدا جێهێشت. خۆرەکە دەیدا لە تەختە سپییە کۆنەکان، چەند مریشکێك لە بەردەم پلیکانەکاندا لە چیمەنەکەدا چینەیان دەکرد، یەکێکیان چاونەترسانە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتبوو، بە شانازی بەفیزەوە هەنگاوی دەناو بیٚ هیچ مەبەستێك بە هەیوانەکەدا دەهات و دەچوو. بۆنی خۆشی گوڵەکانی باخچەکە ئەو ناوەیان پڕکردبوو، دەنگی پێکەنینی زنجییەکان لەناو کێڵگە لۆکەکانەوە کە سەراپا گوڵی سپی بوو دەهاتە بەرگویٚ. مامزێل ئۆرێلی بە پێوە وەستاو بیری لە منداڵەکان دەکردەوە. بە چاوێکی ڕەخنەگرانە دەیڕوانییە مارسیلێن کە لە ژێر قورسایی ئیلۆدی قەڵەو و خرپندا لارەلار دەڕۆیشت و ڕەتی دەدا. بەهەمان چاو سەیرێکی مارسیلێتی کرد کە فرمێسکە بێدەنگەکانی تێکەڵ بە هەنسکەکانی تی نۆم کردبوو کە بە ئاسانی دەهاتنە بەرگویٚ. لە ماوەی ئەو چەند ساتە کەمەی بیرکردنەوەدا، بیر و هۆشی پەرش و بڵاوی کۆکردەوە و بڕیاریدا چاودێری منداڵەکان بکات وەك ئەرکێکی سەرشانی خۆی. سەرەتا دەستیکرد بە خواردن پێدانیان. ئەگەر ئەرکەکەی مامزێل ئۆرێلی وەك لەوێدا دەستی پێکرد هەر لەوێشدا کۆتایی پێبهاتایە، ئەوا بە ئاسانی دەتوانرا رایی بکرێن، چونکە چێشتخانەی ماڵەکەی بەشی ئەوە گەورەبوو کە لە بارودۆخێکی کتوپڕی لەم چەشنەدا بە کەڵکی بێت، بەڵام خۆ منداڵ بزەڵە بەراز نییە، پێویستی بە جۆرێك لە چاودێریکردن هەیە کە تەواو بەلای مامزێل ئۆرێلییەوە نامۆیە و ئەمیش هیچ منداڵێکی بەخێونەکردووە تا بتوانێت ئەو ئەرکە بەجێبهێنێت. لەچەند ڕۆژی یەکەمدا بەراستی هیلاك بوو بە دەست بەخێوکردنی منداڵەکانی ئۆرێلییەوە. ئاخر چۆن بیزانیبایە مارسیلێت هەر کاتێك بەدەنگی بەرز قسەی لەگەڵدا بکرێت دەستدەکات بە گریان؟ ئەمە یەکێك بوو لە سیفاتەکانی مارسیلێت. کاتێکیش بۆی دەرکەوت تیٚ نۆم زۆر حەزی لە گوڵە کە هەموو ئەو گوڵانەی هەڵکێشا کە هەڵبژاردەبوون و بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە چۆنییەتی پێکهاتەکەیان لە باخچەکەدا نێژرابوون. "هەر ئەوەندە بەس نییە پێی بڵێیت وامەکە، مامزێل ئۆرێلی" مارسیلێت پێی ووت، "بەڵکو دەبێت لەسەر کورسییەك بیبەستیتەوە. هەر کاتێك هاروهاجی بکردایە دایکم وای لێدەکرد، لەسەر کورسییەك دەیبەستەوە". ئەو کورسییەی کە مامزێل ئۆرێلی تی نۆمی لەسەر بەستەوە زۆر گەورە و مریح بوو، بۆیە سەرخەوێکی باشی تیا شکاند بە تایبەتی کە ئەو پاشنیوەڕۆیە تۆزێك گەرمیش بوو. دوای ئەوەی شەو داهات و مریشکەکانی کردە ناو کولانەکەوە، بە منداڵەکانی ووت کە بچنە ناو جێگاوە، بەڵام ئەوان وەك ئەوەی نە بایان دیبێت نە بۆران لە بەردەمیدا ڕەق ڕاوەستابوون. کوا جلە سپییەکانی شەویان کە

دەبوایە قوماشەکەی لە چەرچەڤ سەر پێخەفەکانیان بوایە و یەکێکیش بە توندی بۆیان بتەکێنێت تا وەك ئەو قامچییانەی دەکێشران بە گاکاندا شریخەیان لێوە بێت؟ ئەی کوا ئەو تەشتە ئاوەی کە دەبێت لە ناوەندی ژوورەکەدا دابنرێت و یەکەیەکە پێیە ماندوو و تۆزاوی و هەتاو بردووەکانیانی بە جوانی تیا بشۆن؟ مارسیلێن و مارسیلێت پڕ بە دڵ بەوە پێکەنین کە مامزێل ئۆرێلی وایدەزانی تی نۆم خەوی لێدەکەوێت ئەگەر چیرۆکی (*Croque-Mitaine*) یان چیرۆکی (*Loup-garou*) یا هەردووکیانی بۆ نەگێڕێتەوە. یان ئیلۆدی خەوی لێدەکەوێت ئەگەر راینەژەنیت یان گۆانی بۆ نەڵێیت. "حەزدەکەم باش بزانیت، پورە دوبی"، مامزێل ئۆرێلی بە بڕوابەخۆبونێکەوە بە چێشتلێنەرەکەیی ووت "بەلای منەوە بەڕێوەبردنی چەند کێڵگەیەك لە بەخێوکردنی چوار منداڵ ئاسانترە، بەڕاستی سەرئێشەیە! پورێ، هەرگیز جارێکی تر باسی منداڵم لا مەکە". "وا دیارە تۆ هیچ دەربارەی منداڵ نازانیت، مامزێل ئۆرێلی. من لە دوێنێوە بە ئاشکرا ئەو راستییەم بۆ دەرکەوتووە بەتایبەتی کاتێك بینیم منداڵەکان بە گورزە کلیلەکانی تۆ یاریان دەکرد، تۆ نازانیت ئەمە وا لە منداڵ دەکات بە کەللە رەقی گەورە بێت، یاریکردن بە کلیل؟ هەروەك چۆن سەیرکردنی ئاوێنەش وا لە منداڵ دەکات درەنگ ددانی دەربێت. پێویستە لە کاتی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵدا ئەم شتانە بزانێت. بە دڵنیاییەوە مامزێل ئۆرێلی هیچ ئاگای لەم زانیارییە دەگمەنانە نەبوو کە پورە روبی دەیزانی، ئاخر لە کاتی خۆیدا ئەم پێنج منداڵی پێگەیاندبوو، شەشیشی مردبوون. مامزێل ئۆرێلی زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کەمێك لەو فێڵانە فێربوو کە دایکان لە کاتی ئیش و کارو سەرقاڵیدا بەکاریدەهێنن. پەنجە شیلاوییەکانی تی نۆم کە لە سنگ و بەرۆکی مامزێل ئۆرێلی نەدەبوونەوە ناچاریان کرد ئەو بەرکۆشە سپیانە بخاتەوە بەردەست کە سالآنێك بوو بەکاری نەهێنابوون. هەروەها دەشبوو خۆی لەگەڵ ماچە تەڕەکانیدا ڕابهێنێت کە پڕ بوون لە سۆز و خۆشەویستی. قووتوی دەرزی و بەکرەکەی، کە زۆر بە کەمی بەکاریدەهێنا، لەسەر کەنتۆرەکە داگرت و لە شوێنێکی نزیکەدەستدا داینا بۆ دورینەوەی سەرقۆڵە دڕاوەکانی کراسەکان و پێوەکردنەوەی قۆپچە کەوتووەکان. چەند رۆژێکی پێچوو تا لەگەڵ ئەو پێکەنین و گریان و ژاوەژاوەدا راهات کە بەدرێژایی رۆژ لەناو ماڵەکەو لە دەوروبەری خانووەکەدا دەنگی دەدایەوە. ئەوە یەکەم شەو و دووەم شەو نەبوو کە بەو ئاسودەییە خەوی لێبکەوێت و جەستە گەرم و نەرمەکەی ئیلۆدی ساواش توند پێوەی بنوسێت و هەناسە گەرمەکانیشی وەك بای باڵی باڵندەیەك بیدات لە روومەتەکانی. لە کۆتایی هەفتەی دووەمدا مامزێل ئۆرێلی تەواو لەگەڵ ئەم شتانەدا راهات، چیتر گلەیی و گازندەی نەدەکرد. هەر لە کۆتایی ئەو هەفتەی دووەمەشدا بوو کە ئێوارەیەکیان مامزێل ئۆرێلی لە کاتێکدا سەیری ئەو پەچەیەی دەکرد کە مەڕومالآتەکەی تیا بەخێودەکرا چاوی بە گالیسکە شینەکەی ڤالسین کەوت لە رێگا سەرەکییەکە لایداو بەرەو رووی خانووەکەی ئەم هات. ئۆرێلی کە دایك و باوکی لە دوو رەگەزی جیاواز بوون، یەکێکیان سپی و ئەوی تریان رەش پێست بوو، بە قنجی و بە پەرۆشەوە لە تەنیشت خاوەن گالیسکەکەوە دانیشت بوو. کاتێك نزیك بوونەوە، دەموچاوە پانەکەی ژنە گەنجەکە وای دەردەخست کە گەڕانەوەکەی بۆ ماڵەوە شتێکی زۆر دڵخۆشکەر

بێت، بەڵام ئەم گەڕانەوە کتوپڕ و چاوەڕواننەکراوە مامزێــل ئــۆرێلی خســتە هاتوچــۆ و دڵــەراوکێوە. دەبوایــە منداڵــەکان کۆبووبونایەتــەوە. تــی نــۆم لــە کوێیە؟ لەبەر سێبەرەکە دەمی چەقۆکەیی خستبووە سەر بەردە هەسانەکە و خەریکی تیژکردنەوەی بوو. ئــەی مارســـیلین و مارســـیلێت؟ لـــە سوچـــێکی هەیوانەکـەدا خـەریکی بڕین و دروستکردنی جل و بـەرگ بـوون بـۆ بوکـە شوشـەکانیان. ئیلـۆدیش لـە باوەشــی مامزێـل ئـۆرێلی دا بـە ئیسـراحەت پـاڵی دابووەوە. کاتێك چاوی بە گالیسکە شینەکە کەوت یەکسەر ناسییەوە، زانی کە دایکی هێناوەتـەوە بۆ ماڵــەوە بۆیــە، لــە خۆشــییاندا قیژانــدی. خۆشــی و هـەراو هۆریاکـە تـەواو بوو، هـەموویان ڕۆیشـتنەوە. ئـەو سـاتەی ڕۆیشـتنەوە چ کـش و ماتییــەك ئـەو نـــاوەی داگرتبـــوو! مامزێـــل ئـــۆرێلی لەبـــەردەم هەیوانەکــەدا وەســتابوو، ســەیری دەکـرد و گـوێی هەڵخسـتبوو. چـیتر گالیسـکەکەی نـەبینی، ڕەنگـی سوری خۆرئاوابونەکە و تاریك و لێڵی ئەو ئێوارەیـە پێکـەوە تـەمێکی ڕەنـگ مۆریــان بەســەر کێڵگــە و ڕێگاوبانەکاندا ڕاخست و گالیسکەکەیان لەبەرچاو ونکـرد. ویـزە ویـز و تەقەتـەقی ویلـەکان خـامۆش بـــوون، بـــەڵام هێشـــتا بـــە ئاســـتەم زاق و زروقـــی منداڵـەکانی دەهاتـە بـەرگوێ کـە لـە خۆشـییەکی بـێ هاوتـادا بـوون. مامزێـل ئـۆرێلی ڕووی وەرگێـڕا و چـــووە نـــاو خانووەکـــەوە، ئـــیش و کـــارێکی زۆر چاوەڕێیان دەکرد، منداڵەکان لە پاش خۆیان پەرش و بڵاوییـــەکی خـــەمناکیان جێهێشـــت بـــوو، بـــەڵام مامزێـــل ئـــۆرێلی راســـتەوخۆ نەکەوتـــە ســـەر ڕێکخســـتنەوەی ماڵەکــە. لــە تەنیشــت مێزەکــەوە دانیشت، لەسەرخۆ چاوێکی گێڕا بە ژوورەکەدا کـە تـاریکی ئـەو ئێوارەیـە هێـواش هێـواش بەسـەریدا دەکشـا و لــە دەوری جەســتە تەنیاکــەی ئــەم قــوڵ دەبووەوە. سـەری خسـتە سـەر قۆڵـە ڕاست و چـەپ کراوەکـانی، دایـە قوڵپـەی گریـان. ئاخ، بەڵام چۆن گریانێـك! بـەو هێواشـییە نـا کـە زۆر جـار ژنـان دەگـرین. وەك پیـاو دەگریـا، هەنسـکی وای لەگەڵـدا بوو وا دەردەکـەوت کـە ڕۆحـی پارچـە پارچـە بکـات. هـــیچ ئاگـــای لـــەوە نـــەمابوو کـــە پۆنتـــۆ دەســـتی دەلێسێتەوە.

**سەرچاوە**

*Twenty Great American short stories*

# چاوانێکی وەکوو گڕ لەسەر شەپۆل

**هانس (ژان) ئارپ**

**لە فارسییەوە: ئەمین گەردیگلانی**

"هانس (ژان) ئارپ" وێنەگەر و پەیکەرساز و شاعیری ئالزاسی بە هەردوو زمانی ئاڵمانی و فەرانسەیی شیعری دەنووسی، کە لە بزاڤی دادائیسمدا دەورێکی سەرەکی و بەرچاوی هەبوو. ئەم بزاڤە لە (زووریخ) سەریهەڵدا، کە هەوڵەکانی ئارپ لەو بوارەدا حاشا هەڵنەگرە. بیری ئارپ ریشەی لە نەریتی رۆمانتیکی ئاڵمانی دابوو، ئەو عاشقی فەیلەسووفانێك وەك "زاکووب بۆهیم" بوو. دەیویست وشەگەلی رۆمانتیك و چیرۆکی پەریان و یەکگرتوویی ئینسان و سروشت بژێنێتەوە. هەر ئەو وشەگەلەن کە پاش گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بەشێوە و بیچمی ژیانەوەیەکی نوێوە لە شیعرەکانیدا سەرهەڵدەدەن. کە بە هۆی ریشەیی بوونی ئاوەزو گەشەکردنی هونەری و ئاڵۆزی پلۆزی زەینەوەیە. ئەو سەبارەت بە بەرهەمەکە خۆی ئاوا دەدوێ: "بەرهەمگەلێکی سیستماتیك و مسۆگەرن بە پێی یاسای رووداو. رووداوێك کە لە روانینی مندا شتێکە تاریف هەڵنەگرە و نەزمێکە کە تێگەیشتنی دژوارە و تەنانەت سروشتیش لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە." بە بڕوای ئارپ دادا لە قووڵترین حاڵەتی خۆیدا، بەر لەوەی رووخێنەر بێ، سازێنەرە "دادا سەرچاوەی سەرەکیی تەواوی هونەرەکانە و بە شوێن دۆزینەوەی "بێ ئاوەزخوازیی" (نا عقلانی گری هونەرییەوەیە. کە نابێ لەگەڵ نەبوونی فام و ئاوەز لێمان بشێوێ. دادا (ناعقل گر) بێ ئاوەزخوازە هەروەکو سروشت. بە پێچەوانەی هونەر لایەنگری سروشتە و وەکوو سروشت ساکار و روو راستە. بە شوێن جێ و ڕێ راستەقینەی شت گەل و دیاردەکاندا دەگەڕێ."

هونەری راستەقینە بە شوێن گۆڕینی دنیاوەیەو تاقەتی تامڵ کردنی ئەو ئەرکە قورسەی هەیە. ئەم نەریتە مرۆڤایەتی لەو شێتییە پڕ مەترسییە کە ناوی بێ ئیعتبارییە رزگار دەکا و ژیانی بۆ سادە و ساکار دەکاتەوە لە راستیدا یەکگرتوویییەکی قایم و پتەو لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا دەخوڵقێنێ.

ئاوەز، مرۆڤ بێ ڕیشە و رەگەز دەکات و ژیانێکی تراژیکی بەسەردا دەسەپێنێ. بەڵام هونەری راستەقینە و هونەری بێ خەوش سلامەتی بەخش و سروشتییە و دەهێڵێ ئەستێرەی ئاشتی و

عەشق و شیعر لە شەویٚ تاریکی دڵ و بیری مرۆڤدا بدرەوشێتەوە. هەر جێیەك هونەری راستەقینە رووی تێکا خەم ناچارە لەو شوێنە کۆچ بکا و بارگە و بنەی خۆڵەمێشیی خۆی کە پڕە لە داخ و خەم و خەفەت لەگەڵ خۆی ببا." پێکەوە چوار کورتە شیعر لەو شاعیرە دەخوێنینەوە.

1

چاوان وەك گڕ لەسەر شەپۆل
رەنگ و شێوەی خۆ دەگۆڕن،
بە تاسەی گەڕانەوە لە هەرێمی رۆژ.
بڵێسەکان بیٚ ناون و
یەکی پێنج قامکیان هەیە
ئەو دەستانە، باڵە ئاسمانییەکان
بە دڵۆڤانی دەلاوێنن.

2

هەوری رەش،
وەك زنجیری ئەستێران هەڵواسراون.
ئاسن چنگی قولاپینی لە دیواری لووس گیر دەکا.
وێنەی شاران لە نێو گڕدا هەڵدەچۆقین.
ماڵانیش بەسەرحەوت دەنکە یاقووتدا رادەکەن،
یان هەڵدەسووڕێن وەکوو گزمووڵە ئەڵماس.
گرمەی هەور لە هەناوی دیوارە دوورو درێژەکان دەهاڵیٚ.
پەرییەکانیش لە نێو رەواقی هەنگوینا دەتلێنەوە.
لە دەربەندی زەوییەوە،
کات نشینان رێگەی هەورازی سەرکەوتن دەگرنە بەر
خوار کات نشینانیش، بە دوای رەنگین و رازاوەوە سەریان قاڵە.
ئیسکلێتە شووشەییە چکۆڵەکان
لە نێو جیوە دێنە دەریٚ و
بۆ کردەوەی ئاژاوەی رۆژی ئەزەل دەبنە زایەڵە.
دارەمەیتی چکۆڵەی ئێمە لە ژێر ئەستێرانی سڕی بەیانیدا
کیٚ دەیتوانیٚ؟

3

لێوەکان، بەبیٚ دڵە خورپەی وشەیەك
وەدیار دەکەون.
وەکوو جوانێك لە نێو دڵی شەپۆلی رۆژانەوە.
تیشك باوەشی لە جوانیٚ وەردێنیٚ،
وەکوو گازەنگ، لە ژێر رێژنەی ماچ و مووچا.

4

باڵندەکانی شەوانە لەنتەری داییساویان بە چاوەوەیە
تاپۆی ئاسکیان لەسەر عەرابە هەڵچنیوەو
بە هێمنی بۆ پێشەوەی لێدەخوڕن.
عەڕابەی رەش، ئامادەی کوێستان
گازەنگی رەش، ئامادەی کوێستان
ئەسپەدارینەی بزۆزو رەشیش هەروا.
مەرگ، مشار و کۆلکەدار پێکەوە بەرەو بارەنداز رادەکێشیٚ.
دان، لە نێو جیکەڵدانی باڵندەدا
دەکەوێتە نێو گەرووی ئاسنینی خەرمانکووبەوە.
فریشتەکانیش، لەسەر دۆشەکی هەوایی ئۆقرە دەگرن و
ماسیەکانیش، داردەستی ریٚ بە دەستەوە
دەپێون رێگەی چوونەدەر لە ئەستێران.

**سەرچاوە**

ماهنامەی (کارنامە) شمارە 24 و 25 بهمن و اسفند 1380 سوجتەبا وەیسی

# گردگەلێك وەك فیلی سپی

ئێرنست هەمنگوەی

لە ئینگلیزییەوە: شاهۆ قادر خانزادە

گردەکان بە درێژایی دۆڵی ئیبرۆ درێژ و سپی بوون. لەملا نەسێبەر هەبوو نەدار. ویستگەکەش لە بەرخۆردا بوو لە نێوان دوو هێڵی شەمەندەفەر. کە نزیك لایەکی وێستگەکەش سێبەری گەرمی بالأخانەکە و پەردەیەك کە بە پەت و موورووی حەیزەران چنرابوو بە درێژایی دەرگا کراوەکەی مەیخانەکە هەڵواسرابوو بۆ ئەوەی مێش نەچێتە ناو. ئەمریکییەکە و کچەکەی کە لەگەڵیدا بوو لە پشت مێزەکەوە لە سێبەرا لە دەرەوەی بالأخانەکە دانیشتن. زۆر زۆر گەرم بوو وقیتارە ئیکسپریسەکە لە ماوەی چل خەولەکدا ئەهات. لەم وێستگەدا قیتارەکە بۆ ماوەی دوو خولەك وەستاو ئەنجا چوو بۆ مەدرید.

کچەکە کلأوەکەی داکەندبوو و لەسەر مێزەکە دابنابوو پرسی "چی بخۆینەوە؟"

پیاوەکە وتی "زۆر گەرمە."

"با بیرە بخۆینەوە."

پیاوەکە بەرەو رووی پەردەکە ووتی "دوو سێرڤێزاس."

ژنێك لە دەرگاکەوە پرسی "گەورە بێ؟"

"بەڵێ. دوو دانەی گەورە."

ژنەکە دوو پەرداخ بیرە و دوو ژێر دەستی هێنا. دوو پەرداخەکە و دوو ژێر دەستییەکەی لەسەر مێزەکە داناو سەیری پیاوەکە و کچەکەی کرد. کچەکە سەیری زنجیرە گردە دوورەکانی ئەکرد. لەبەر خۆردا گردەکان سپی بوون و دەشت و دەریش زەرد و ووشك بوو.

کچەکە ووتـی "ئەو گـردانە لە فیلی سپی ئەچن."

پیاوەکە بیرەکەی خواردەوە "هەرگیز یەك دانەیشم نەدیوە."

"نا، نەت دیوە."

پیاوەکە ووتی "لەوانەیە دیبێتم، هەر لەبەر ئەوەی کە ئەڵێیت نەمدیوە هیچ ناسەلمێنێ."

کچەکە سەیری پەردە موروو چنەکەی کرد و پرسی "شتێکیان لەسەر نووسیوە، ئایا چ واتایەکی هەیە؟"

"ئاینس دێل تۆرۆ. جۆرێك خواردنەوەیە."

"ئەکرێ تاقی بکەینەوە."

پیاوەکە بەرەو پەردەکە هاواری کرد "گوێ بگرە." ژنەکە لە مەیخانەکەوە هاتەدەر.

"چوار ریال."

"دوو دانە ئاینس دێل تۆرۆمان ئەوێ."

"لەگەڵ ئاودا؟"

"لەگەڵ ئاودا ئەتەوێ؟"

کچەکە ووتی "نازانم. لەگەڵ ئاودا باشە؟"

"زۆر باشە."

ژنەکە پرسی "لەگەڵ ئاودا ئەتانەوێ؟"

"بەڵێ لەگەڵ ئاودا."

کچەکە ئەنجا پەرداخەکەی دانا. ووتی "تامی لیکۆریس ئەدات."

"هەموو شتێك هەروایە."

کچەکە ووتی "بەڵێ. هەموو شتێك تامی لیکۆریس ئەدات. بەتایبەت هەموو ئەو شتانەی کە ئەو هەمووە چاوەڕێی بووی وەك ئابینس."

"ئاه، بەسە ئیتر."

کچەکە ووتی "تۆ دەستت پێ کرد. من دڵخۆش بووم و کاتێکی خۆشم هەبوو."

"باشە، با هەوڵ بدەین کاتێکی خۆشمان هەبێ."

"زۆر باشە. من هەوڵم ئەدا. من ووتم شاخەکان لە فیلی سپی ئەچن.

ئەوە دڵخۆشکەرنەبوو؟"

"دڵخۆشکەر بوو."

"ویستم ئەم خواردنەوە تازەیە تاقی کەمەوە. ئەوە هەموو ئەو شتەیە کە ئەنجامی ئەدەین، وانیە سەیری شت بکە و خواردنەوەی تازە تاقیکەرەوە؟"

"منیش وا گومان ئەکەم."

کچەکە سەیری گردەکانی کرد و وتی "ئەو گردانە دڵرفێنن. ئەوانە بەراستی لە فیلی سپی ئەچن. بەس مەبەستم ڕەنگی پێستیان بوو لە میانەی دارەکاندا."

"خواردنەوەیەکی تر بخۆینەوە؟"

"زۆر باشە."

با گەرمەکە پەردە مورووچنەکەی ئەدا لە مێزەکە.

پیاوەکە ووتی "بیرەکە خۆش و ساردە."

کچەکە وتی "دڵخۆشکەرە."

پیاوەکە وتی "ئەوە بەس کردارێکی نۆژداری زۆر سادەیە. لە ڕاستیدا ئەوە هەر کرداری نۆژداری نییە."

کچەکە سەیری ئەو شوێنەی کرد کە لاقەکانی مێزەکە لە سەری وەستابوون.

"من ئەزانم کە ئەوە بۆ تۆ گرنگ نیە ئەوە بە ڕاستی شتێك نیە. بەس ئەوەندە کە بهێڵن هەوا بچێتە ناو."

کچەکە قسەی نەکرد.

"لەگەڵ تۆدا دێم و لەگەڵیشتدا ئەمێنمەوە. کارێك ئەکەن کە هەوا بچێتە ناو و پاشان شتەکە زۆر ئاسایی ئەبێ."

"دوای ئەوە باش ئەبین هەروەك پێشتر چۆن بووین."

"چی وات لێ ئەکا وا بیر بکەیتەوە؟"

"ئەوە تەنیا شتێکە کە نیگەرانمان ئەکا. تەنیا شتێك کە ئێمە ناشاد ئەکات."

کچەکە سەیری پەردە مورووچنەکەی کرد. دەستی دەرهێناو دوو دانە لە ڕیشاڵە مورووەکانی گرت.

"تۆ وا بیر ئەکەیتەوە کە پاشان حاڵمان باش ئەبێ و شاد ئەبین."

"من ئەزانم وائەبین. پێویست ناکا بترسی. زۆر کەس ئەناسم کە ئەم کارەیان ئەنجام داوە."

کچەکە وتی "منیش کەسی وام ناسیوە. وە پاشان هەموو ئەوان شادبوون."

پیاوەکە وتی "باشە. ئەگەر ناتەوێ وا بکەی ناچارنیت. من ناچارت ناکەم وا بکەی ئەگەر خۆت نەتەوێ بەڵام ئەزانم ئەوە زۆر ئاسان ئەبێ."

"تۆ بە ڕاستی ئەتەوێ وا بکەی."

"وابیر ئەکەمەوە باشترین کار بێ. بەڵام من نامەوێ وا بکەی ئەگەر بەڕاستی ناتەوێ وا بکەی."

"ئەگەر ئەم کارە بکەم تۆ شاد ئەبیت و هەموو شتێك ئەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جاران و تۆیش حەزت لە من ئەبێ؟"

"ئێستاش حەزم لێتە. تۆ ئەزانی کە من حەزم لێتە."

"ئەزانم. بەڵام ئەگەر ئەو کارە بکەم، ئایا پاشان دووبارە خۆش ئەبێ و ئەگەر بڵێم شتەکان لە فیلی سپی ئەچن، تۆ پێت خۆش ئەبێ؟"

"زۆر خۆشم ئەوێ. هەر ئێستاش زۆر خۆشم ئەوێ بەڵام ئێستا ناتوانم بیری لێ بکەمەوە. ئەزانی چێم لێ دێ کاتێك کە نیگەران دەبم"

"ئەگەر ئەوە ئەنجام بدەم هەرگیز نیگەران نابی؟"

"نیگەران نابم. چونکە زۆر ئاسانە."

"کەوا بوو ئەنجامی ئەدەم. چونکە نیگەرانی خۆم نیم."

"مەبەستت چییە؟"

نیگەرانی خۆم نیم."

"بەڵام من نیگەرانی تۆم."

"ئاه، بەڵێ. بەڵام من نیگەرانی خۆم نیم. وە من ئەنجامی ئەدەم و پاشان هەموو شتێك باش ئەبێ."

"من نامەوێ وابکەی ئەگەر وا هەست ئەکەی."

کچەکە هەستایە سەر پێ و بەرەو کۆتایی وێستگەکە چوو. بە درێژایی ئەولای ترەوە کێڵگەی دانەوێڵە و بە درێژایی لێواری ئیبرۆیش دار هەبوو. زۆر لەولاتر، لەو بەر چەمەکەوە شاخ هەبوون. سێبەری هەورێك بە درێژایی کێڵگەی دانەوێڵە ڕۆیشت و کچەکە چۆمەکەی لە نێوان دارەکاندا بینی.

کچەکە ووتی "ئەمانتوانی هەموو ئەمەمان ببێ. وە ئەمانتوانی هەموو شتێکمان ببێ و هەموو ڕۆژێك دژوارتری ئەکەین."

"وتت چی؟"

"وتم ئەمانتوانی هەموو شتێکمان هەبێ."

"ئەتوانین هەموو شتێکمان هەبێ."

"نا، ناتوانین."

"ئەتوانین هەموو جیهانمان هەبێ."

"نا، ناتوانین."

"ئەتوانین بۆ هەموو جێیەك بچین."

"نا، ناتوانین، ئیتر هی ئێمە نییە."

"هی ئێمەیە."

"نا نییە. وە کاتێك کە لێیانساندێتەوە، هەرگیز بە دەستی ناهێنیتەوە."

"بەڵام لێیان نەسەندووینەتەوە."

"چاوەڕێ ئەبین و ئەیبینین."

پیاوەکە وتی "وەرەوە بۆ سێبەرەکە. تۆ نابێ وا هەست بکەی."

کچەکە وتی "من هیچ هەستێکم نییە. من بەس شتەکان ئەزانم."

"نامەوێ کارێك بکەی کە خۆت ناتەوێ بیکەی."

کچەکە وتی "نا باش نیە بۆ من. ئەزانم. ئەکرێ بیرەیەکی تر بخۆینەوە."

"باشە. بەڵام تۆ ئەبێ تێبگەی"

کچەکە وتی "تێئەگەم. ئەکرێ ئیتر قسە نەکەین؟"

لە پشت مێزەکەوە دانیشتن و کچەکە سەیری گردەکانی نزیك دۆڵەکەی ئەکرد کە نیوە ووشك ببوون و پیاوەکەیش سەیری کچەکەو مێزەکەی کرد.

پیاوەکە وتی "تۆ ئەبێ تێبگەی کە من نامەوێ وابکەی ئەگەر خۆت ناتەوێ. من بەیەکجاری ئامادەم تەواوی بکەم ئەگەر ئەوە بۆ تۆ واتایەکی هەیە."

"ئایا بۆ تۆ هیچ واتایەکی نیە؟ ئێمە ئەتوانین بەیەکەوە بسازێین."

"بێگومان واتایەکی هەیە. بەلاّم من کەسم ناوێ جگە لە تۆ. کەسیکەم ناوێ. وە ئەزانم ئەوە زۆر ئاسانە."

"بەڵێ، تۆ ئەزانی ئەوە یەکجار ئاسانە."

"بۆ تۆ زۆر باشە کە ئەوە بڵێیت، بەلاّم من ئەوە ئەزانم."

"ئەکرێ ئێستا ئیشێکم بۆ بکەی؟"

"هەموو ئیشێکت بۆ ئەکەم."

"تکایە تکایە تکایە تکایە تکایە تکایە تکایە ئەکرێ ئیتر قسە نەکەیت؟"

پیاوەکە قسەی نەکرد. بەلاّم سەیری جانتاکانی کرد کە لەپاڵ دیواری وێستگەکەدا بوون. بە جانتاکانەوە پارچە کاغەز هەبوو لە هەموو ئەو ئوتێلانەی کە شەوانێك تێیدا بوون.

پیاوەکە وتی "بەلاّم نامەوێ وا بکەی. لە بارەی ئەوەوە هیچ شتێك بۆ من گرنگ نییە."

کچەکە وتی "ئەقیژێنم."

ژنەکە لە پەردەکەوە هاتە دەر بە دوو پەرداخ بیرەوە کە لەسەر ژێر دەستییەکان کە تەڕ بوون داینا. ئەنجا وتی "قیتارەکە تا پێنج خولەکی تر دێت."

کچەکە پرسی "ئەو ژنە چی ووت؟"

"قیتارەکە تا پێنج خولەکی تر دێت."

کچەکە بە نیشانەی سوپاس بە شادییەوە بەدەم ژنەکەوە پێکەنی.

پیاوەکە وتی "باشتروایە جانتاکان ببەمە ئەوبەر وێستگەکەوە. کچەکەیش بە دەمیەوە پێکەنی.

"زۆر باشە. ئەنجا وەرگەڕێ با بیرەکەمان تەواو بکەین."

پیاوەکە دوو جانتا قورسەکەی هەڵگرد و لە پشت وێستگەکەوە بردنی بۆ هێڵەکەی تر.

سەیری هێڵەکەی کرد بەلاّم نەیتوانی قیتارەکە ببینێ.

گەڕایەوە و لە مەیخانەکەدا ڕێی کرد کە لەوێ خەڵك چاوەڕێی قیتارەکە بوون و خەریکی خواردنەوە بوون. ئاینسێکی لە مەیخانەکەدا خواردەوە و سەیری خەڵکەکەی کرد. هەموویان ماقوولانە چاوەڕێی قیتارەکە بوون. لە پەردە مووروووچنەکەوە چووە دەر. کچەکە لە پشت مێزەکە دانیشتبوو بەرەو ڕووی پیاوەکە پێکەنی.

پیاوەکە پرسی "باشتری."

کچەکە وتی "باشم. هیچ نیگەرانییەکم نییە. باشم."

### سەرچاوە


*Literature*

*Structure, sound, and Sense*

*Second Edition*

*Laurence Perrine*

*Southern Methodist University*

# ژیان چییه؟

ئێریش فرید

له ئه‌ڵمانییه‌وه‌: یاسین بانیخێلآنی

1

ژیان
گه‌رمایی ئه‌و ئاوه‌یه
له بانیۆکه‌ما
ژیان
ده‌ممه له‌سه‌ر سنگی
کراوه‌ت
ژیان
توڕه‌بوونه
له‌و ناهه‌قیانه‌ی وولآته‌که‌مان
گه‌رمایی ئاوه‌که به‌س نییه
ئه‌گه‌ر له ناویدا شڵپه‌م نه‌یه‌ت
ده‌مم له‌سه‌ر سینه‌ت به‌س نییه
ئه‌گه‌ر ماچی نه‌که‌م
توڕه‌بوون له‌و ناهه‌قیانه به‌س نییه
ئه‌گه‌ر ئێمه قوڵنه‌بینه‌وه و که‌مێك له دژی
کارنه‌که‌ین
ئا ئه‌مه‌یه
ژیان

2

گۆرانی شه‌و
له‌سه‌ر سنگت دوو ئه‌ستێره
له چاوه‌کانتا دوو ماچ
له‌شه‌ودا
له ژێر ئاسمانێکی بێلایه‌نه‌دا
له چاوه‌کانتا دوو ئه‌ستێره
له‌سه‌ر سنگت دوو ماچ
له‌شه‌ودا
له‌ژێر هه‌ورێکی بێ ده‌ما
ماچه‌کانمان و ئه‌ستێره‌کانمان
ده‌بێ به‌یه‌کتر بده‌ین
له ژێر هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی هه‌وای ئاسمانا
یا له ژوورێکا
که له خانوویه‌کایه
ڕه‌نگه له وولآتێکیشا بێ
کاتێ ئێمه ده‌بێ
خۆمان ببینه به‌ربه‌ست
به‌ڵێ، له‌کاتی پشووی هه‌ناسه‌دا

ئەوخۆ بەربەستکردنەی
سینەو چاو بۆ ئێمە
ئاسمان و ئەستێرە و ماچە

3

خەوبینین
لە شەودا مەرگ هات بۆلام
پێم گوت:
ئێستا نا
ئەو پرسی:
بۆ ئێستا نا؟
من نەمزانی وەڵامی بدەمەوە
سەری ڕاوەشاند و لەسەرخۆ گەڕایەوە
ناو ڕەشاییەکە
بۆ ئێستا نا؟
خۆشەویست
ئەزانی هیچ وەڵامێك نییە

4

ڕووداو
من بۆت دەنووسم، کە
هێشتا و بەردەوام خۆشم ئەوێی
من ئەنووسم
تۆم خۆش ئەوێ و
تۆ لێرەنیت
بەڵام منیش تەنها نیم
من لەلای خۆم دانیشتووم
خۆم ئەبینم
سەرم ئەلەقێ و دەستە بەهێزەکانم
کراوەن
ئارام ئەبمەوە و دڵخۆش ئەبم، کە
هێشتا لێرەم
من خۆشحاڵم، کە
هێشتا تەنیا نیم
کاتێ بۆتۆ ئەنووسم
من بیر ئەکەمەوەو
ئەبینم
لێرە نەماوم
بۆ لای تۆ هاتووم؟
ئیتر ناتوانم
بنووسم

### سەرچاوە

*Liebes gedichte – Erich Fried*

# پەردەیەك لە دەقی شانۆیی "مەكبێس"

## پەردەی سێهەم

ویلیام شێكسپیر

لە ئینگلیزییەوە: عەبدولخالق یەعقووبی

### دیمەنی یەكەم

(ژوورێكی نێو كۆشكی فۆرێس)

(بەنكوو دێتە ژووریٚ)

بەنكوو: تۆ هەنووكە هەم پادشای، هەم سپاسالار كودۆری، هەمیش دواجار سپاسالار گلامیزی، هەموویانی، هەر وەكوو چۆن ئەو ژنە جادووبازانە مژدەی ئەمەیان پێدابووی. بەلاّم زۆر لەوە دەترسم كە بۆ لە ئامێزگرتنی شان و شكۆمەندی شاهی دزێوترین كاری جیهانت كردبێت بەلاّم گوتیان پاشایەتی ناگاتە تیرە و تۆرەمەت، كەچی ئەمن دەبمە باب و باپیری زۆر لە شاهانی دوا رۆژی ئەم نیشتیمانە. جا گەر قسەی ڕاست و بەهەق لە زمانی ئەوانەوە دێتە دەریٚ (وەك چۆن ئەوەی سەبارەت بە تۆ گوتیان وە دی هات و وەك خۆر تیشك دەپڕژێنیٚ) و گەر لە هەق تۆدا چاكەیان نواندووە و قسەی راستییان دركاندووە، لە بۆچی تەتەڵەی چارەنووسی منیش نەخوێننەوە و هێڤی و ورەم پێنەبەخشن؟ ئیدی بەستە. بێدەنگ! وست بە!

(دەنگی شەیپوور. مەكبێس و خاتوو مەكبێس بە جلوبەرگی شاهانەوە لەگەڵ لێناكس و راس و گەورە پیاوان و دەستوپێوەند دێنە ژووریٚ).

مەكبێس: ئەوەتا مەزنترین میوانی ئێمە.

خاتوو مەكبێس: گەر ئەومان لەبیر كردبا، جێی لەم میوانداری و بەزمە گەورەیەدا هەر بە چۆڵی دەمایەوە و بەزمەكە ئەوە نەدەبوو كە شایانی ئێستایەتی.

مەكبێس: جەناب، ئیمشۆ خوانێكمان رازاندۆتەوە بەرفراوان و شكۆدار. داوا دەكەم لە هاورێیەتی خۆتان بیٚ بەشمان نەكەن.

بەنكوو: ئەمر، ئەمری جەنابتانە خاوەن شكۆ، كە ئەركی بە جێهێنانی ئەمری ئێوە هەتاهەتا بە ئێوەوەم گریٚ دەدات.

مەكبێس: ئایا ئەم دوا نیوەڕۆیە بەنیازن بچن بۆ مەیدانی سواری؟

بەنكوو: بەڵێ دەچم، ئەی خاوەن شكۆی خۆشەویست.

مەكبێس: دەنا وا دڵمان پێوە بوو كە ئیمڕۆكە لە بۆچوونی وردی ئێوە (كە هێشتاكانە هەم بەهێزە و هەم بە پێز) بۆ كۆڕی راوێژكاریمان بەهرەمەندبین. بەڵام ئەم كارە دوا دەخەین بۆ بەیانی. نیازی ڕێی دوورتان هەیە؟

بەنكوو: خاوەن شكۆ، ئەوەندەی هەر لە ئێستاوە تا دەمدەمانی ئێوارێ بگرێتەوە و ئەگەر هات و ئەسپەكەشم بە خێرایی نە ئاژۆێ ئەوە ناچارەكی دەشێت یەك یان دەنا دوو كاتژمێر لە تاریكایی شەو دەستەوام وەربگرم.

مەكبێس: بەزمی ئێمە لە یاد مەكەن.

بەنكوو: هەر لە یادمدا دەمێنێ، خاوەن شكۆ.

مەكبێس: وامان بیستووە كە گۆیا ئامۆزا خوێنڕێژەكانمان لە ئیرلەند و ئینگلیس داڵدە دراون لەولاشەوە لەبری ئەوەی دان بە كوشتنی دڵڕەقانەی باوكی خۆیاندا بنێن، لێرەو لەوێ گوێی خەڵكانیان لە قسە و دەنگۆی دەسهەڵبەستی بەدرۆ و عاجباتی ئاخنیوە. بەڵام ئەمەیان با بۆ سبەی بمێنێ كە هەنووكە تاوتوێكردنی كاروباری وڵات زۆر ئاتاجی بە هەڵوێستی هەر تكمانە. هەنووكە سوار بە و بە گوڕ ئەسپی خۆ باژۆ. ماڵت ئاوا تا شەو كە دەگەڕەیتەوە. فلیانسیش هاوڕێیەتی ئێوە دەكات؟

بەنكوو: بەڵێ، خاوەن شكۆی بەڕێز. كات گازمان لێدەكات بڕۆین.

مەكبێس: هێڤی خوازین ئەسپەكانتان هەمیشە چالاك و تیژڕەو و سمكۆڵ[1] بن. ئێوە دەسپێرە دەست پشتی ئەسپەكانتان. ماڵتان ئاوا. هەر كەسە و كاتی خۆی هەتا حەوتی شەوە. ئێمەش هەتا سەروبەندی خواردنی شێوە بەتاقی تەنێ دەمێنین تا باشتر و خۆشتر خێرهاتنی جڤاتی خۆ بكەین. تا ئەو كات خواتان لەگەڵ بێ.

(هەموو دەچنە دەرێ، مەكبێس و خزمەتكارێكی نەبێ.)

هۆی، هەتیوە، دا بزانە ئەو كەسانە هەر وا لەبەر دەرگانەمان راوێستاون؟

خزمەتكار: بەڵێ، بەڵێ خاوەن شكۆ، لەبەردەم دەروازەی كۆشك راوێستاون.

مەكبێس: دەبیانهێنە خزمەتمان (خزمەتكارەكە دەڕوات.) ژیان لە دۆخێكی وادا هیچ ناهێنێ مەگین لە ژێر سێبەری دڵنیاییدا. ترسی بەنكوو لە نێو دڵماندا هێلانەی چێكردووە. لە هەرێمی پاشایەتی سریشتیدا هێزێك دەسەڵاتی هەیە كە دەشێت زۆر لێی بترسێم، ئەویش ئازایەتی و بوێریی لە سنوور بەدەریەتی. وێڕای ئەو چاو نەترسییە خاوەن عەقڵ و ئاوەزێكە كە لە سەروبەندی ترس و تەنگانەدا دەستی دلێری دەگرێت و ڕێگای راستی نیشان دەدا. بە تەنێ هەر لەو ترس و ڕەدڵم دەنیشێ و فریشتەی پاسەوانی من تانە و تەشەری فریشتەی ئەو وەردەگرێ، هەر وەكوو چۆن فریشتەی مارك ئانتۆنی لە بەرامبەر فریشتەی قەیسەر ئاوابوو.

بۆ یەكەمجار كاتێ ئەو خوشكانە ناوی منیان بەشاهێتی زڕاند توند بە گژیان داهاتەوە و ئەمری پێكردن كە لە تەك ئەودا بدوێن. ئەو كات ئەوان كە هەر دەتگوت پێغەمبەرن و پێشگۆیی داهاتوو دەكەن بەناوی باوكی پشتێك لە پادشاكان ناویان هێناو ڕێزیان لێگرت. ئەوانە لە بان سەری من تاجێكیان دانا تا بڵێی بێ بەروبووم، گۆچانی دەسەڵاتێكی وەجاغ كوژاوەیان خستە دەستمەوە تا ئەو دەستەی كە لە تۆرەمەی من نییە دواجار لە

چنگمی دەربێنیٚ. کوڕی من جێم نەگرێتەوە. گەر ئاوا بێت، کەواتە من لە پێناوی کوڕانی بەنکوو ڕۆحی خۆم پیس کردووە و خوێنی ئەو دانکەنە نازدارەم ڕشتووە و ژەهری تاڵم کردۆتە پیاڵەی ئاسوودەیی خۆمەوە؟

تەنیا لە بۆ وانە کە من گەوهەری هەرمانی گیانی خۆم خستۆتە نێو چنگی دوژمنی مرۆڤ؟ تۆرەمەی بەنکوو پاشابن؟ قەت وانابیٚ، ئەی چارەنووس هەستە سەر پاو تا دواپشوو ئاوقام ببە!
—ئەوە کێیە؟

(خزمەتکارەکە لە تەك دوو پیاوکوژدا دەگەڕێتەوە.)

جاریٚ لەو دیو درگا بە تا بانگت دەکەین

(خزمەتکارەکە دەچێتە دەریٚ.)

دوێنیٚ نەبوو لەگەڵ یەکتر قسەمان کرد؟

پیاوکوژی یەکەم: بەڵیٚ، وابوو، خاوەن شکۆ!

مەکبێس: دەیجا ئێستا باش بیرتان لە قسەکانی من کردەوە؟ باش بزانن ئەوە ئەو بوو جاران تووشی چارەی ڕەش و بەختی بەدی دەکردن و ئێوە تاوانی ئەمەتان دەخستە سەر شانی ئێمە لە دوا دواندنمان ئەوەم ڕوون کردەوە، زۆر بە وردی، کە چۆن چۆنی ببوونە دارە دەستێك و هیچی دیکە، هەقتان پێشێل کرابوون و کام کەرەسە و کامە دەست لە گۆڕێدا بوون، سەدان شتی تر کە هەر بابایەکی عەقڵ سووك و گەمژەش ناچار ئەکات ئەم بڕیارە بداو بێژیٚ: "ئەمانە سەرومڕ کاری هیچ کەسیٚ نین غەیرەز بەنکوو."

پیاوکوژی یەکەم: ئێوە لەم ڕاستییە ئاگادارتان کردین.

مەکبێس: بەڵیٚ، ئاگادارتان دەکەم و زیاتریش. جا هەر بۆیە سەبارەت بەم باس و خواسە ئەوە دەبێتە دوو کەڕەت کە پێکەوە قسان دەکەین.

ئایا لە هەناوی خۆتان هێندە پیاوێکی سێبوورن لەم هەموو تاوان و گوناحە ببوورن؟ ئایا کووئێوە هێندە ئینجیل پەرستن، سەرەڕای ئەم زوڵم و زۆرە، بۆ چاکە هاتنە سەر ڕێیان دەرهەق بە میر خاسێکی وا و ڕۆڵەکانی لای خودا بپاڕێنەوە؟ دەرهەق بە ئەو کە بەو دەستە ستەمکارەی بۆ ئێوە گۆڕی ژینتانی هەڵکەندووە و ئەوەی بەدەست خزمەکانتانەوە بووە بۆ هەتا هەتا سەندووە؟

پیاوکوژی یەکەم: گەورەم، ئێمە هەر دوو مەردین.

مەکبێس: ئاگاو لێبیٚ ئێوەش لە دەفتەری سەرژمێریماندا وەکوو مەرد لە قەڵەم دەدرێن، وەك چۆن تاژی و سەگی دوڕڕە و ناڕەسەن و سەگ گورگیش هەموو هەر بە سەگ دێنە ئەژمار. بەلاّم لە پەرتووکی بەها بۆ دانان و ڕێزلێناندا حسێب حسێبێکی ترە بۆ چالاك و بۆ داوەشاو، بۆ کەسی خاوەن ئاوەز و کەسی لە ئاوەز دابڕاو، بۆسەی بەردرگا و سەگی ڕاو، بۆ هەر کامیان بەپێی ئەو توانایەی سریشتی دەهەندە لە هەناویانی داناوە، هەر لە نێو هەمان ڕەشەکدا کە ناوی هەموان بەیەك شێوە دەنووسن، شتێکی دیکە زیاد دەکەن.

بۆ ناوی مەردانیش هەر بە هەمان شێوە.

بەلاّم ئێوەش گەر لە پەرتووکی مەردایەتیدا جێگایەك بۆ خۆشك دەبەن، نە لە پیسترین جێگەدا، دەپێم بڵێن تا ئەرکێك بخەمە ئەستۆی دڵی ئێوە کە بەجێهێنانی ئەرکێکی لەمجۆرە دوژمن لەسەر ڕیٚ لادەبا و میهری ئێوە دەخاتە نێو دڵمانەوە، هەر ئەو دوژمنەی مانەوەی مایەی تاڵیی ژیانمانە و نەمانی سەرمایەی شیرینی گیانمانە.

پیاوکوژی دووهەم: خاوەن شکۆ، لالوتیی و ستەمی دنیا هێندەی وەزاڵە هێناوم کە هەرگیز ناترسم لەوەی لەگەڵی دەستەویەخەبم.

**پیاوکوژی یەکەم:** منیش لەگەڵ بەختی رەشا وا کەوتوومەتە ملانەو ستەم و زۆری زەمانەش وا تەنگی پێهەڵچنیوم کە ئامادەم ژیانی خۆم لە پێناوی هەر بەسەرهاتێکدا بخەمە تەنگانە کە یاساغی بکەمەوە یان لە چنگی دەربازببم.

**مەکبێس:** هەرتکتان دەبێ بزانن بەنکوو دوژمنی ئێوە بوو.

**پیاوکوژەکان پێکەوە:** ئەوە ڕاستە، خاوەنشکۆ.

**مەکبێس:** وەك چۆن دوژمنی منیش بوو، دوژمنێکی ئەوەندە زاڵم و خوێنرێژ کە هەر چرکەیەکی بوونی دەڵێی تیغێکە و دەماری ژینم دەبڕێ. جا ئەگەرچی دەستم دەڕوات لەسەر دەستی دەسەڵاتم، لەسەر پەڕەی چاوەکانم بیسڕمەوە و بە ڕاشکاوی خواستی خۆم بۆ ئەم کارە تەرخان بکەم، بەڵام لە سۆنگەی خاتری هەندێ کەسان کە هەم هاڤاڵی ئەون هەم هاڤاڵی من نابێ ئەم ئەرکە بخەمە سەر شانی خۆم، چونکی ناشێت خۆشەویستی ئەوان کەسان لە کیس بدەم، بەڵکو پێویستە بۆ خۆشم شین بگێڕم بۆ ئەو کەسەی کە هەر خۆم نەفەسی دەچنم. هەر لە بۆیە چاوی هیوام بڕیوەتە دەستی ئێوە لە سۆنگەی چەند هۆیەکی هەرە گرینگ ئەم کارەمان لە چاوی خەڵکان وەشارین.

**پیاو کوژی دووهەم:** خاوەن شکۆ، ئێمە گوێڕایەڵی ئەمری جەنابتانین.

**پیاوکوژی یەکەم:** هەتا دوا هەناسەی ژینمان..

**مەکبێس:** رۆحی مەردایەتی لە هەناوتاندا تێشکهاوێژە. هەر تا ئێستا و درەنگتر نا، پێتان دەڵێم لە کوێ بۆسە بنێنەوە تا شارەزای شوێنی شەڕ و پێکدادان بن، چۆن ئەم ئەرکە دەشێت ئیمشۆ هەر لە دەور و بەری کۆشك بە جێبێت و بڕێتەوە. لە بیرتان بێ، لێرەو لەوێ لەم ئاگرە نابێ تاقە پرێسکێ چییە وێم کەوێ. جا لە سۆنگەی ئەوەی نابێ قۆرت بکەوێتە ئەم کارە فلیانسی کوڕیشی کە هاوڕێیەتی و تیاچوونی بە قەد تیاچوونی باوکی خواستی دڵم بەجێدێنێ، دەشێت هەر لەو شەوە ئەنگوستە چاوەدا ئامێزی بۆ هەمان چارەنووسی باوکی بکاتەوە. جا هەر تکتان ورد بیری لێبکەنەوە و بڕیار بدەن پیاوی ئەم کارە هەن یان نا.

**پیاوکوژەکان پێکەوە:** خاوەن شکۆ! بڕیارمانداوە و ئامادەین.

**مەکبێس:** تاوێکی تر بانگتان دەکەم. لە نێو کۆشك بمێننەوە.

(دەچنە دەرێ.)

ئەم کارەش کۆتایی پێهات، کاکە بەنکوو. ئەگەر رۆحت بەنیەتە بەرەو بەهەشتی بەرینی خودا بفڕێ، ئەوە دەبێ ئیمشۆ نییەتی لێبێنێ.

(دەچێتە دەرێ.)

## دیمەنی دووهەم

(هەر ئەو شوێنە. ژوورێکی تر. خاتوو مەکبێس و خزمەتکارێك دێنە ژوورێ.)

**خاتوو مەکبێس:** بڵێی بەنکوو لە کۆشك چووبێتە دەرێ؟

**خزمەتکار:** بەڵێ، خاتوون، بەڵام بۆ شەو هەمیسان دەگەڕێتەوە.

**خاتوو مەکبێس:** بە جەنابی پاشا بێژە گەر بێت و ڕێگام پێبدات دەمەوێ لەگەڵی بدوێم.

**خزمەتکار:** بەسەر چاوان، خاتوونی من.

(دەچێتە دەرێ.)

**خاتوو مەکبێس:** نابەدڵ گەیشتن بە ئاواتی ژیان، یانی ئەوەی هەتە بیدەی بەڵام چت نەیەتە دەستان. مردن زیاتر پێتدەبەخشێ دڵنیایی تا ئەوەی وێرانکەر بیت و بژیت بە ترس و ڕاڕایی.

(مەکبێس دێتە ژوورێ.)

خاوەن شکۆ، ئێستا چۆنن؟ بۆچی لێمان تەریك کەوتووی و بە تەنێ لەگەڵ خەمهێنەرترین خەیاڵەکانت دانیشتووی. بۆ چ بەو بیر و یادانەوە سەرت قاڵە کە دەشێت دوا بە دوای ئەوانەی وا سەریان پێوەی قاڵە بارو بنەیان تێکەوە پێچابێت و کۆچی دواییان کردبێت؟ ئەو شتانەی چاریان نایات دەشێت فەرامۆش بکرێن و هێواش بخرێنە ئەو لاوە. ئەوەی دەبێ بکردرێ باش کراوە.

مەکبێس: ئێمە مارەکەمان بریندار کردووە، بەڵام خۆ نەمانکوشتووە. ئەو برینە دیسان سارێژ دەبێتەوە و ئەویش هەر خۆی دەبێتەوە بە ئەو کەسەی جاران بووە و هەر هەمان ددان و ژەهر هەمیسان بۆ خراپەی لەپێ کەوتوومان بۆسەی مەرگ دەنێتەوە. بەڵام دەبا جومگە بە جومگەی لەشی ئەم ژیانە لێکبترازێت و سەرلەبەری هەردوو دنیا تێکبڕووخێت! تا کەی بە دڵەڕاوکەوە نان بخۆین و بەدەم ئازاری دیتنی ئەو خەونە شوومانەی شەوان لەشمان دەخەنە هەڵچۆقان پاڵ بکەوین. تێکەڵبوون بە کاروانی مردووان، و ئەوانەی وا لە پێناوی ئاسوودەیی مەنزڵی خۆم بەرەو زێدی ئاسوودەیی بەڕێم کردن، باشترە لەو ژیانەی وا تێکەڵ بە ئەشکەنجەی رۆحە لەنێو پەشێواوییەکی بێ پایاندا، دانکەن وا لە نێو گۆڕی خۆیدا خەوتووە. چەندە خەوێکی خۆشە دوای تاو ویاوی پڕ لە زەنا زەنای ژیان! خەیانەت ئەوەی لە دەستی دەهات کردی! لەم ساتە بەدواوە ئیتر نە پۆلا کاری تێدەکا، نە ژەهری نێو دەستی پیلان، نەخراپەی خزم و خوێشان، نە لەشکری لە دوانەهاتووی دوژمنان. هەر هیچ شتێك.

خاتوو مەکبێس: خاوەن شکۆ، بە شقی خوا لەسەرەخۆبە هێندە مرومۆچ مەنوێنە. ئیمشەودەمت بەبزەبێ و میوان بە رووگەشی و سەرخۆشی بدوێنە.

مەکبێس: هەر وا دەکەم خۆشەویستم. بەڵام تکامە تۆش وا بی. بەنکووت هەر لە بەرچاوان بێ. بە چاو و بە زمان زۆر رێزی لێبنێ. لەم دنیا مەترسیهێنە دەبێ بە ئاوی رووبینی تۆزی تەوێڵی شەرەف بشۆریتەوە و روخساری خۆت بکەیتە دەمامکی دڵ تا ئەو رازەی تێیدایە بیشاریتەوە.

خاتوو مەکبێس: لە کۆڵ ئەم هزرانە بەوە.

مەکبێس: ئەی هاوسەری خۆشەویستم، (لەبەرئەم هزرە) سەرم بۆتە ماڵ و مەکۆی دووپشکان. خۆ دەزانێ بەنکوو و کوڕەکەی هەردوو زیت و زیندوون.

خاتوو مەکبێس: (ئەمە ڕاستە)، بەڵام سروشت ژینی هەرمانی بۆ دەستەبەر نەکردوون.

مەکبێس: تا ئەو کاتەی لەبەر دەستن، هیوای ئێمە نابڕێتەوە بۆ سەرکەوتن. بۆیە نابێ خۆشی لە خۆی بتۆرێنی کە بەر لەوەی بە ئێواران شەمشەمە کوێرە دەرکەون و سیسرکی باڵ پووڵەکاوی لە پاش گازی خێوی بەدکاری هەتایی، زەنگۆڵەی دەم بە باوێشکی شەوی تاریك بە سیڕەی خەوهێنی دەنگی، هێور بزرنگێنێتەوە، کارێك دەکرێ کە تەل بە تەلی دڵ بلەرێنێتەوە.

خاتوو مەکبێس: بڕیارە چ کارێك بکرێ؟

مەکبێس: باری گوناهی پێزانینی ئەم نهێنییە بە کۆڵتدا مەدە، کە گەرهات و ئەم کارە جێبەجێ بکرێ پەسەندی دەکەی دەسبەجێ. وەرە، ئەی شەو چاو بەستی پڕ لە گزی هەتا سۆمای چاوی میهرەبانی رۆژی خودان بەزەیی بدزی و بەو دەستە نادیارانەت کە خوێن لە پەنجەیان دەتکێ هەودای ئەو ژیانە هەڵوەشێنێتەوە کە هەر لەوانە رۆژێك بە پیلانی پشتم بشکێ. تاریکایی پێستی رووناکی هەڵدەدرێ و قاژوو بەرەو لای چنارستان هەڵدەفڕێ.

چاكە خوازانی رۆژ پرزەیان لێدەبڕێ و شەكەت خەو دەیانباتەوە هەتا بەیان، خراپەكارانی شەوی ئەنگوستە چاو بەدوای نێچیری خۆیاندا ڕوو دەكەنە نێچیرگەیان. سەرت سووڕماوە لە قسەم. بەڵام تكایە ئارام بە. ئەو شتەی بە ماكی خراپە چێ بكرێ هەر بەتین و تاوی خراپەش پێ دەگرێ. كەواتە تكایە با پێكەوە بڕۆین.

## دیمەنی سێهەم

(هەر ئەو شوێنە. شەقامێك بە نێو جەنگەڵدا تێدەپەڕێ و دەگاتەوە بەردەم كۆشك.)

(سێ پیاوكوژەكە دێنە ژوورێ.)

پیاوكوژی یەكەم: كێ بە تۆی گوت تێكەڵ بە دەستەی ئێمە بیت؟

پیاوكوژی سێهەم: مەكبێس گوتی.

پیاوكوژی دووهەم: نابێ بە چاوی گومانی خراپەوە سەیری بكەین، چونكی ئەو پیاوێكی وایە كە هەرگیز درێغی ناكا لە گوتنی ئەو شتانە بەراستی پێویستە بیكەین.

پیاوكوژی یەكەم: كەواتە با هاوڕێمان بیت. هێشتا تۆزە تیشكێكی رۆژ بە ئاسمانی خۆرنشینەوە دیارە. مسافیری درەنگ كەوتوو بەدەم مامزە لێدانەوە بە پەلە تێی دەتەقێنێ تا وەختی خۆی بگاتە مسافیرخانە. ئەوە بەلەز لێمان نیزیك دەبێتەوە ئەو بابایەی ئێمە ئاوا بۆسەمان بۆناوەتە.

پیاوكوژی سێهەم: گوێتان لێیە! دەنگی سمكۆڵانی ئەسپە.

بەنكوو (لەدوورەوە): هۆیدا زوو چرایەك بێنن!

پیاوكوژی دووهەم: ڕاست خۆیەتی، ئەوان میوانانی دیكە كە ناویان لە پێرستدا بوو هەموویان ها لە نێو كۆشكان.

پیاوكوژی یەكەم: خەریكن ئەسپەكان نەرم دەگەڕێنن (تا ئارەقیان ویشك بێتەوە.)

پیاوكوژی سێهەم: ئەویش وەك خەڵكانی دیكە مایلێكی مابێ بۆ كۆشك دادەبەزێ و هەتاكو بەردەم دەروازە بە پێیان ئەم ڕێیە دەبڕێ.

(بەنكوو و فلیانس مەشخەڵ بەدەست دێنە ژوورێ.)

پیاوكوژی دووهەم: چرا! چرا!

پیاوكوژی سێهەم: ڕێك خۆیەتی.

پیاوكوژی یەكەم: خۆ ڕێكخەن و دەسپێبكەن.

بەنكوو: پێدەچێ ئیمشەو بە نیاز بێ بباریێ.

پیاوكوژی یەكەم: بابباریێ.

(پیاوكوژی یەكەم هەرا دەكاتە سەر مەشخەڵەكە و ئەوانی تر دەڕژێنە سەر بەنكوو).

بەنكوو: ئای، خەیانەت! هەڵێ كوڕم، فلیانسی خۆشەویستم، هەڵێ، هەڵێ! دەبێ تۆ تۆڵەم بستێنی. ئای نامەردی بەكرێ گیراو!

(بەنكوو دەمرێ. فلیانس دەرباز دەبێت.)

پیاوكوژی سێهەم: ئەوە كێ بوو مەشخەڵەكەی كوژاندەوە.

پیاوكوژی یەكەم: ئێستا ڕێگاچارە چییە؟

پیاوكوژی سێهەم: مرخەمان لەوەیان بڕی. بەڵام كوڕەكەی دەرباز بوو.

پیاوكوژی دووهەم: نیوەی بەكەڵكتری ئەركی سەرشانمان لەدەس دەرچوو.

پیاوكوژی یەكەم: دەبا بچین و پێی بێژین چیمان كرد و چیمان نەكرد.

## دیمەنی چوارەم

(هۆڵێكی نێو كۆشك)

(ئاهەنگی میوانی. مەكبێس و خاتوو مەكبێس و ڕاس و لێناكس و گەورە پیاوان و دەستوپێوەند دێنەژوورێ.)

مەكبێس: هەموو بەجێی خۆ دەزانن. ئێستا تكایە دانیشن. لە گەورەوە هەتا بچووك لە دڵەوە خێرهاتنتا عەرز دەكەم.

گەورە پیاوان: گەلێ سپاس، خاوەن شكۆ.

مەكبێس: ئێمە خۆمان لەگەڵ ئێوە دادەنیشین تا خاكەڕایانە ببینە میواندار. بەڵام خاتوونی خانەخوێ لە شوێنی شاهانەی خۆیان دەمێننەوە و بەوەختی خۆی داوا دەكەین خێرهاتنتان عەرزبكات.

خاتوو مەكبێس: گەورەم لەلایەن منەوە خێرهاتن عەرزی هاوڕێیانی خۆ بكەن، لەو سۆنگەیەوە كە دڵم دەڵێ گەلێ بەخێرهاتن.

(پیاوكوژی یەكەم دێتە بەر دەرگا.)

مەكبێس: باش بزانە ئەوانیش لە تەهی دڵەوە سپاسبێژی تۆنە. ئەمبەر ئەوبەری مێز بەرامبەر دانیشتوون. من لێرە لە نێوانتاندا دادەنیشم. لە خواردن و رابواردن درێغ مەكەن با تا زووە جامێك شەراب بە دەوری ئەم مێزەدا سووڕێك لێ بدات.

(بەرەو درگاكە دەڕوات و بە پیاوكوژەكە دەڵێ:

خوێن دەموچاوی سواغ داوی.

پیاوكوژ: ئەم خوێنە خوێنی بەنكووە.

مەكبێس: گەر بەروخساری تۆوە بێت باشترە لەوەی لە دەماری ئەو پیاوە دا بگەڕێت. پێم بڵێ نەفەست چنی؟

پیاو كوژ: گۆشاو گۆش سەریمان بڕی، هەڵبەت لەسەر دەستی ئەمن.

مەكبێس: بژی، بژی، ئەتۆ باشترین پیاوكوژی. بەڵام ئەو كەسەش هەر باشە كە ئائەم كارەی دەرهەق بە فلیانسی كوڕیشی كردبێت. گەر تۆ ئەم كارەت كردبێ، ئەوە دیسان دەیسەلمێنی پیاوكوژێكی هەرە باشی.

پیاوكوژ: خاوەن شكۆی هەرە مەزن، فلیانسی كوڕی لە چنگن دەربازبوو.

مەكبێس: ئاخ كە دیسان بەڵاو بەدی ڕووم تێدەكەن، (ئاخ بەختی شووم) گەر وا نەبا، چەندە ڕێكوپێك و بێ گرێوگۆڵ دەبووم، ساف و لووس وەك بەردی مەڕمەڕ، قورس و قایم وەك زەردوماە، وێڵ و ئازاد وەكوو هەوا. بەڵام هەنووكە نێچیرم، پێ لە نێو كۆت و زنجیرم، لە نێو زیندانی گومان و وەهم و سامی سەرەڕۆدا بێ دەسەڵات و یەخسیرم. خۆ لە مەڕ مەرگی بەنكوو خاترمان جەم بێ؟

پیاوكوژ: بەڵێ. خاوەن شكۆی بەڕێز، ئێستا ئەو بە دڵنیایی كەوتۆتە چاڵاوێكەوە و سەری بیست برینی كاری هەڵگرتووە كە هەر سووكترین برینی مەرگ هێن و گیان ستێنە.

مەكبێس: سپاس بۆ تۆ كاكی برا، ماری گەورە تۆ پێندرا، بەڵام خۆ ئەو بەچكە مارەی دەرباز بووە، ئەگەرچی هێشتا ددانی نەهاتووە، كەچی لە سۆنگەی سریشتی، دەشێ رۆژێ ژەهری خۆیمان پێ بڕێژێ. ئێستا برۆ تا بەیانی كەسەر لەنوێ قسەی لەسەر دەكەینەوە.

(پیاوكوژەكە دەچێتە دەرێ.)

خاتوو مەكبێس: گەورەی خودان تاج و تەختم، پێكی سەرخۆشی ناگێڕن. خۆ لە میوانی نان و سفرە نافرۆشن. خێرهێنانی میوان دەشێ نەبڕێتەوە. میوانی بێ خێرهێنانی میوان نابێتە میوانی. نان خواردنی ناوماڵی خۆت باشترە لە خواردنی ئەو میوانییەی كە قەت تێیدا دەستووری خواردنی كەباب بەجێ نایات میوانیی بێ داب و دەستوور بێبەری لە تاموچێژە.

مەكبێس: ئەرێ ئەی وەبیر هێنەرەوەی قسەخۆش! ئەوەی دەیخۆن نۆشتان بێ نۆش، لەسەر دەستی ئیشتیای زۆر و لەشی بێ وەی!

لێناكس: خاوەن شكۆ. نافەرموون لامان دانیشن؟

مەکبێس: ئەگەر بەنکووی خۆشەویستیش لێرە بوایە، لە نێو کۆڕی گەورە پیاوانی وڵاتدا جێگای هیچکەس چۆڵ نەدەما.

(تاپۆی بەنکوو دێتە ژووریّ و دەچێت لەسەر جێی مەکبێس دادەنیشیّ.)

من دەخوازم ئامادەنەبوونی بەنکوو بۆ ئەم کۆڕە وەکوو نامیهرەبانی ئەو چاو لێبکەم، نەك وەك ڕووداوێکی ناخۆش.

راس: گەورەم، دیارە ئامادەنەبوونی بەنکوو لە سۆنگەی بەجێنەهێنانی بەڵێنە. خاوەن شکۆ داخۆ بە هاونشینیی خۆی سەربەرزیمان پێدەبەخشیّ؟

مەکبێس: جێیەکی چۆڵ بۆ دانیشتن بەدی ناکەم.

لێناکس: ئەوەتا ئەم جێیە چۆڵە.

مەکبێس: لە کویّ؟ کوانیّ؟

لێناکس: ئەوەتانیّ، خاوەن شکۆی میهرەبانم، بۆ چ پێدەچیّ پەشۆکاوبن؟

مەکبێس: ئەوە کاری کێهاتانە؟

گەورەپیاوان: کام کار گەورەم؟

مەکبێس: نەڵێی ئەوە کاری منە. پۆپەی خوێناویتم بۆ مەجووڵێنەوە.

راس: برایان تکایە رابن. خاوەن شکۆ وێدەچیّ حاڵی باش نەبیّ.

خاتوو مەکبێس: تکایە دانیشن هاوڕێیانی هێژا. خاوەن شکۆمان گەلیّ جار ئەم حاڵەیان بە سەردا دیّ، هەر لەو رۆژانەوە جوان و جحێڵ بووە تاکو ئێستا. تکا دەکەم دابنیشن. چرکەیەکە و کۆتایی دێت. هێندەی پێناچیّ دیسان دێتەوە سەرخۆ. تا زیاتر چاوی تێبڕن زیاتر ئازاری دەدەن و ژانی زیاتر دەخایەنیّ. تکایە بە خواردنەوە خەریك بن و ڕووتانی لیّ وەربگێڕن.. باشە من بە تۆ بێژم پیاو؟

مەکبێس: بەڵیّ بە من دەڵێن پیاو و پیاوێکی واش کە چاو دەبڕێتە ئەو شتانەی ئیبلیسیش ناوێریّ چاویان تێبڕیّ!

خاتوو مەکبێس: ئەوەی دەیڵێی هەمووی هەڵیت و پەڵیتە! ئەم خەیاڵە زادەی دەستی ترسی تۆیە ئەمە هەر ئەو خەنجەرە خەیاڵکردەیە کە پێتوابوو وەك نیگارێك لە حەوا هەڵواسراوە و بەرەو دانکەن راتدەکێشیّ. ئەم ترس و دڵە راوکانە کە وێناچن ترسێکی ڕاستەقانی بن حیکایەتی گویّ ئاگردانی ژنێکن کە بۆ دایە گەورەی دەیانگێڕێتەوە، و ئەویش باوەڕیان پێدێنیّ. گەلیّ عەیب و شوورەیییە! بۆچی روخسارت سەد رەنگی پێدەگۆڕی؟ ئێستا کە هەموو شتێك براوەتەوە بۆچی وا چاوت لەم کورسییە بڕیوە؟

مەکبێس: تۆ خودا بڕوانە، چاولێکە، بنۆڕە! ها! دەپێم بێژە دەڵێی چی؟ باشە من چیم دەسەڵاتە لە کاتێکدا ئەتۆ توانای ئەوەت نییە سەرێك بجووڵێنیتەوە و تۆزێك قسانم بۆ بکەی؟ گەر بڕیارە گۆڕخانەکان بە خاك ئەسپاردراوەکانی ئامێزیان بنێرنەوە، بلاّچینە دووی باڵندان ببێتە گۆڕخانەی ئێمە.

(تاپۆکە دەرەوێتەوە.)

خاتوو مەکبێس: شێتی پیاوەتیتی بە جاریّ زایەکرد.

مەکبێس: ئەگەر ئەوە منم لێرە راوەستاوم، ئەوە هەر ئەوم بینی بە هەر تك چاوم.

خاتوو مەکبێس: وە بڕۆ چەندە شوورەییە.

مەکبێس: جاران چیها جۆگەلەیان هەڵنەدەبەست لە خوێنی خەڵکی بیّ تاوان، سالانی زوو، بەرلەوەی دابی ئینسانی خەسڵەتی ئینسانی ببەخشیّ بە رۆحی مرۆڤەکان. لەویّ بە دواش چیها شەڕ و کوشتوبڕیان وەڕیّ نەخست، کوشتوبڕی

هێندە سامناک ژنەفتنی بۆ گوێ تاقەت پڕووکێنە. ڕۆژ و ڕۆژگارانێک بوو کە مێشکی مرۆڤێکیان دەپژاند، ئەوە مرۆڤە دەمرد و هەموو شتێک دەبڕایەوە. بەڵام هەنووکە مردووان گەر بیست برینی کاریش لەسەریاندا بێ دیسان لە گۆڕ ڕاست دەبنەوە و ئاوا ڕاماندەچڵەکێنن. زیندووبوونەوەی مردووان، سەیرو سەمەرەترە لە کوشتوبڕیان.

خاتوو مەکبێس: ئەی خاوەن شکۆی بەڕێزم، وا هاوڕێیانی هێژاتان جێی ئێوە لە نێو خۆیاندا چۆڵ دەبینن.

مەکبێس: ئای کە هەر ئاگام لێ نەبوو. هاوڕێیانی هەرە هێژا، تکا دەکەم سەرتان لە من سووڕ نەمێنێ. دەستەویەخەی نەخۆشینێکی زۆر سەیرم کە خزم و کەس هەموو لێی ئاگادارن و دەزانن نەخۆشنێکی ئەوتۆش نییە. دە فەرموون دەی، سەری خۆش و تەنی ساغتان بە نسیب بێ! ئەوا ئەمنیش دانیشتم. ئاپیاڵەیەکی سەرڕێژم بدەنە دەست. بە خۆشیی ئەوەی لێرەیە و بە خۆشیی هاڤاڵی ئازیزیشمان بەنکوو کە هەنووکە لێرە نییە و جێی سەوز بێت.

(تاپۆکە دەگەڕێتەوە.)

دەخۆینەوە بەخۆشیی ئێوەو هەمووان، با بخۆینەوە هەموو بەخۆشیی یەکتر.

گەورە پیاوان: گوێ لە مستی خاوەن شکۆین. بە نۆشی گیانتان بێ بەنۆش.

مەکبێس: بڕۆ، بڕۆ! لەبەرچاوم لاچۆ و بڕۆ! دەبا خاک بتشارێتەوە! ئێسکت پووکە و خوێنت ساردە، چاوانی دەرپەڕیویشت بەتاڵن لە هەر مانایەک.

خاتوو مەکبێس: هاوڕێیانی خۆشەویستم، پێتان وا نەبێ ئەمانە شتێکی سەیر و سەمەرە و نائاساییـن، نا، هیچ نین، ئەوەندە نەبێ ڕابواردنی ئەمشۆمانی تێکداوە.

مەکبێس: جەنگاوەر لە من دلێرتر بەدی ناکەی. وەرە پێشێ وەکوو ورچی زەبەلاحی ئەسڵە رووسی، وەکوو بەرازی زرێ پۆش، وەکوو بەوری هیرکانیا[2] (***Hyrcan***)، لە هەر بەرگێکدا دەخوازی لێم وەرە پێش جگە لەمە. دڵم هەرگیز بەم شتانە داناخورپێ. دەنا دیسان زیندوو بەوەو لە بیابانێکی کاکی بە کاکیدا بەشیرت وەرە بۆ جەنگم. گەر بە حاڵ دڵم داخورپیا، پێم مەڵێ مەرد و بێژە پاڵەوان فس فس. لاچۆ سێبەری سامناک! لێم دوورکەوە.

(تاپۆکە دەڕەوێتەوە.)

چەندە خۆشە هەر ئەوەندەی لێرە بڕوات دیسان دەبمەوە بە ئینسان. تکاتان لێدەکەم جارێ هەر دانیشن.

خاتوو مەکبێس: خۆشیمانت زایەکرد و ئەم دیدارە خۆشەمان لە سۆنگەی هاتو هاوار و بگرە و بەردەی تۆ لێ بوو بە هیچ.

مەکبێس: چۆن دەبێ شتی وا هەبن هەر وەکوو هەوری هاوینان لە کتوپڕ بێن و ئاسمانی گیانمان داپۆشن و نوقمی سەر سووڕمانی نەکات؟ سەر سووڕماوم لە حاڵی ئێوە مانان و لە حاڵی خۆم کە لە سۆنگەی دیتنی دیمەنێکی وا چۆن لە ترسان ڕەنگ بە ڕوومەوە نەماوە، کەچی ئێوە کوڵمەتان ئەوەندە سوورە هەر دەڵێی خوێنی تێزاوە.

راس: خاوەن شکۆ، کامە دیمەن؟

خاتوو مەکبێس: خوداتان لێ دێنمە تکا شتێک مەڵێن حاڵی پێی پەشۆکاوتر بێ، هەنووکە پرسیار قەڵس و تووڕەی دەکات. دەیجا، شەو خۆش. چاوەڕێی بەجێهێنانی دابی ماڵاوایی مەبن، هەتا درەنگ نەبووە بڕۆن.

لێناکس: شەوتان خۆش بێ، هیوادارین خاوەن شکۆ چاك ببنەوە.

خاتوو مەکبێس: شەوێکی خۆش بۆ گشت لاتان.

(گەورە پیاوان و دەستوپێوەند دەچنە دەرێ.)

مەکبێس: خوێنی دەوێ. دەڵێن خوێن هەر خوێنی دەوێ. دەڵێن گۆیا بەرد لە جێگای خۆی جووڵاوە و درەخت زمانی گەڕاوە و ئەوانەی فاڵ دەگرنەوە لە سۆنگەی فڕینی قاژ و قاژی و قشقەرەکان نهێنی و رازی پیاوێکی خوێنرێژیان لە هەرا داوە. چەند بەتڵی شەو تێپەڕیوە؟

خاتوو مەکبێس: جەنگەی شەڕ و پێکدادانی شەو و سپێدەی بەیانە، بە جۆرێك کە هەر نازانی کامیان نییە و کامەیانە.

مەکبێس: لەوەی مەکداف خۆی پاراستووە ببێتە میوانی کۆڕی مەزنمان چی تێدەگەی؟

خاتوو مەکبێس: داخۆ گەورەم کەسێکی وات بە دووی مەکدافدا ناردووە تا بە پێی و شوێنی ئەم هەواڵەوە بچێ؟

مەکبێس: هەواڵێکم هەر پێ دەگات لێرە و لەوێ. دەبێ کەسێکیشی بەدوودا بنێرم. بۆ ماڵ بە ماڵی هەموویان سیخوڕێکم هەناردووە. سبەی دەبێ سەرێك لە خوشکانی جادووباز هەڵێنم، دەمدەمانی بەرەبەیان. دەشێ زێترم پێ بێژن، چونکی من چیتر ناخوازم لە خراپترین رێگەوە خراپترین باسوخواسان ببیسمەوە. لە هەمبەر خواستەکانمدا، ئەوەی لەمپەڕ و بەربەستە دەشێ لاچن. وا رۆحی خۆم لە زێی خوێنا هەڵکێشاوە کە پاشگەز بوونم هێندەی بەرەو پێش چوونم توانایی ئەستێن و تاقەت پڕووکێنە. هەوای سەیرم لەسەر دایە کە بێ سێ و دوو لێکردن دەشێ بگەنە دەستم و دەسبەجێ بیانخەمە گەڕ.

خاتوو مەکبێس: ئەوەی ئێستا نیتە و پێویستت پێیەتی هەوێنی ئاسوودەیی گیان، تۆزێك خەوە.

مەکبێس: وەرە با بچین بخەوین. سامی سەیر و ترسی وەهم خولقێنی من سام و ترسی ئەو پیاوە بێ ئەزموونەیە کە دەبێ ئەرکی ئەزموونێکی ئەستەم بخرێتە ئەستۆی. لە راستیدا ئێمە هێشتا تازەکارین.

(دەچنە دەرێ.)

## دیمەنی ( پێنجەم )

(دەرکەلان. گرمەی هەورە تریشقە دێ. سێ خوشکە جادووبازەکە دێنە ژوورێ بۆ دیداری هێکات (خێوی هەرمان)).

جادووبازی یەکەم: ئەرێ ئەوە چییە هێکات؟ وێدەچێ تووڕە و تۆسن بی.

هیکات: ئەرێ نابێ رقم هەستێ لە داخی تۆ، بەدی بەدکار؟

ئەتۆ دێوی دزێوی ناڕەسەن، بێئابڕووی لاسار

بەبێ من چی نهێنی مەرگە بۆ مەکبێس دەدرکێنی

بەسەودایەکی وا سوودێکی باشی لێ وەدەس دێنی

ئەدی کوانێ بەشی خێوی خودایان خێوی هەرمانت؟

بڵێ چی بێبەشی سەردەستەیی جادووگەرانی ژیر و لێزانت؟

ئەوە کێ شاندەری رێگەی هونەر، رێبازی مەزنی بێ؟

لە کاتێکدا بە جادوو دەس بەکاری گیان ستێنی بێ

ئەوەی ناخۆشە پێمو بێگومان عەینی ژەهرتاڵە

کەوا سەرتان بە کاروباری ئەو نامەردەوە قاڵە

وەکوو خەڵکانی دیکە خۆبەزلزان و لەخۆبایی

که هەر قازانجی خۆی زۆر پیێ گرینگە و پێی دەکا شایی

دەسا ئێستا بڕۆن و تا زووە چۆڵی بکەن ئێرە

هەنووکە کاتی کاروبارە وەختی دیکە زۆر دێرە

لە کن جۆی دۆزەخستان[3]، و بەیان ئەو کاتە خۆر هەڵدیێ

لە بۆ دیداری من مەکبێس هەمیسان هەر بەلەز هەڵدیێ

هەتا بێت و بپرسیێ چارەنووسی نادیاری خۆ

لەبۆیەچیێ بکەن ئێوەش نزاوئەسپایی‌کاری خۆ

ئەوە ئیمشۆ ئەمن ڕێم دوورە، مەنزڵیێ تەشقی ئاسمانم

کەوا ئەرکێکی شووم و مەرگ هێن کەوتۆتە سەر شانم

ئەوەندە کارێکی سەرسووڕهێن و سەیرە وەسفی ناگونجیێ

دەبیێ پێشنیوەڕۆ کۆتایی پێبێنم لە هەر جێبیێ

تنۆکێکە هەمووی ئەفسوون بە سووچی مانگە ئاوێزان

کە پێویستە وەچنگی خەم هەتا نەڕژیێ لەسەر عەرزان

بە جادوو سیحری وای لێکەم لە ژین مەرگی تەمەننا بیێ

بەهێزی وەهمی ئەو سیحرە دەروونی گشتی پووکا بیێ

لە مەرگ و چارەنووسی ژین بە چاوی سووک بڕوانیێ

فڕێی دا عەقڵیێ و ترس و هەست و خواستی بەرزی ئینسانیێ

ئەوەی دوژمنترینی دوژمنانی جۆری ئینسانە

دەزانن، خەونی ئارامی و خەیاڵی ژینی بێژانە

(دەنگی سترانێك لەناوەوە: هەڵزنە، هەڵزنە، ..)

تەماشا! وا پەریلانم لەسەر ئەو هەورە وەستاوە

بەسترانی دەبێژیێ زۆر لە مێژە چاوەڕێم ماوە

(دەچێتە دەریێ.)

جادووبازی یەکەم: دەبا زووکەین، دەبا زووکەین، هێندەی پیێ ناچیێ دێتەوە.

(دەچنەدەریێ.)

## دیمەنی شەشەم

(شوێنێکی ئیسکاتلەند.)

(لێناکس و یەکێکی تر لە گەورە پیاوان دێنە ژووریێ.)

لێناکس: گوتەکانی پێشینی من لەگەڵیێ بیرو هزری ئێوە ڕێك پێکەوە دەگونجێن و لەوانەشە سنووری بۆچوونی ئێوە فراوانتر بکاتەوە. من چ ناڵێم جگە لەوەی دیارە شتی سەیر سەیر و سەرسووڕهێنەر ڕوویانداوە. مەکبێس بۆ دانکەنی بەڕێز و خۆشەویست شین دەگێڕیێ و شیوەن دەکا، سەد مەخابن کە ئەو گیانی ئەسپاردووە[4]. ئەدی بەنکوو مەردی بەراستی دلێر و پیاوی بوێر کە تا شەو درەنگانیێ لە گەڕان بووە. گەر دڵیشتان پێوەیەتی ئەوە بۆتان هەیە بڵێن فلیانسی کوڕی کوشتی. لە بۆچی؟ چونکە فلیانس ڕای کردووە. ئەم ڕاستییەش کوانیێ حاشا هەڵدەگریێ کە مەلکۆلم و دانلبین چەندە کارێکی سامناکیان کردووە کە ئەو باوکە نازدارەی خۆیان کوشتووە؟ غەززەبی خوا بتانگریێ! مەکبێس لە سوێی مەرگی چ گەرمە

شینێکی گێڕا! مەگین هەر ئەو نەبوو کە وا توورەیی ورق غیرەتی هێنایە جۆش و ئەو دوو نامەردە روورەشەی کە وا عەبدی عارەق و خوماری خەو بوون بە شیری ئەنجن ئەنجن کرد؟ کاری چ جوامێرانە بوو! بەڵێ، بەڵام ژیرانە و عاقڵانەش بوو! چونکی کامە دڵی زیندوو لە ڕقان نەدەهاتە کوڵ گەر بیستبای ئەم پیاوانە حاشا لەو کارەیان دەکەن؟ بۆیە دەڵێم، ئەوەی ئەو کردوونی هەموو ڕێکوپێک و باش و بەجێن. پێشم وایە گەر کوڕانی دانکەن دەکەوتنە چنگی وی –کە خوا نەکا شتی وا بێ– تێی دەگەیاندن باوک کوشتن یانی چی، وەک چۆن لە فلیانسی گەیاند! با واز لەم قسانە بێنین. ئەرێ دەڵێن گۆیا مەکدافیش لە سۆنگەی قسەی ڕەق و ئامادە نەبوونی لە بەزمی میوانیی ئەو زاڵمە پیس ڕقی لێ هەڵگیراوە. ئێوەی بەڕێز پێدەزانن پەنای بۆ کام لا بردووە؟

گەورە پیاو: کوڕی دانکەن، کە ئەم زاڵمە مافی میراتی باوکی لێ خواردووە، لە دەرباری ئینگلیسەو وا ئێدواردی[5] خاوەن باوەڕ و خوداناس هێند بە ئامێزێکی پڕ بەزەیی بەرەو پیری چووە کە خراپەخوازیی بەختیش بایی مسقاڵێک لە شان و شکۆی وی کەم نەکردووە. مەکدافیش هەر ڕێگای ئەوێی گرتۆتە بەر تا لەو پاشا پیرۆزە ئەوە بخوازێ کە سیواردی جەنگاوەر و نۆرتمبەرلەند (*Northumberland*) بۆ یارمەتی ئەو بنێرێ تا لەسەر دەستی ئەوان و بە پشتیوانیی خوای مەزن کارێک بکەن کە وا دیسان خوانی ڕەنگین بۆ ماڵان و خەوی شیرین بۆ چاوان بگەڕێنەوە، چیتر چەقۆی خوێناوی لەسەر سفرەکانمان نەمێنێ، کە ئەگەر سەر دەکەینە بەردەبازی ڕێی فیداکاری بابێ رووبینی و ڕیا بێ، گەریش سەرفیرازی بەرگێکە و بە بەژنمانی دەبڕن بابە ئازادی و ڕەوا بێ. ئەم دەسکەوتانەن هەنووکە ئاخیان بۆ هەڵدەکێشین و مەخابنیان بۆ دەبێژین. ئەم هەواڵە شای وا شپرزە کردووە کە بڕیاری شەڕ و پێکدادانی داوە.

لێناکس: کەسێکی بەدوای مەکدافدا هەناردووە؟

گەورە پیاو: بەڵێ، کاتێک ڕاسپاردە ئەم وەڵامەی بۆ یەکەمجار و دوایین جار لێ ببیسێ کە: "نا، نا، من ئەو پیاوە نیم!" نێو چاوانی تێکدەنێت و لەبەرخۆیەوە بۆڵەی دێت. وەکوو بڵێی بەخۆی دەڵێ: "ڕۆژێک دێت و لەم نا، نا –یەت پیس پەژیوان دەبیتەوە."

لێناکس: سەد خۆزگە ئەم ئاماژەیە سووکە ترسێکی خستبایە دڵیەوە و ئەوەندەی عەقڵی پێ دەشکێ خۆی لەو زاڵمە ببوێرێ. بریا فریشتەی ڕەحمەتی خودای مەزن بەرەو دەرباری ئینگلیس باڵ بگرێت و پەیغامی وی بەر لە گەیشتنی بگەیەنێتە جێ تا ئەم نیشتمانە بەڵا لێدراوە کە ئەسیری چنگی ئەهریمەنە هێندەی پێنەچێ سەر لە نۆ بەختەوەری و ئاسوودەیی بگرێتەوە ئامێزی خۆ.

گەورە پیاو: ئەوە دوعای خێری خۆمی دەنێرمەڕێ.

(دەچنە دەرێ)

## پەراوێزەکان

1–سمکۆد: سم گەورە، پەسنی ئەسپی ڕەسەنە (هەنبانە بۆرینەی هەژار، ل 419)

2-ئەم وشەیە لە وشەی یۆنانیی *Hyrcania* وەرگیراوە بە مانای ولأتی گۆرگانە (مازندەران) لە کەنار زەریای خەزەر کە بەوری بەناوبانگی بووە و لە زمانی فارسیدا "بەوری مازندەران" دەستەواژەیەکی باوە.

3-*the pit of acheron*، مەبەست دۆزەخە. ئاچرۆن چەمێکە بە دۆزەخدا تێدەپەڕێ و کەس ناتوانێ دووجاری پێدا بڕوات.

4-سەرنجی خوێنەر رادەکێشم بۆ ئەو شـێوە لێـدوانە تەوساوییەی لێناکس لەمەڕ مەکبێس کە لە دوو توێی رستەکانیدا خۆی حەشارداوە. وەرگێڕ

5-*Edward*، پاشای ئینگلستان (1042-1066).

## سەرچاوە


*Macbeth*
*By William shakespear*
*Edited by Kenneth Muir*
*The Arden Shakespear, Methuen, London*
*Pp 57-76*

# دیموکراسی و عەقلانیەت

## چاوپێکەوتن لەگەڵ د. عەبدولکەریم سروش

لە ئینگلیزییەوە: هادی محمد

*د. سروش، حەزدەکەم قسە بکەین لەسەر کێشەی "عەقلانیەت ***Rationality***"، بەڕێزت دەتوانیت دەست پێبکەیت بە ئاماژەدان بەو تەفسیرە جیاوازانەی کە دەربارەی عەقلانیەت کراوە و هەروەها تەفسیری هەڵبژێردراوی خۆت ڕوونبکەرەوە، ئەو کاتە دەتوانین لێرەوە چاوپێکەوتنەکەمان درێژەپێبدەین.؟

**-با سەرەتا بڵێم کە نازانم مەبەستت چییە لە عەقڵ *Reason* یان عەقڵانیەت و ئەو عەقڵانیەتەی قسەی لە بارەوە دەکەیت. ئەم زاراوەیە مانای تایبەتی دیاریکراوی خۆی هەیە بۆ هەر قوتابخانەیەکی فکری یان لای هەر فەیلەسوفێك. بۆ نمونە عەقڵ لای فەیلەسوفە موسڵمانەکان عەقڵێکی ئەرستۆییە. فەیلەسوفەکانی مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە.. هەموویان جەخت دەکەنەوە لەسەر دیدگایەکی تایبەتی عەقڵ.**

**لە مقالەیەکمدا بە ناوی "عەقڵ و ئازادی" کە لە کتێبی "فراوانتر لە ئایدۆلۆژیا"دا بڵاوکراوەتەوە، ڕوونم کردۆتەوە کە پێناسەکردنی "عەقڵ" بە شێوازێکی دیاریکراو کارێکی زۆر دژوارە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین چاوێکی پێدا بخشێنینەوە و کەمێك لێی بدوێین:**

**عەقڵ لە دوو ڕوانگەوە دەتوانرێت لێی بڕوانرێت:**

**1-عەقڵ لە ڕوانگەی "توانای لێکدانەوەی لۆژیکی و هەڵهێنجانەوە" کە خوای گەورە بە مرۆڤایەتی بەخشیوە، وە ئەم عەقڵەیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە.**

**2-عەقڵ لە ڕوانگەی "مادەی" ئەم توانایەوە:**

**بابەهێنانەوەی نمونەیەك ڕوونی بکەمەوە: عەقل وەکو "ددان" وایە کە توانای جووینی هەیە، بەڵام ددان تەنها هێزو توانایەکە کە لەلایەن خواوە بە مرۆڤەکان بەخشراوە، لەبەرئەوە پێویستە "خۆراك" دابین بکرێت بۆ ددانەکان وەکو "مادەی جوین".**

**عەقڵ لە ڕوانگەی یەکەمەوە بە شێوەیەکی تایبەتی لێدوانی لەبارەوە ناکەین، تەنها ئەوەندە بەسە کە لەم ڕوانگەوە، عەقڵ مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە. بەڵام عەقڵ و عەقڵانیەت لە ڕوانگەی**

دووەمەوە زۆر گرنگە. لە سەردەمە جیاوازەکاندا، ئێمە ڕووبەڕوی عەقڵانیەتی جیاواز دەبینەوە. تەنانەت لەیەك سەردەمی دیاریکراودا، لەگەڵ چەند عەقلانیەتێکی جیاوازدا ڕووبەڕو دەبینەوە نەك یەك عەقلانیەت.

بە دڵنیاییەوە، ئەمە بۆ ئەوە نییە کە ئینکاری بکەین لە هەر سەردەمێکدا شتانێکی بەڵگەنەویست و ئاشکرا بوونیان هەیە کە ئەمەش بۆ هەموو عەقلانیەتەکان شتێکی باوە. شتانێك هەن کە بەڵگەنەویستن یان خۆسەپێنن بۆ "توانای عەقڵ" واتا بمانهەوێت و نەمانهەوێت دەبنە "مادەی عەقڵ". ئەگەر چی لە هەر شوێنێك ئەم شتە بەڵگەنەویستانە بوونیان هەبێت، تەنها یەك شتی تایبەتی خۆسەپێن بوونی هەیە لە هەر سەردەمێکدا کە بە شێوەیەکی تایبەتی دەبێتە "مادەی عەقڵ". بۆ نموونە لەم سەردەمەدا، مافەکانی مرۆڤ ***human rights*** یەکێکە لەو شتە خۆسەپێنانەی ئەمڕۆمان و جەختی لێدەکرێتەوە و هەموو کەسێك لە بارەیانەوە دەدوێت. ئێستا زانیمان لە هەر سەردەمێکدا عەقڵی جیاواز بوونی هەیە. لە کاتی لێکۆڵینەوە لە بارەی "عەقڵ و عەقلانیەت"ەوە پێویستە بپرسین کام عەقڵ و عەقلانیەت لە ئەنگێزەماندا ***mind*** بوونی هەیە. بۆ نمونە د. محمد عابد الجابری کە بیریارێکی عەرەبە "عەقڵ" بەکاردەهێنێت لە ڕوانگەیەکی "پۆزەتڤیست"ییەوە (***positivist*** یەقین). لەم جۆرە عەقلانیەتەدا کارکردنی سەرەکی لەسەر لۆجیك و ماتماتیکە، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، پۆزەتفستەکان دەڕواننە شتەکان و هەڵیدەسەنگێنن. هەر بۆ نمونە، الجابری، عرفان ***mysticism*** وەکو شتێکی تەواو ناعەقلانی سەیر دەکات چونکە بە بەکارهێنانی ئەم جۆرە عەقلانیەتە هەڵیدەسەنگێنێت. تەنانەت دژایەتییەکەی بۆ "شیعەگەری" دەتوانرێت لەم ڕوانگەیەوە لێکبدرێتەوە. ئەلجابری "شیعەگەری" وا دەبینێت کە شتێکی ئاخنراوە بە نهێنییەکان و هیچ شتێکی عەقڵانی تیایدا بەدی ناکات بە بەکارهێنانی زاراوەکانی عەقڵی پۆزەتڤست، باوەڕی وایە کە شتەکانی وەکو لۆجیکی شیعە و عیرفان هیچ نین جگە لە حیکایەتە خورافییەکان چونکە ناگونجێت لەگەڵ عەقڵی پۆزەتڤیست.

کاتێك لە وولایەتە یەکگرتووەکان بووم لە گفتوگۆکانمدا لەگەڵ پرۆفیسۆرێکی خۆرئاواییدا کێشەی ئەلجابری هاتە پێشەوە، خۆرئاواییەکان ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنەیان قبوڵە و جەختی لەسەر دەکەنەوە.

هەروەها لە وولآتی خۆشماندا، کەسانێك هەن کە بە هەمان ڕوانگەی پۆزەتفستەکان دەڕواننە شتەکان، وە لەبەرئەوەی هیچ شتێك نازانن لە بارەی مەعریفەناسییەوەو داوای جۆرێك لە عەقلانیەت دەکەن لە ڕوانگەی عەقلانیەتێکەوە حوکمی پێشینەیی لەگەڵدا نییە، داننانێن بە شتانێکی وەکو عیرفان.

ئەو عەقڵەی ئەم جۆرە کەسانە لە بارەیەوە دەدوێن عەقڵێکە تایبەتە بە تاکێکەوە و هیچ کەسی تر تیایدا هاوبەشی ناکات، لە کاتێکدا ئەمە بە تەواوی هەڵەیە و ناتوانم لەمە تێبگەم. ڕوونیشی دەکەمەوە کە بۆچی هەڵەیە، بۆ ئەوەی ڕوونتر بدوێم با نمونەیەك بهێنمەوە: کەمێك لەمەوپێش شتێکم خوێندەوە کە ڕامین جاهانبێگلۆ نووسیویەتی، دەڵێت "قەشەیەکی مەسیحی ووتوویەتی هەرگیز نەمهێشتووە کە ئایدیا دینییەکانم تێکەڵ بە بیرکردنەوە فەلسەفییەکانم بن و هەوڵی داوە بە جۆرە عەقلانیەتێك بیر بکاتەوە کە خاڵی بێت لە حوکمی پێشینەییەکان". یەکەمینیان ئەمە بە تەواوی ئاماژەیەکی نازانستییەو بەرهەمی

تێنەگەیشتن و نەزانینە لە مەعریفەناسی، دووەمینیشیان: ئایا ئێمە هیچ گرنگییەك دەبینینەوە لە متمانەکانی ڕووناکبیرێك لە بارەی حوکمە پێشینەییەکانییەوە؟ کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کاتێك کەسێك دەڕوانێتە نووسینەکانی ڕووناکبیرەکە ئەو کاریگەرییە دەبینێت کە پێدراوە پێشینەییەکانی دروستیان کردووە لەسەر ئایدیا پاشینەییەکانی.

سەیرکە، مارکس یەکەم کۆمەڵناسی مەعریفەیە، بۆچی؟ چونکە پێی وایە مەعریفە وەکو دامەزراوەکانی تر پێکبەستراوێکی ناوخۆییە. ئەمڕۆ مەعریفە مەعریفەی تاکی نییە، بەڵکو شتێکی کۆییە (دەستەجەمعییە)، ئەمە چی دەگەیەنێت؟ ئەوە دەگەیێنێت کە مەعریفە دەچێتە مەیدانی ململانێوە، دێت بۆ من، دێت بۆ تۆ و ئەوانی تر و پەرش دەبێتەوە و "کۆیی"یەك *collectivity* دروست دەکات. بەلای منەوە "فێربوون یان بەدەستهێنانی مەعریفە *Learning*" بریتییە لەم مەعریفە کۆییە، هەرچەندە تاك لەوانەیە بتوانێت کەمەکێکی دیاریکراو لە مەعریفە بەدەست بهێنێت لە ژیانی تایبەتی و تەنهایی خۆیدا، ئەم تاکە دەبێتە کەسێکی خاوەن زانیاری بەلام زانیارییەك کە پشت دەبەستێت لەسەر ئەو مەعریفەیەی کە بەرهەمی مەزاج و باری تاکی خۆیەتی. بۆ نمونە دەڵێن هەر کاتێك "خواجە ناسرالدین تووسی" ئایدیایەکی نوێی دۆزیوەتەوە لە تەنیاییدا، زۆر دڵی خۆش بووە و دەستی کردووە بە هەڵپەڕین، وە هەروەها لەوانەشە هەرکەسێکی تر ئاسوودە و دڵخۆش بێت کاتێك لە تەنیاییدا ڕووبەڕوی ئایدیایەکی نوێ دەبێتەوە، بەلام ئەم زانیارییە بوارێکی مەعریفە پێك ناهێنێت.

کاتێك دەمانەوێت پێناسەی مەعریفە بکەین، بۆ نمونە ئێمە دەڵێین، بواری فقە ئەوەیە کە لەناو کۆمەڵی فەقیهاندا پەرش بۆتەوە (واتە ئەو بوارەیە کە هەموو فەقیهەکان هاوبەشی تیادەکەن)، بواری ئەندازیاری ئەوەیە کە لەناو کۆمەڵی ئەندازیاراندا پەرش بۆتەوە (واتە ئەندازیارەکان هاوبەشن تیایدا). ئەم بوارە گۆڕاوەی مەعریفە یان گەشە دەکات یان دەپوکێتەوە، یان بۆی زیاد دەکرێت یان گۆڕانی تیادەکرێت لە چوارچێوەی کۆمەڵێ لێکۆڵەرەکاندا. لەسەر ئەم بناغەیە، مەعریفە بریتی نییە لە کەڵەکەبوونی زانیاری لە ئەنگیزەدا، بەڵکو پێك دێت لەو بیر و بۆچونانەی کە خۆیان لە قسە ووتراوەکان و نووسینەکاندا دەردەخەن و لەلایەن کەسانی ترەوە هەڵدەسەنگێنرێت. ئەمە ئەو مەعریفەیەیە کە من قبوڵمە و بەدرێژایی کۆرسی ئەم پرۆسەیە عەقڵە جیاوازەکان دەردەکەون.

ئەگەر ووردبینەوە لەسەر ئەم بناغەیە، عەقڵی "فەلسەفی و زانستی و ئاییینی"مان هەیە کە بەیەکەوە بوونیان هەیە و کارلێك لەگەڵ یەکتریدا دەکەن.

*مەبەستی خۆت ڕوون کردەوە لە بارەی عەقڵ و عەقلانیەت و شوێنگەی مەعریفەناسی تیایدا. دەمەوێت ئەوە بپرسم: لە ڕوانگەی پێناسەکەتەوە بۆ عەقلی عبدالکریم سروش لەگەڵ ئایدیا فرە ڕووەکانی و ئامانجی بۆ دروستکردنی عەقلانیەتێکی نوێ، لە چ جۆرە کەشێکی عەقلانییدا بیردەکاتەوە؟

-بە دڵنیاییەوە، لەوانەیە ئاڕاستەکردنی ئەم پرسیارە بۆ من شتێکی ڕاست نەبێت من بڕیاردەرێکی باشی ئایدیاکانم نیم چونکە ئەوەی کەسانی دی لە قسە و نووسینەکانمدا دەیبینن جیاوازە وەك لەوەی خۆم دەیبینم. ئەو داتایە دەردەبڕم کە لە ئەنگیزەمدایەو بەشێوەیەك گوێ

بیستی دەنگی خۆم دەبم کە لەوانەیە جیاوازبێت وەك لەو شێوەیەی کەسانی دی پێی گوێ بیست دەبن. بۆ نمونە، کاتێك موعتەزیلەکان ڕووبەڕووی یەك دەبنەوە، بەیەکتر دەڵێن: تۆ باشیت، ئێستا پێم بڵێ من چۆنم؟ بە مانایەکی تر، ئەوان دەڕواننە مەزاجی خەڵکی لە ڕووی دەرەوە چونکە ئەوەی کەسانی دی دەیبینن بە نیسبەت منەوە شاراوەیە بە دڵنیاییەوە، ئەو کەسانەی کە بە کەمێك دیقەتەوە شوێن ئایدیاکانم دەکەون دەتوانن لەو جۆرە عەقلانیەتە تێبگەن کە من کاری تێدادەکەم لەگەڵ ئەوەشدا، چەند ووشەیەك دەڵێم بۆ تیشك خستنە سەر ئەو عەقلانیەتەی کە تیایدا بیردەکەمەوە.

من زۆر گرنگی دەدەم بە عەقڵی زانستی و ئەزموونی (ئەزمونگەری *empiricism*) ڕاستییەکە ئەوەیە کە خۆم "گیمیاگەرم"م (د. سروش کۆلیژی دەرمانسازی لە زانکۆی تاران تەواوکردووە و هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە دەرمانسازیدا —و) ئەمەش بووە مایەی زیادکردنی ئارەزووم بۆ ئەو جۆرە عەقڵە.

بە دڵنیاییەوە، ئەم جۆرە عەقڵە زۆر گرنگە و زۆر ڕووناکبیر بە هەڵە حاڵی بوون لە بارەیەوە. بۆ نمونە، ئەگەر نووسینەکانی هیگڵ بخوێنیتەوە، ئەمە بە ئاشکرا دەبینیت. چەند خاڵێك دەووروژێنێت لە بارەی زانستی فیزیاو کارەبایی و شتی دیکەوە کە هەموویان ناڕاستن، ئەمەش بەرەنجامی نائاشنابوونی هیگڵە بەم بواری مەعریفەیە. بە هەمان شێوەش، ئەو فەیلەسوفانەی کە بە هەڵە حاڵی بوون لە هەندێك شت لە گۆشەیەکی جیاوازەوە، بووە بەهۆی شکستیان لە کارکردن لەم بوارەدا. با نموونەیەك بهێنمەوە: بیهێنە پێش چاوی خۆت، کاتێك کۆترێك بە خێرایی لە هەوادا دەفڕێت و منیش دەڵێم: کۆترەکە دەتوانێت زۆر بە خێرایی بە ئاسانی لەم هەوایەدا بفڕێت، ئەگەر ئەم هەوایە لابرێت کە خۆی لە خۆیدا بەربەستێکی سووکە، چەند ئاسانتر و خێراتر دەتوانێت بفڕێت (واتە وا هەست بکەیت کە هەوا ڕێگرە، ئەگەر لابرێت فڕین خێراتر دەبێت چونکە بەربەستەکە نامێنێت)، ئەم تەعبیرە شکستی تێگەیشتن لە فرمانی هەوا دەردەخات کە یەکێکە لە هۆکارەکانی فڕین و نەبوونیشی پڕۆسەی فڕین پوچەڵ دەکاتەوە. فەیلەسوفەکانیش دووچاری هەمان هەڵەبوون. ئەوان وا وێنایان (تصور) دەکرد کە دەتوانن هەموو ئەو کۆسپانەی کە ڕێگرن لە بەردەم بیرکردنەوەدا لابەرن و تەنانەت لابردنی ئەو کۆسپە بێ بایەخەی کە ناسرابوو بە "ئەزموون *experience*" بۆ ئەوەی بتوانن بەشێوەیەکی باشتر بیر بکەنەوە، لە کاتێکدا نەبوونی ئەزموون واتە نەبوونی بیرکردنەوەی (عەقڵی) زانستی ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە "دیدگای کانتی"دا دەبینرێت.

من نۆمینالستێکم (ناوگەرا) لەم ڕووەوە دەچمەوە سەر ئەشعەرییەکان. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، جیهان لەسەر زانستی مۆدێرن دەژی (پشت دەبەستێت) و ئەوەی لە ڕابردوودا قسەی لێکراوە وەك "ماهیەت و جەوهەر" (*quiddity & essence*)، لە ئێستادا زۆر شایەنی بەرگریکردن نییە، وە باوەڕم پێی نییە. سەیرکە، لەبەرئەوەی ئیبن خەلدون زۆر پەیوەست بووە بە ماهیەت و جەوهەرەوە، نەیتوانی وەکو سۆسیۆلۆژستێك خۆی دەربخات، هەر لەبەر ئەمەشە، مەسەلە کەشفکراوەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر سوود بەخشنین.

لە هەمانکاتدا، "لۆجیك" زۆر لام پەسەندە و هەوڵدەدەم ئایدیاکانم لەسەر بناغەیەکی لۆژیکی و

پەیوەندیدار بنیات بنێم، هەروەها زۆر گرنگیش بە شیکاری عەقلانی دەدەم.

بە دڵنیاییەوە، هەموو ئەمانە وایان لە من کرد کە کەمتر سەرنجی مۆتیڤەکانی *motive* خەڵکی بدەم لە خستنەڕووی ئایدیا و دیدگاکانیاندا. زۆربەی ڕوناکبیرەکان پێودانگ (*Criteria*) و نیەتە ناعەقلانییەکان دەگەڕێننەوە بۆ هێڵێک لە بیرکردنەوە ئەویش بە خوێندنەوەی مۆتیڤەکانی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە. بۆ نمونە لەسەر مەسەلەی "عیرفان" دەگەڕێمەوە بۆ ڕەتدانەوەکەی پێشووم، ئەلجابری پێیوایە عیرفان تەواو شتێکی ناعەقلانییە چونکە ئەو مەسەلەی "مۆتیڤەکان" دێنێتە ئاراوە کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی "عیرفان". بەڵام با من لەم جۆرە کەسانە بپرسم: کە بۆچی و لەسەر چ بناغەیەك عیرفان ناعەقلانییە؟ ئەوەی کە من باوەڕم پێیەتی ئەوەیە کە ئێمە دوو جۆر عەقلانیەتمان هەیە: "عەقلانیەتی کەمترین *minimal* و عەقلانیەتی زۆرترین *maximal*" مەبەست لە عەقلانیەتی کەمترین لە هەر مشتومڕێکدا کە پێشکەش دەکرێت ئەوەیە کە پێویستە پێکهاتەکانی دژنەوەستنەوە لەگەڵ یەکتردا و سیستەمێکی پەیوەندیدار و پێکبەستراو دروست بکات. من باوەڕم بە عەقلانیەتی کەمترین هەیە و لەسەر ئەم بناغەیەش دەڵێم پێموانییە کە عیرفان ناعەقلانی بێت.

هەروەها باوەڕم وایە و لە ڕەتدانەوەکەی پێشووشدا تاڕادەیەك ڕونم کردۆتەوە تەنانەت کتێبەکەشم کە دەربارەی "چوونەوەیەك و کشانی مەعریفەی ئایینی"یە وەکو "مەتەڵی تۆرە ووشە" وایە کە بەردەوام خەریکی شیکارکردنیم، ئێستا ئەگەر بمەوێت بەشێك لە مەتەڵەکە بگۆڕم، بە حەتمی پێویستە گۆڕانکاری لە بەشەکانی تریشدا بکەم، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە مەعریفە وەکو پرۆسەیەکی گۆڕاو و لەبەر ڕۆیشتوو وایە.

پێم وایە کە توانیومە تاڕادەیەك ئەو کەشە تیۆریایە ڕوونبکەمەوە کە من کاری تێدا دەکەم بۆ ئەو کەسانەی کە جێی گرنگی پێدانیانە.

*بەدیاریکردن و دەستنیشانکردنی ئەو عەقل و عەقلانیەتەی کە بەڕێزت کاری تێدادەکەیت تاڕادەیەك توانیوتە ئاسۆ و دیدگاکانت ڕوونبکەیتەوە. ئێستا دەمهەوێت نمونەیەکی بابەتییانەی بیرکردنەوەت بزانم لە بواری گشتی و مەدەنیدا و لەم چوارچێوە عەقلانییەدا لەبەرئەوەی توانای ڕوونکردنەوەی پێکهاتە (توخم) و پرنسیپ و تەنانەت مۆتیڤەکانی خۆت هەیە. قسە دەکەم لە بارەی "دیموکراسی ئایینی"یەوە "*Religions Democracy*"، لێرەدا بەڕێزت ئەم دوو چەمکەت (دیموکراسی و ئایین) شانبەشانی یەکتر داناوە. ئایا دیموکراسی توخمی ئایینی و بناغەی ئایینی هەیە؟ ئەگەر وایە، لێرەدا عەقلانیەت دەکەوێتە کوێ و چ شوێنگەیەکی هەیە؟ پێشمان بڵێ مەبەست لەم زاراوەیە چییە بەشێوەیەکی بنەڕەتیانە.

–با بە ووتنی ئەوە دەست پێبکەم کە گرنگییەکی زۆرم داوە بە مەسەلەکانی بواری فەلسەفەی سیاسی و ئەم بابەتەش زۆربەی لێدوانە تیۆرییەکانمی بەرهەم هێناوە. ئایدیای نوێ لە ئەنگیزەمدایە کە تا ئێستا کاتی ئەوەم نەبووە بیانکەمە نووسین، لەبەرئەوە هەرچی خێراترە هەوڵدەدەم لە ئەنگیزەمەوە دەریانبهێنم و پوختەیان بکەم و لە بارەیانەوە بدوێم چونکە توێژەرەکان و ڕەخنەگرەکانیش توانیویانە پەی بەو ئایدیایانە بەرن.

بەهەرحاڵ، جگە لەم خاڵەش، دیموکراسیش یەکێکە لەو مەسەلانەی کە هەمیشە دووچاری سەرلێتێکچوون و بەدحاڵی بوون بووە، لەبەر

ئەمەشە زۆربەی میللەتە دیندارەکان ئەترسن کاتێك لە دیموکراسی نزیك دەبنەوە. هەروەها زانستی سیاسیش *politics* مانای تایبەتی خۆی هەیە کە ئایین توخمێك نییە تیایدا. ئێستا ئەگەر بڵێین زانستی سیاسی بریتیە لە لێکۆڵینەوەی هێز (دەسەڵات) یان بڵێین پێناسەکەی هەرچییەك بێت ئەوا ئایین وەکو توخمێك تیایدا دەرناکەوێت.

بەدڵنیاییەوە، پێویستە دڵنیابین لە جیاکردنەوەی دوو سیاق *context* لە یەکتری: یەکەمیان بریتییە لە "سیاقی پێناسە *Context of Definition*" کە سیاقێکی هۆشییە و دووەمیشیان بریتییە لە "سیاقی بابەتی *Objective Context*" کە لە دەرەوەی ئەنگیزەدایە. لە سیاقی پێناسەدا ئێمە پێناسەیەکی تایبەتی هەڵدەبژێرین و دەڵێین دیموکراسی یان زانستی سیاسی بریتییە لەمە یان ئەوە. بەڵام لە ڕووی دەرەوەداو لە سیاقی بابەتیدا، توخمەکانی تری وەکو ئایین "گونجاوە" لەگەڵ دیموکراسیداو ئەمەش مەسەلەیەکی جیاوازە. سەرنج بدە ئەم خاڵە، چی ڕوودەدات ئەگەر لە سیاقی بابەتیدا "هاوگونجاوی" نەبێت، با نمونەیەك بهێنمەوە: ئاو ئاوە بە پێناسە و سروشتی خۆی، کوڵاندن بەشێك نییە لە سروشتی ئاو. بە مانایەکی تر، ئێمە کاتێك پێناسەی ئاو دەکەین (واتە لە سیاقی پێناسەدا) توخمی "گەرمی" لە پێناسەکەدا ناهێنین چونکە لە سیاقی پێناسەدا بەشێك نییە لێی. بەڵام لە جیهانی دەرەکیدا (سیاقی بابەتی)، ئاو گونجاوە لەگەڵ "گەرمی"داو دەکوڵێت، ئەمەش هاوگونجاوی "ئاو و گەرمی"یە.

لە حاڵەتی زانستی سیاسی و دیموکراسیدا هەمان شت جێبەجێ دەبێت. با من شتێك لە تۆ بپرسم: ئایا دیموکراسی سیکولارمان هەیە تاوامان لێ بکات لە بارەی دیموکراسی ئایینییەوە بدوێین؟

بەشێوەیەکی سروشتییانە نەخێر. ئێمە دیموکراسیمان هەیە. بەڵام، لە پرۆسەی شیکاریدا، باوەڕوایە ئەگەر شتێك پەیدابێت لە "ئەم" یان "ئەوی" دیکەوە وەك لە "ئەم"، ئەوا شتەکە دەتوانێت ببێتە "ئەم" یان "ئەوی" دیکە وەك لە "ئەم". دیموکراسیش بەم جۆرە دروست دەبێت. لە جیهانی دەرەکی و بابەتیدا، دیموکراسی، دەگونجێت لەگەڵ شتانێکی دیاریکراو، لەبەرئەوە دەشێت دیموکراسی سیکولار یان ئایینی بێت. دەمهەوێت گفتوگۆکە کەمێکی تر فراوان بکەم بۆ ئەوەی زیاتر ڕوون بێت. هەندێك کەس جەوهەرێك دەستنیشان دەکەن بۆ دیموکراسی و بەشێوەیەکی دیاریکراو پێناسەی دیموکراسی دەکەن. دەمهەوێت بڵێم ئەمە شتێکی هەڵەیە: ئێمە تەنیا یەك دیموکراسیمان نییە بەڵکو چەند دیموکراسییەکمان هەیە. ماوەیەك لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆرسێکم ووتەوە لەسەر "دیموکراسی و ئیسلام" ئەو قوتابیانەی کە بەشداریان کردبوو سەر بە نەتەوەی جیاواز بوون. پێم ووتن: من داوای ئەوەتان لێناکەم کە هیچ شتێك بزانن لە بارەی مشتومڕە ئیسلامییەکانەوە. من ئەوانە (دیموکراسی و ئیسلام) بۆ خۆم و بۆ ئێوەش ڕوون دەکەمەوە. بەڵام بەیەکەوە گفتوگۆی دیموکراسیمان کردو بە پێناسەکردنی دیموکراسی دەستمان پێکرد هەر لە یۆنانی کۆنەوە تاوەکو ئەمڕۆ لەناو ئەم پێناسانەدا، هیچ پێناسەیەکی دیاریکراو نەبوو تایبەت و جەوهەری بێت بۆ دیموکراسی، ئەوەی دەرکەوت ئەوەبوو کە دیموکراسی لەسەردەمە جیاوازەکاندا پەیدابووە و پشتی بەستووە بە بارودۆخەکانی ئەو کاتە.

پێم ووتن: بڕوانن، لە پێناسەکردنی دیموکراسیدا ئێوە دەڵێن: حوکمی خەڵکە لەلایەن

خەڵك خۆیەوە. بەلاَم ئەمڕۆ ئەگەر تۆ هاولاَتی ووڵاتێك نەبێت تەنانەت ئەگەر لێكۆڵەرەوەیەكی گەورەش بێت، نەمافی دەنگدانت هەیە و نە مافی كاركردن. پێویستە بە وورياییەوە تێبینی ئەو سیفاتە جیاكەرەوەیە بكەیت كە تەركیزی دەكرێتە سەرو وە ئەو گرنگیەش كە لە پێناسەكردنەكەتدا بۆ دیموكراسی دەیبینیتەوە. دیموكراسی ئایینی مانای ئەوەیە كە بەها ئایینییەكان ڕۆڵ دەبینن لە مەیدانی گشتی و مەدەنیدا لە كۆمەڵگایەكدا كە دانیشتوانەكەی دانیشتوانێكی ئایینییە. بەلاَم لە كۆمەڵگایەكی سیكولاردا، هەندێك سیفاتی جیاكەرەوەی تر هەیە كە لەوە دەچێت گرنگ بن و تەركیزیان بخرێتە سەرو ببنە بناغە بۆ دیموكراسی. لەمەشەوە دەردەكەوێت ئەوەی شكڵ و ڕەنگی دیموكراسی دەگۆڕێت بریتییە لە توخم و سیفاتە تایبەتییەكانی كۆمەڵگاكە خۆی. ئەم دیموكراسییە دەكەوێتە ناو چوارچێوەی عەقلانیەتی مۆدێرن و هەڵگری توخمی ناسراوی خۆیەتی. لەم ڕێگەیەوە فرەییەكی دیموكراسیمان هەیە لە كۆمەڵی نێو دەوڵەتیدا.

*كاتێك بەڕێزت لە بارەی دیموكراسی ئایینیەوە دەدوێت، داوای دروستكردنی سیستەمێكی دیموكراسی دەكەیت لە كۆمەڵگایەكی ئایینیدا، بەلاَم ئێستا باوا دابنێین ڕۆژێك لە ڕۆژان خەڵكی ناوچەیەك بڕیاردەدەن كە چیتر "ئایین"یان نەوێت، ئایا ئەم دیموكراسییە ڕێیان پێدەدات كە ئایین بخەنە لاوە یان مەرج و سنوور بسەپێنێت بەسەر قبوڵكردن یان ڕەتكردنەوەی ئایین؟

-بڕوانە، پرسیارەكەت ئاڵۆزە، ئایین بۆ خەڵكە و خەڵكیش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئاییندا دیاریدەكەن. بەمانایەكی تر ئەوە نەكاری منە و نەهی تۆ و نە سیستەمی حوكمڕانی كە خەڵكی چی دەكەن لەگەڵ ئاییندا. ئەگەر خەڵكی ویستیان واز لە ئایین بهێنن، ئەوە كاری من نییە. پێویستە ئەوە باش بزانیت كە دیموكراسی لە سیاقی پراكتیزدا دێتە بوون و پێویستە دەركەوتەی دەرەكی هەبێت. تەنانەت ئەگەر هەزاران جاریش قسە بكەین لە بارەی "ئەم" یا "ئەو" جۆری دەوڵەتەوە، ئەگەر دەركەوتەی بابەتی یان دەرەكی نەبێت ئەوە "نا دیموكراتییە"، تەنانەت ئەگەر پێشی بووترێت "دیموكراتی".

با ئەمەش بڵێم: هەندێك خەڵك "فقه" وەكو ئایین دەبینن، لە كاتێكدا فقه ئەزمونی ئایینییانەی ئایینە. من لەگەڵ ئەو ڕایەدام كە پێی وایە گرنگترین فرمانی ئایین "ئەخلاقە *Ethics*". بە مانایەكی تر ئەگەر من بمهەوێت ئایین بگۆڕم، ئەخلاق دەخەمە جێگەكەی، هەر ئاینێك ئەم توخمەی تێدا نەما، ئیتر لە "ئایین بوون" دەكەوێت.

ئەوەی لە ئەنگیزەمدایە كاتێك لە بارەی دیموكراسییەوە دەدوێم بریتییە لە دیموكراسی وەك ڕەتكردنەوەی ستەمكاری. بە مانایەكی تر، دیموكراسییە پێشنیاركراوەكەی من دیموكراسییەكی دژە ستەمكارییە – *antityranny*، وە پێویستیشە سیاسەتێك هەڵبژێرین كە ئازادی هەڵبژاردنمان پێببەخشێت. ئەمە مەبەستی سەرەكی منە كاتێك لە بارەی دیموكراسییەوە دەدوێم. لە داهاتووشدا ئەمە دەكەمە نووسین بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەستەكەم بەڕوونی.

**سەرچاوە**

**ماڵپەڕی د. سروش**

[www.drsoroush.com](http://www.drsoroush.com)

چاوپێكەوتن لەگەڵ ڕۆژنامەی شەرق

وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی: نالوو ئەلموبەسیر.

# تێكۆشان بە ڕێبازەكانی تر

## گفتوگۆ لەگەڵ د.جین شارپدا

لە فارسییەوە: كارزان محەمەد

**پێشەكییەك دەربارەی د. جین شارپ:**

(د. شارپ) ی نوسەری كتێبی هونەری جەنگ كە هەندێك ئەو بە (كلاوزویتسی تێكۆشانە ناتوندوتیژییەكان *the Clausewitz of nonviolent warfare*) ناودەبەن، لەساڵی (1983)دا ئەنیستیتۆی ئەلبێرت ئەنیشتاینی بنیات نا بەئامانجی پەرەدان بەلێكۆڵینەوە، ڕاقەكردن و فێركردن لەبواری ستراتیژییەتە ناتوندوتیژییەكان لەبەرامبەر دیكتاتۆرەكان، جینۆساید و جەنگدا.

جین شارپ دكتۆرای فەلسەفەی لەزانكۆی ئۆكسفۆرد لە (1968)دا بەدەستهێنا، پاشان دەساڵ لەبەریتانیا و نەرویج لێكۆڵینەوەیەكی بەرفراوانی لەبواری (ناتوندوتیژی *nonviolence*) دا كرد.

بەرهەمەكانی شارپ كاریگەرییەكی بەرچاویان كردەسەر شێوازەكانی تێكۆشان لەناوچە جۆربەجۆرەكانی جیهاندا. دەكرێ وەك نمونەیەك، ناوی تێكۆشانەكانی لاوان بهێنین لەوڵاتە كۆنەكۆمۆنیستەكانی خۆرهەڵاتی ئەوروپادا كە لەزۆربەیاندا، نامیلكەكەی شارپ بەناوی (لەدیكتاتۆرییەوە بۆ دیموكراسی[1]) وەك بناغەیەك بۆ ئەم تێكۆشانانە بەكارهێنراوە.

دوابەرهەمی شارپ بەناوی ( *Waging Nonviolent Struggle: 20th Century Practice and 21st Century Potential*) لەمانگی حوزەیرانی (2005)دا بڵاوكرایەوە. ئەم كتێبە كارە كۆنەكانی شارپ لەخۆدەگرێت بەهێنانەوەی ئەو نمونانەی كە ئەم ڕێبازانە تیایاندا بەپراكتیكیانە بەكارهێنراون و ئەو وانەگەلانەش كە دەكرێ لێیانەوە فێربین.

ئەوەی لێرەدا دەیخوێنیتەوە، وەرگێڕانی گفتوگۆیەكی تەلەفۆنییە كە لەمێژووی (29ی ئایاری 2005) لەگەڵ (جین شارپ)دا بەهۆی (لاورا سیكۆر *Laura Secor*)ەوە ئەنجام دراوە.

**پێشەکی لاورا سیکۆر:**

ڕووداوگـــەلێکی سەرســـوڕهێنەر لەســـاڵی (2000)دا لەولاتــە کۆنەکۆمۆنیســتەکاندا دەســتی پێکـرد، دەوڵەتـە نـەفرەتلێکراو و سـەرکوتەکارەکان لەبەرامبـەر جولانـەوە بەکۆمەڵـە ناتوندوتیژییـەکان، پاشەکشێیان کـرد. سـەرەتا لـە سربسـتان، پاشـان گورجستان، ئۆکراینو کازاخستان. واپێدەچوو کە ڤایرۆسـێك لەبلاوبوونەوەدایـە، ئـەو ڤایرۆسـەی کـە خـەڵکی ژێـر سـودوەرگرتنی نیگەتیڤانـەو فشـار، لـەهێزی خـۆی وشـیاردەکاتەوە. ئـەو هێـزەی کـە سەرەنجام حکومەتە سـەرکوتکارەکان بـەرەو گـۆڕانی چاوەڕوان نەکراو دەبات.

بـەڵام ئەمـە ڤایرۆسـێك نـەبوو، لـەنێوان ئـەو فاکتەرانـەی کـە بووبەمایـەی ئـەم گۆڕانکارییانـە، نامیلکەیـەك بـوو کـە لەلایـەن خوێنـدکارێکی خوێندنی‌بالاوە لـە (بۆستۆن) بەناوی (جین شارپ) نوسـرابوو و دەقـە وەرگێردراوەکـەی لەتـەواوی ئـەم شۆڕشە دیموکراسییە ناتوندوتیژییانەی ناوخەڵکدا هــــەبوو. نامیلکەکـــــەی شـــــارپ بـــــەناوی (لەدیکتاتۆرییەوە بۆ دیموکراسی)، تیۆری دەسەلات بەشـــێوەیەك شـــی دەکاتـــەوە کـــە دەرخـــەری میکانیزمەکانی دیکتاتۆرەکانو خاڵە لاوازەکانیانە. هــەروەها خەســڵەتەکانی بــەرگری ناتوندوتیــژیش بەکورتی روون دەکاتـەوە: دەکرێ چ ڕێبازگـەلێك بۆ پشـکنینو شـیکردنەوەی سەرچاوەکانی دەسـەلاتی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان بەکاربهێنرێت، چۆن لەبەرامبەر کاردانـــەوەی توندوتیژانـــەدا بـــەرگریی بکرێـــتو تەحـەمول بکرێـت. گرنگـی چونە نـاو ململانێیـەکی واوە وەك ســـــتراتیژییەکانی لەشـــــکر وایـــــە. تاکتیکـە ناوبراوەکـان بـریتین لـە: خۆپیشـاندانو پۆســـتەرەکان، مـــانگرتنو ڕێگـــاگرتنو بـــایکۆت کـــردن. هەنـــدێ لـــەم ڕێبازانـــە بـــەکاردەهێنرێت بـــۆ گێـــژکردنی کۆمـــەڵگاو ڕازیـــی کردنـــی فەرمانڕەواکانـــە بـــۆ ئەمەیکـــە بـــەبێ بایەخـــدان بــە مەســەلە جێمەبەســتەکە، نــاتوانن حکــومڕانی بکـەن (یـا ئەوەیکـە هـەرگیز نـاتوانن فـەرمانڕوایی بکەن).

شارپ هەنوکە لەدوادوای تەمـەنی (70)ساڵەی خۆیدا، ڕەفتارێکی زۆر نەرمڕەو و سادەی هەیە. لە (50)ساڵ لەمەوپێشـەوە کە دەستی بـەم کارە کرد، بـــــەکردەوە دەســـــتپێکەری ڕاڤـــــەی کـــــردە ناتوندوتیژییەکان بووە. لە (1983)دا ناوبراو، (2) بەرنامەی لەسەربنەمای هەمان بابەت لە (هارڤەرد) و دامـەزراوەی (ئـەلبێرت ئەنیشتاین)دا دەمەزراند کـە بەوتـــەی ئەو:"نـــە لەســـەربنەمای ئاشـــتیخوازی (پاســـــیفیزم)ەو نـــــە لەســـــەربنەمای ئایـــــدیای ماهاتمایزمـە، بـەڵکو لەســەربنەمای هــاوکرداریی پراگماتیستی بێتوندوتیژییـە". کتێبـەکانی ئـەو – 13 کتێـب– بەنزیکـەیی وەك کتێبـە فێرکارییـەکان نوســـراون، بـــەزمانێکی ســـادەو نوســـینێکە کـــە لەزۆرینەی کلتورەکاندا، شیاوی لێتێگەیشتنە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا کارەکـەی شـارپ لـەمڕۆدا بەترۆپکی خۆی گەیشتووە، دامـەزراوەی ئـەلبێرت ئەنیشـتیاین کـە بابـەتی فێرکـاریی بلاودەکاتـەوەو پـــرۆژەی فێرکـــاریی لـــەدەرەوەدا بـــۆ هەڵســـوڕاوە سیاسـییەکان بـەڕێوەدەبات، و کـاری هەماهـەنگی وەرگێرانەکانی (لە دیکتاتۆرییەوە بۆ دیموکراسی) لەئەسـتۆدایە، بودجەیـەکی بـۆ درێـژەدان بەکارەکـە نییەو ڕەنگە لە سێپتامبەردا، ناچاربێت دەرگاکانی دابخـات. لەئێسـتادا کارمەنـدەکانی لـە (4) کەسـەوە

بۆ (2) کەس کەمبۆتەوە کە پێکهاتووە لەخودی (شارپ)یش!.

***چۆن بەم بابەتە گەیشتیت؟**

–من لەدوای دەیەی (40)و سەرەتاکانی دەیەی (1950)ی زایینی، هاتمە ئەم باسەوە. جەنگی جیهانی تازە تەواو ببوو و جینۆسایدۆو هۆلۆکۆست لەهەواڵەکاندا نوێ بوو، ستالین هێشتا لەرووسیا لەسەر دەسەڵات بوو و سیاسەتی کۆلۆنیالیستیانەی ئەوروپییەکان‌و ڕاسیزم لەئەمریکا، و مەترسی جەنگی ئەتۆمی هەبوو. دەبوو ڕێگایەکی باشتر بدۆزرێتەوە، من دەستم کرد لەلێکۆڵینەوە لەزەمینەی بەرەنگاریی ناتوندوتیژیی‌دا . سەرچاوەکان کەم بوون، بەڵام بەلێکۆڵینەوەی هەرچی زیاتر لەم بوارەدا، تێگەیشتم کە مەیدانێکی باشە بۆ کارو بەتایبەتیش کە ئێمە چەند کەممان لەم بوارەدا دەزانی. کەم کەم بەلێکۆڵینەوەی قوڵ لەسەر گاندی، نەك وەك گاندی بەڵکو وەك ستراتیژیستێکی سیاسی هاتمە ئەم بابەتەوەو ئینتیمام ڕۆژبەڕۆژ بۆ زانینی هۆکارەکانی سەرکەوتن یان شکستی ئەم ڕێبازەو ئەو نوێکارییانەی کە دەتوانێ کاریگەرتریان بکات" زیاتر دەبوو.

دوای ماوەیەك، لەنەرویج ژیام‌و لەوێ چاوم بەو کەسانە کەوت کە لەبەرگریی جەماوەریانەی سەردەمی داگیرکاریی نازییەکاندا بەشداربببوون. یەکێك لەگەورەترین ئەو خاڵانەی لەم سەردەمەدا فێری بووم ئەمە بوو کە هەڵوێستی ئاشتیخوازان (پاسیفیزیمەکان) کە تەنها توندوتیژییان مەحکوم دەکرد، کارەکە ناباتە پێشەوە!. لەکاتی نەبوونی ئەلتەرناتیڤێکی واقیعبینانە، خەڵك یا بەشێوەی کارتێکراوانە تەسلیم دەبوون یا پەنایان بۆ تەنها ڕێگایەك دەبرد کە بەڕای ئەوان ماوەتەوە، ئەویش جەنگ‌و توندوتیژییە.

*** چ بیروباوەڕێکت بەبینینی مێژوو، گۆڕی؟**

–لەقۆناغێکدا لەم بڕوایەدابووم کە بیروباوەڕە ئایینی– ئەخلاقییەکان‌و زانستی تەکنیکی، هەردووکیان پێویستن. بەڵام دواتر تێگەیشتم کە بەهیچ شێوەیەك پێویست نین!. تەنها هێڵێکی سیاسی، هێڵێکی پراگماتیکیانە بەسە. لەپراکتیکدا لەزۆربەی ڕووداوە مێژووییەکان هەمان ڕووداو ڕووی داوە.

*** لەکوێدا تیۆرییەکانتان لەپراکتیکدا بینی؟**

–خودی ئێمە زۆربەی ئەم تیۆرییانەمان کاتێك خوێندکاری زانکۆ بووین، بەڕێگای سادە ئەنجاممان دەدا، بۆنمونە ڕێگانەدان بەدانیشتن لەهۆڵی نانخواردن لە کلیمبۆس ئاهیۆ. من لەستوانیا، لاتڤیاو لیتوانیا کاتێك دەوڵەتە جوداخوازەکانیان هەوڵی جیابوونەوەیان لەیەکێتی سۆڤییەت دەدا، ئامادە بووم‌و دیدارم لەگەڵ دەوڵەتمەدارانی هەرسێ وڵاتەکەدا کرد. هەرسێ دەوڵەتمەدارەکە، وەك سەرچاوەیەك سودیان لە کتێبێکی من بەناوی (بەرگریکردن لەسەر بناغەی هاوڵاتیان) کردبوو. لەمەیدانی (تیانمەن)یش لەگەڵ هاوڕێیەکمدا ئامادەبووم.

*** بەتێڕوانینتان چ کێشەیەك لە (تیان من) هەبوو؟**

–کێشەکە ئەمە بوو کە هیچ بەرنامەو ستراتیژێك بوونی نەبوو. کەم‌و زۆر جوڵانەکە بەشێوەی ڕووداوێك ڕووی داو دواتر پشتیوانییەکی زۆری پەیداکرد!. خەڵك بەخێرایی هاتنە مەیدانەوە،

بەڵام کاتێك خەڵکی ئاسایی هاتنە مەیدانەکەوە، کرۆك و ڕێبەریی جوڵانەوەکە لەدەست درا. تەنانەت دوای بڕیاری ڕێبەرانی جوڵانەوەکە بۆ چۆڵکردنی مەیدانەکە، خەڵکی ئاسایی بڕیاریان دا بمێننەوە، چونکە هیچکاتێك لەڕابردوودا چانسی ناڕەزاییان نەبوو، بەڵام لەهەمانکاتدا هیچ بەرنامەیەکیشیان بۆ ناڕەزایی نەبوو.

لەهەمانکاتدا ئەوان هەستیان بەگرنگی ڕاکێشانی پشتگیریکردن لەناو ڕژێمدا نەدەکرد. لەگۆشەوکەنارەکاندا بیسترا کە کارمەندە ناسەربازییەکانی دەوڵەت لەپەنجەرەوە پارەیان هەڵدەڕشت بۆ ئەو کەسانەی کە بەرگریان دەکرد، بەڵام ئەو کارمەندانە مانیان نەگرت. تەنانەت دەنگوباسیش هەبوو کە هەندێ لەسەربازەکان خۆیان لە تەقەکردن لە خۆپیشاندەران دەبوارد. ئەگەر ئەو ڕووداو و نافەرمانییە مەدەنییانە لەسەرئاستێکی بەرفراوانتر ڕووی بدایە، سەرکەوتنی جوڵانەوەکە دوورەدەست نەبوو.

ئەو شەوە لەوێ بووم، تازە نانم خواردبوو و دەمانویست بەرەو ئوتێلەکەی ئەو سەری مەیدانەکەی (تیان مِن) بچین کە تانك و هێزەکان هاتنە مەیدانەکەوە. لەسەرەتادا دەمانویست لەگۆشەیەکدا خۆمان بشارینەوە تابیبینین چی ڕوودەدات، بەڵام کۆمەڵێك لەخەڵکی ناوچەکە، ئێمەیان بەخێرایی کردەدەرەوە. پێموایە ئەمە بووەبەهۆی بەزیندوویی مانەوەمان. ژمارەکی زۆر لەوشەوەدا کوژران، لەڕاستیدا کارەساتێکی زۆر خراپ بوو.

*** چۆن "لەدیکتاتۆرییەوە بۆ دیموکراسییەوە" هاتەبوون؟**

- ئەم نامیلکەیە لەسەرەتادا لەساڵی (1989)، لەسەر داخوازیی دیموکراتێکی دوورخراوەی خەڵکی بۆرما نوسرا کە لەبانکۆك دەژیا و هەواڵنامەیەکی ئامادەدەکرد. هەندێ لە لێکۆڵینەوەکانی ڕابردووم، وەك خاڵی لاوازی دیکتاتۆرەکان دەستمایەی تەوەرەی ئەم نامیلکەیە بوو.

نامیلکەکە تەنها بەزمانی بۆرمایی نوسرابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیکە من بەشێوەیەکی نایاسایی چەندینجار لەبۆرما بووم، بەڵام شتێکی زۆرم دەربارەی بۆرما نەدەزانی. کاتێك سەبارەت بەوڵاتێك دەنوسیت کە زۆر دەربارەی نازانیت، پێویستە بەڕاستی بەئاگابیت، لەبەرئەوەی لەوانەیە هەموو شتێك خراپ بکەیت!.

**پ: ئەم نامیلکەیە بۆ ڕووسی، فارسی، چینی، عەرەبیو زۆربەی زمانەکانیتر وەرگێڕدراوە، ئایا تۆ ئەم وەرگێڕانانەت ڕێکخستووە؟**

-زۆرینەیان بەرهەمی داواکارییەکانی هەڵسوڕاوانی ناوخۆی ئەم وڵاتانە بوون. هەڵبەتە وەرگێڕانی بابەتێکی لەوجۆرە هەندێکجار دەکرێ مەترسیدار بن و پێویستە سەرنجی لێبدرێت. لەوانەیە وەرگێڕەکان بەوردیی ئاگاداریی بابەتە جێباسەکە نەبن، زاراوەی هاوتا لەزمانەکەی خۆیاندا دانەنێن، لەبەرئەوەی ئەو زاراوە تایبەتە لەبنەڕەتدا لەزمانەکەی ئەواندا نییە!

**پ: تێڕوانینی تۆ دەربارەی هاوکێشەی سوودوەرگرتن لەم ڕێبازی تێکۆشانە (ناتوندوتیژی) وەك سیاسەتێکی دەرەکی دەوڵەتی ئەمریکا چییە؟**

-ئەم کارە زۆر مەترسیدارە. ئەو کارەی لەدەستی دەوڵەت دێت، دابینکردنی بودجەیە کە بەداخەوە ئەم کارە ناکات.

***سەرۆکی ئەنیستیتۆی ئەلبێرت ئەنیشتاین (رۆبەرت هێلڤی *Robert Helvey*)، خولێکی لەبوداپست بۆ خوێندکارانی سرب بەرلە لەدەسەلات دامالینی سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ بەڕێوەبرد، لەچەند شوێنێتردا ئەوجۆرە خولانەتان بەڕێوەبردووە؟**

– (3)سال لەمەوپێش یەکێك لەو خولانەم بۆ هەلسوڕاوەکان لەڕووسیای سپی بەڕێوەبرد کە هەلبەتە ناچاربووین لە ویلنۆس لەلیتوانیاش بەڕێوەی ببەین. کۆمەلە خولێکی کورتیشمان بۆ دوورخراوە کوبابییەکان لەمیامی هەبوو، بەهەمانشێوەش بۆ ڤەنزوێلایی و هەلسوڕاوە زیمابۆییەکانیش ئەوجۆرە خولانەمان بەڕێوەبرد.

***لەکتێبەکەی تۆدا، فەسلێك بەناوی بەرەنگاربوونەوەی سیاسی هەیە: کە تیایدا ئەو توندوتیژییەی رژێم دژبە جولانەوە بێتوندوتیژییەکان بەکاریهێناوە، بەجولانەوەیەکی سیاسی بەرەوخۆی دەگەڕێتەوەو دەبێتەمایەی پشتیوانییەکی قولترو زیاتری خەلك.**

–کاتێ من دەستم بەلێکۆلینەوە لەم بوارەدا کرد، بیرم لەمە دەکردەوە کە:"باشە ئەمە لەوانەیە بۆ هیندییەکان سودمەند بێت، لەبەرئەوەی زۆرینەیان (هیندۆیی)ن و بڕوایان بەتەناسوخ هەیە. کەواتە بەلای ئەوانەوە جیاوازی نییە ئەگەر بکوژرێن". بەلام بەسەرنجدانێك لەشۆرشی (1905)ی ڕووسیا، دەبینین بارودۆخەکە بەتەواوەتی هاوشێوەیە. لەبەرەنگاربوونەوەی سیاسسدا ئەگەر خەلك بترسن، نازانن پێویستە چی بکەن یا ئەگەر ئاگادار نەبن کە بۆ پاراستنی هەلوێستی خۆیان پێویستە کەمێ ریسك بکەن، کاریگەر نابن. تێکۆشانە پارتیزانییەکان قوربانییەکی زۆر بەسەر خەلکی ئاسایی‌دا دەهێنێت، بەلام چێ‌گیڤارا وازی لەتێکۆشان نەهێنا لەبەرخاتری قوربانیدان. لەنەرێت و ڕێساکانی جەنگدا، شتێکی هاوشێوە هەیە، بەلام لەبزووتنەوە (ناتوندوتیژییەکان)دا دەلێن ئەگەر تۆ بکوژرێیت ئەوا بزووتنەوەی ناتوندوتیژیی شکستی خواردووە. هەندێك بەبێ ئەوەی پەی بەوە ببەن کە دەبێ چی بکەن، بەرەو سودوەرگرتن لەتوندوتیژی دەڕۆن.

***هەلبەتە تەواوی بزووتنەوە ناتوندوتیژییەکان دیموکراسی دروست ناکەن. شۆرشی (1979)ی ئێران تائەندازەیەکی زۆر بێتوندوتیژی بوو.**

–بەتەواوی راستە. بەلام ئەوان هیچ بەرنامەیەکی ئەلتەرناتیڤیان نەبوو. هەر گروپێك لەخەلك، بیروباوەڕێکی جیاوازی هەبوو بۆ ئەوەی چ حکومەتێك ببێتە ئەلتەرناتیڤ.

لەئێستادا ئێمە نامیلکەیەکمان لەبواری (دژەکودەتا)دا هەیە بۆ ئەوەیکە چۆن بەربە بەکارهێنانی هێز بگرین و ڕێگە لەجێگیرکردنی بگرین لەلایەن گروپێکەوە. زەمەنی دوای تێکۆشانێکی سەرکەوتووی بێتوندوتیژیدا، زۆر مەترسیدارو چارەنووسسازە.

کارەکەی ئێمە کاریگەرییەکی زۆر گرنگی لەئێراندا هەبووە، هەلبەتە بەداخەوە هێشتا جولانێکی تەواو سەرکەوتوانەی نەبووە. "لەدیکتاتۆرییەوە بۆ دیموکراسی" وەرگێڕانەکەی سەرجەمی لەناو ئێراندا ئەنجام دراوە. ئەمە کارێکی مەترسیدارە، بەلام خەلك بەئەندازەی تەواو ئازابوون کە ئەم کارەیان ئەنجام داوە، بێگومان هێشتا ئەم نامیلکەیە بەشێوەیەکی نایاسایی لەئێراندا دابەش دەکرێن و کۆپی دەکرێنەوە. زانستی ئەم بابەتە

لەئێرانــدا هەیــەو تەنانــەت لەمێــژووی ڕابــردووی ئێرانیشدا ئـەوجۆرە جوڵانەوانـە هـەبوون، بـۆ نمونـە شۆڕشــی مەشــروتە لەســاڵی (1906)و لەشۆڕشــی خەڵك دژبـە شـا کـە هـەمان ئەم هۆکـارە مێژووییانـە، ئەگەری سەرکەوتنی ئەم جوڵانەوانـە لەئێرانـدا زیـاتر دەکات.

***ئایا هیچ دیدگایەکی نوێ لەسـەربنەمای ڕووخـانی دەوڵەتان بەجوڵانەوە ناتوندوتیژییەکانی ئەم دواییە لەزەینی تۆدا هاتۆتەئارا؟**

–پێموایە ئەم تەکنیکە وەك شتێکی شایستەی فێربـوون ناسـراوەو دەتـوانرێ بەهاوبەشـیانە زانـین دەربـارەی بخرێتــەڕوو تــا هەوڵــەکانی دواتــر لــەم بـوارەدا، کاریگـەرترو کـاراترین لـەڕابردوو. پێموایـە ئەمــــە هۆکارێکــــە کــــە ئــــەم کتێبــــە هێشــــتا هەرلەبڵاوبوونەوەدایە.

## پەراوێز

1–ئەم کتێبە، لەلایەن وەرگێڕی ئەم گفتوگۆیەوە کراوە بەکوردیو لەئایندەیەکی نزیکدا چاپ دەکرێت.

## سەرچاوە

سایتی (*www.bashgah.net*).

# ڕەوشتی خێڵ لە دیدی ( د. عەلی وەردی )یەوە

## خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی "سروشتی كۆمەڵگای عێراق"

سەمەد ئەحمەد

كتێبی (سروشتی كۆمەڵگای عێراق) یەكێكە لە كتێبە هەرە دیارەكانی سۆسیۆلۆژی ناسراوی عێراقی (د. عەلی وەردی)، (بەرزان ئەحمەد) لە عەرەبییەوە كردوویەتی بە كوردی. ئەم كتێبە (357) لاپەڕەیەو لەلایەن (خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی چوارچرا)ەوە بە تیراژی (1000) دانە بڵاوكراوەتەوە، وەزارەتی ڕۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستانیش ژمارەی سپاردنی (194)ی ساڵی 2005ی پێبەخشیوە.

سەرەتا دەبێت باس لەوە بكەین كە ئەم كتێبە كورتكراوەی لێكۆڵینەوەیەكی درێژە كە نووسەر 20 ساڵی تەمەنی خۆی بۆ تەرخانكردووە. ئەگەرچی ساڵی نووسینی ئەم كتێبە بۆ سەرەتای ساڵانی پەنجاكانی سەدەی ڕابردوو دەگەڕێتەوە، ئەمەش تەمەنێكی زۆرە، بەڵام لەبەرئەوەی نووسەر كتێبەكەی زۆر بابەتیانەو لەسەر بنەمایەكی زانستی نووسیوە، ئەگەر چی نووسەر زۆر تەوازوعانە دەڵێت: ناوی نانێم لێكۆڵینەوەی زانستی! بۆیە لە دوای تێپەڕبوونی نزیكەی 55 ساڵ بەسەر نووسینیدا، بۆچوونەكانی نووسەر لەسەر سروشت و پێكهاتەی كۆمەڵگەی عێراق نەك هەر ڕاست دەردەچن، بەڵكو هەر دەڵێن لە ئەمڕۆدا نووسراوە و قسە لەسەر كێشە كۆمەڵایەتییەكانی ئەمڕۆی كۆمەڵگەی عێراق دەكات..

لەم گۆشەنیگایەوە من سەر سامی خۆم لەسەر مەسەلەیەك دەردەبڕم، ئەویش ئەوەیە كە لەم كتێبەدا كاتێك نووسەر باس لەسروشت و پێكهاتەی كۆمەڵگەی عێراقی دەكات و ئێمە موتاڵای ڕووداوەكانی ساڵانی سییەكانی سەدەی نۆزدە، تا ساڵانی چلەكانی سەدەی بیستەم لەم كتێبەدا دەكەین، لە زۆر مەسەلەی كۆمەڵایەتی و خوو و ڕەوشت و هەڵسوكەوت و بیركردنەوەی تاكەكانی كۆمەڵگەی عێراق، لەگەڵ ساڵانی پێشودا بەراوردیان دەكەین، جیاوازییەكی ئەوتۆ لە نێوانیاندا بەدی ناكەین. بەمانایەكی دی سەرسامم بەوەی كە كۆمەڵگەی عێراقی بۆچی نەیتوانیوە شانبەشانی پێشكەوتنەكانی سەردەم هەنگاو بنێت و پێشبكەوێت؟ چونكە زیادەڕەوی نییە

گەر بڵێم لە زۆر مەسەلەدا ئەمڕۆی هەر لە دوێنی دەچێت!

ئەمڕۆ کە سەردەمی زانست و زانیاری و کۆمەڵگەی مەدەنی و مافی مرۆڤ و مۆدێرنەیە، کۆمەڵگەی عێراق لە گەوهەردا، لە هەڵسوکەوتدا، لەبیرکردنەوەدا، لەهەمان کۆمەڵگەی خێڵەکییەکانی سەدەی نۆزدەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان دەچێت. ئەگەر وانییە بۆچی کۆمەڵگەی عێراقی لە ئەمڕۆی دوای روخانی رژێمی دیکتاتۆری بەعسدا، لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ یەکتردا تەباین و وڵات ئاوەدان بکەنەوە، وەك سەردەمی والییەکانی عوسمانی، کردەی تیرۆریستی و گیانی دووبەرەکی و کوشتن و تۆقاندن زیندو دەکەنەوە. دەبێت بزانین کە هەموو ئەم سیفەتانە، سیفەتی خێڵەکین و تەواو لەگەڵ سیفەتی شارستانیدا ناتەبان..

نووسەر لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ئەوە بەیان دەکات کە پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە لە نێوان خێڵەکی و شارنشینیدا، ئەم دووە دوو دیاردەی کۆمەڵایەتی تەواو دژ بە یەکن، هەرگیز ئەمیان لەگەڵ ئەویاندا ناگونجێت، خۆئەگەر بە زۆریش بەیەکیانەوە بگونجێنیت، ئەوا لە بچووکترین دەرفەتدا ناوەڕۆکی راستەقینەی خۆیان ئاشکرا دەکەن و زۆر بە توندی بەریەك دەکەون، تەنانەت هەندێ جاریش یەکتر دەبڕن، چونکە ئەو مەبەستەی کە خێلەکییەکان بە شوێنیدا وێڵن و کاری لەسەر دەکەن و مانەوەیان پێوەی پەیوەستە، دژی ئەو هەوڵانەیە کە شارنشینەکان هەوڵی بۆ دەدەن.

(د. عەلی وەردی) دەیەوێت پێمان بڵێت: کە کەسانی خێڵەکی کەسانێکی شەڕەنگێزن و رێز لە ڕاوڕووت و شەڕ دەگرت و رقیان لەو رزقەیە کە بەڕێگەی کار دەست دەکەوێت، بۆیە خێڵەکییەکان هەمیشە بێز لەو کەسانە دەکەنەوە کە کار دەکەن، یان پیشەگەرن، وەك (دارتاشی، ئاسنگەری، جۆلایی، مامۆستایتی،.. هتد)، چونکە بەلایانەوە ئەو کەسانەی کە سەرقاڵی ئەم کارانەن زەلیل و سەرلێشێواون، ئەگەر تۆزێ پیاوەتیشیان تێدابێت، ئەوا واز لەو کارانە دەهێنن و شمشێرەکانیان هەڵدەکێشن بۆ پەیداکردنی رزقێك کە شایانی پیاوانێکی وەك ئەوانە، دیارە ئەو رزقەش لە ڕێگەی تالانی و ڕاوڕووتەوە دەست دەکەوێت، دەبێت بزانین کە تالانی کردن لەلای خێڵەکییەکان کارێکی چاکە و هیچ کەسێك نەك هەر سەرزەنشت ناکرێت لەسەری، بەڵکو دەشتخۆشیشی لێدەکرێت و بە کەسێکی جوامێر دەدرێتە قەڵەم، لەناو خێڵەکەیدا دەبێتە پشتوپەنا، لەم حاڵەدا کەسی شەڕەنگێز ئامادەیە لە پێناوی خێڵەکەیدا شەڕی دوژمنی خێڵەکەی بکات، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە ئەم شەڕە شەڕێکی ڕەوایە، یان ناو چ ئاکامێکی دەبێت؟ چونکە کەسی شەڕەنگێز سەرکەوتنی خۆی لەسەرکەوتنی خێڵەکەیدا دەبینێتەوە، ئەگەر لەم نێوەندەشدا کوژراو تیاچوو، بەوە دڵی خۆی دەداتەوە کە خێڵەکەی ناهێڵێت خوێن بەفیڕۆ بچێت و تۆڵەی دەکەنەوە، بۆیە لە هەردوو حاڵەکەدا، کەسی خێڵەکی و شەڕەنگێز خۆی بەسەرکەوتوو دەزانێت. ئەم رەفتارانە تەواو پێچەوانەی شارنشینییە، کەسی شارنشین سەرقاڵی کارە و شتێکی پیرۆزیش شك نابات کە ناچاری بکات بۆ خۆ تێهەڵقورتان و شەڕکردن، بۆیە کەسی شارنشین وا بیر لە کێشەکان دەکاتەوە کە دەوڵەت بەر پرسە لە بەرامبەر کارە نایاساییەکاندا، هەر ئەویش (دەوڵەت) مافی ئەوەی هەیە سزای تاوانباران بدات، نەك کەسی غەدر لێکراو..

بۆیە دەبینین هەر کاتێك دامەزراوە دەوڵەتییەکان لە هەر وڵاتێکدا بەهێز بووبێت

لەبەرامبەر ئەمەدا دیاردەی دزی و ڕاوڕوت و شەڕوشۆڕ و دووبەرەکی کەمی کردووە، هەروەها کشتوکاڵ و پیشەسازی لە وڵاتدا پێشکەوتووە، هەرکاتێکیش دامەزراوە دەوڵەتییەکان لاواز بووبن، یان لەناوچووبن، ئەوا پاشا گەردانی کەوتووەتە وڵاتەوە و دزی و تالاّنی و تیرۆر و ڕەشەکوژی سەریهەڵداوەتەوە.

ئێمە لە ئێستای دوای رووخانی بەعس واقیعێکی ئاوها بەدی دەکەین. واتا ئەم حاڵەی کە ئێستا عێراقی پیادا تێدەپەڕێت بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن بۆ دروستی ئەم قسانەی سەرەوە.

(د. عەلی وەردی)یش نزیکەی 50 ساڵ لە پێش ئێستا لەم کتێبەدا، لەسەر سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی چەندین نموونەی لەم جۆرە ئێستامان بۆ دەخاتە ڕوو.

ئێستا با پرسیارێك بکەین: ئەو فاکتەرانە چین کەوا دەکەن کەسی خێڵەکی بەرهەم بێت و ببنە خاوەنی سیفەتی شەڕەنگێزی و فەرهودچی و رقاوی و تۆڵەسێن و کەلەڕەق و زۆر سیفەتی نەشیاوی تر؟

(د. عەلی وەردی) بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر فاکتەر دەداتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، یەکێك لەوانە فاکتەری دیمۆگرافییە، پێی وایە کە هەڵکەوتەی نیشتمانی عەرەبی ڕێخۆشکەربووە بۆ دانیشتوانەکەی کە پەیوەست بن بە سیفەتی خێڵەکایەتییەوە و زۆر بە چڕی کار لەسەر ڕۆشنبیری خێڵەکایەتی بکەن، چونکە زۆرترین بەشی بیابان لەسەر گۆی زەوی دەکەوێتە نیشتمانی عەربییەوە. هەڵکەوتەی بیابان ئەو فاکتەرە بووە کە خێڵ تیایدا دامەزرێت، لە سۆنگەی ئەوەوەی کە بیابان وشکاییەو بواری گەشەپێدانی دارو درەخت و کشتوکاڵی تیادا نییە، بۆیە کەسی کارکەرو پیشەگەری تیاهەڵناکەوێت، لەبری ئەمە کۆمەڵگەیەکی داخراو و نەریت پارێز و شەڕەنگێز و ڕاوڕوت چی تیا هەڵدەکەوێت نووسەر لە چەندین جێگەی ئەم کتێبەدا ئەوە بەیان دەکات کە سیفەتی خێڵایەتی وەك شەڕەنگێزی و دەمارگیری و تۆڵەسەندنەوە و توندوتیژی و فەرهودکردن لەلای خێڵە جیاجیاکانی عەرەب و بەتایبەت خێڵە عێراقییەکان، نموونەی سیفەتی باشە و پیاوەتی و جوامێری بووە، بۆیە هەمیشە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە شیعریان بەباڵای ئەم سیفەتانەدا هەڵداوە، یان پەندی جۆراوجۆریان لەسەر ئەم ڕەوشتانە داناوە.

نووسەر زۆر بابەتیانە لەسەر ڕۆشنایی ئەو پەند و شیعرانە، باری کۆمەڵایەتی خێڵە عەرەبەکانمان بۆ شیدەکاتەوە.

ئەمانە هەموو لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر بە پەیژەی ئەم تەرزە باسانەدا هەڵزنێین و بمانەوێت زیاتر لە سروشت و پێکهاتەی خێڵ حاڵی بین، چاکتر وایە قسەیەك لەسەر کاریگەری و ڕەنگدانەوەی هەریەك لە (ژمارەو ناولێنان) بەسەر خێڵەوە بکەین.

خێڵەکییەکان گرنگی زۆر بە زیادبوونی ئەندامەکانیان دەدەن، چونکە بە تاکە هۆی مانەوە و سەرکەوتنەکانیان دادەنێن، ئەوان دەزانن، چەندە ژمارەیان زۆر بێت، ئەوەندە زیاتر تالاّنیان دەستدەکەوێت و لەشەڕەکانیشیاندا سەرکەوتوو دەبن، ئەگەر لە شەڕێکیشدا و لەبەر هەر هۆیەك بێت بدۆڕێن، ئەوا لە دەرفەتێکی تردا نەوەکانیان تۆڵەیان بۆ دەکاتەوە.

نەبوونی ڕێژەیەکی کاریگەر لە بیاباندا، وەك ئەوەوایە کە ئەو خێڵە پشتیوانییەکی نەبێت تا بیانپارێزێت لە دەستدرێژی کردن و تۆڵەی

بسەنێتەوە، لەبەرئەوە ناچار دەبێت پاڵ بە خێڵێکی ترەوە بدات تا رۆژێك دێت رێژەی ئەندامەکانی خێڵەکەی خۆی زیاد دەکاتەوە و لەو خێڵە جیا دەبێتەوە کە پەنای داوە.

دەبێت بزانین کە یەکێك لە شورەییەکانی هەر خێڵێکی بیابانی ئەوەیە کە ژمارەیان کەم بێت، چونکە دەزانن مانەوەیانی پێوە پەیوەستە.

سەبارەت بە رەنگدانەوەی ناولێنانی منداڵ بەسەر کۆمەڵگەی خێڵدا، (د. عەلی وەردی) ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەو ناوانەی خێڵەکییەکان بۆ ناونانی منداڵەکانیان بەکاری دەهێنن، هەمووی لە شێوەی جنێو، یان گیانداری‌ێکی دڕندەدان، ئەوەی سەیرە ئەوە کە ئەم ناوانە بەڵگەن بۆ بەهایەکی کۆمەڵایەتی بەرز لە خێڵدا.

ئەگەر چاوێك بخشێنین بە سروشتی ناوە بەربڵاوەکان لە خێڵەکییەکانی سەردەمی جاهلیدا، بەڕوونی ئەم بابەتی جنێو دانە بەدیدەکەین.

ئەو ناوانەی کە لەسەردەمی جاهلیدا، هەندێکیان ئێستاشی لەگەڵدابێت لەناو عەرەبەکاندا باوبووە، بریتیبوون لە (ظالم– ستەمکار)، (مجرم– تاوانبار)، (حربي– شەڕکەر)، (سیف– شمشێر)، (نمر– پڵنگ)، (کلاب– سەگ)، (ذئب– گورگ) و.. هتد.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە خێڵەکی سەرەڕای ئەو هەموو خۆشەویستییەیان بۆ (ئەسپ و حوشتر)، کەچی ناوی منداڵەکانیان نەناوە (ئەسپ و حوشتر)، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خێڵەکییەکان، گیانداری‌ێکیان خۆشناوێت کە تەنها سودی هەبێت و زەلیل و ملکەچ بێت بۆ خاوەنەکەی و رازی بێت کە کەلوپەل لەسەر پشتی باربکەن، بەڵکو لە بەرامبەر ئەمەدا گیانداری دڕندەو بەلەسەیان خۆشدەوێت.

هەموو دەزانین کە (گوێدرێژ) گیانلەبەرێکی بێوەی و بەسودە بۆ مرۆڤ، بەتایبەتی لەسەردەمی زوودا، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا قێزەونترین گیانلەبەر لەلای خێڵەکییەکان گوێدرێژە، هۆکاری سەرەکی ئەم رقلێبوونەوەیەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە گوێدرێژ تەنها سودی هەیە و هیچ زیانێکی بۆ مرۆڤ نییە!!

لە تێڕوانینمان بۆ ئەم دیاردانە، بیرکردنەوەو رەوشتی خێڵەکییەکانمان زیاتر بۆ دەردەکەوێت.

یەکێکی تر لەو مەسەلانەی کە زۆر بە توندی خێڵەکییەکان لە دژی دەوەستنەوە و هەرگیز گوێڕایەڵی ناکەن و بە مەترسییەکی گەورەی خۆیانی دەزانن، یاسا و دامەزراوەکانی دەوڵەتە.

ئاشکرایە پەیوەندی نێوان شارستانییەت و دەوڵەت پەیوەندییەکی ئۆرگانییە و یەکدی تەواو دەکەن، چونکە شارستانییەت لە ژێر سایەی دەوڵەت و دامەزراوەکانیدا دروست دەبێت و دەوڵەتیش بە مانا فراوانەکەی لە شارستانییەتدا نەبێت گەشە ناکات. چونکە دەوڵەت لە کۆمەڵگەیەکدا گەشە دەکات و جێگیر دەبێت کە رادەی بەرهەمهێنانی زیاتر بێت لە بەکارهێنان، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین: کە مەحاڵە دەوڵەتێك بەمانا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی لە بیاباندا دروست ببێت، چونکە بەرهەم هێنان تیایدا بەشی دانیشتوانەکەی ناکات، چ جای هەناردەی بەرهەم بۆ دەرەوەی سنوری خۆیان.

جگە لەمانەی، کارێکی سەرەکی دەوڵەت بریتییە لە بەرقەرارکردنی ئاسایش و پاراستنی سەروماڵی هاووڵاتیان و دابینکردنی یاسا و وەکیەکی هاووڵاتیان لەبەرامبەر یاسادا، بەڵام بەردەوام بوونی خێڵەکایەتیش پەیوەستە بەشەڕو شۆڕ و تاڵانی و دەمارگیری و تۆڵەسەندنەوە.

جگە لەمانە، دەوڵەت گرنگی دەدات بە خوێندن و خوێندەواری و پیشەسازی و بازرگانی و زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی و دابینکردنی کارو لەناوبردنی بێکاری و زۆر کاری خزمەتگوزاری تر، بەلاَم رەوشت و سروشت و بیرکردنەوەی خێڵەکایەتی بە تەواوی دژی هەموو ئەم پرەنسیپانەن و بە شتێکی تورەهاتی دەزانن.

عەقڵی خێڵەکی هەرگیز بەوە قایل نابێت کە کەسێك هەبێت لە خۆی لە پێشتر، یان گەورەتر، تەنانەت ئەو کەسە ئەگەر دەوڵەتیش بێت، چونکە ئەو باش دەزانێت کارێکی سەرەکی دەوڵەت وەرگرتنی باجە لەو کەسانەی کە سەرمایەکانیان لە خۆیان زیاترە، بۆیە خێڵەکییەکان زۆر بە توندی دژی ئەم کارەی دەوڵەت دەوەستنەوەو لێی یاخی دەبن، هەر ئەم بیرکردنەوەیەشە وایان لێدەکات کە کۆکردنەوەو پاشەکەوتی سامان و ماڵ و دارایی مەسەلەیەکی بێبایەخ و تورەهات بێت.

کاتێك خێڵەکییەکان لە رێگەی شەرەوە سەروەت و سامانی خێڵێکی تر تالاَن دەکەن، چەندە بۆ دەستکەوتی مادی هەوڵدەدەن، لەوە زیاتر بۆ ناو و ناوبانگ و بەدەستهێنانی رێزی کۆمەلاَیەتی زیاترە، چونکە بەم کارانە چەند هێندەی تر ئەو کەسە لەناو خێڵەکەیدا رێزدارتر و بایەخدارتر دەبێت، بۆیە خێڵەکییەکان لە جیاتی ئەوەی سامان کۆبکەنەوە و پارە پاشەکەوت بکەن، کە ئەم دوو سیفەتە دوو سیفەتی دیاری شارنشینین، هەوڵ دەدەن کە رێزوپایەی کۆمەلاَیەتی پاشەکەوت بکەن!

لەم سۆنگەیەوە رەنگە هەڵە نەبین گەر بڵێین: خێڵەکییەکان دیارترین کەسانێکن کە حەز بە شۆرەت و پایەو پلەی کۆمەلاَیەتی دەدەن، هیچ شتێك لەوە خۆشتر نییە کە کەسێك لە خێڵەکەیدا بە جوامێر و ئازا و سەخی ناوبانگ دەربکات.

گرنگترین هۆکار کە پیاوی خێڵەکی دەتوانێت شەرەف و گەورەیی و رێز بەدەست بهێنێت، ئازایی و جوامێرییە، واتا لە یەك کاتدا تالاَنکەر و بەخشەریش بێت، ئەو لە رێگەی ئازاییەوە تالاَنی بەدەست دەهێنێت و لە رێگەی جوامێریشەوە رێز و ناوبانگ بەدەست دەهێنێت.

(د. عەلی وەردی) لە دەمی (سەید عەبدولجەبار)ەوە، لە بارەی خێڵی (شمەر)ەوە کە خێڵێکی ناسراون لە عێراقدا دەڵێت: (عەجیل یاوەر) کە ئەندامێکی خێڵی شمەرە، رێز و گەورەییەکەی لە رێگەی تالاَنکاری و جوامێرییەوە بەدەست هێناوە، چەندە تالاَنکاری دەکرد، ئەوەندە سەرکەوتنی تیا بەدەستدەهێنا و دەستکەوتەکەشی بەسەر ماڵەکانی تری خێڵەکەیدا دەبەخشییەوە. ل 129.

دەبێت بزانین کە لەلای پیاوی خێڵەکی ئەگەر ئازایی و جوامێری نرخێکی هەبێت، ئەوا لە پەنای شەرەفەوە ئەو نرخە بوونی هەیە، شەرەفیش لەلای خێڵەکییەکان تەنها بریتییە لە (ژن)، خێڵەکییەکان زۆر گرنگی بە ژن دەدەن، بەلاَم ئەم گرنگی دانەیان بە ژن جگە لە سوکایەتی هیچی تر نەبووە.

ژن لەلای خێڵەکییەکان وەکو کالاَ سەیر کراوە، بۆیە لە شەرەکانیاندا لەگەڵ یەکدی جیاوازییان لە نێوان حوشترێك و ژنێکدا نەدەکرد، هەردووکیان وەکو تالاَنی و دەستکەوت دەژمێردران، ئینجا هەش بەسەر ئەو خێڵەی کە ژنەکانیان بە تالاَن دەبرا، چونکە هەتاهەتایە بەبێ شەرەف و ئابرو چوو دەدرایە قەڵەم.

هەر لەسەر مەسەلەی ژن و شەرەفی خێڵ، پێویست دەکات قسەی زیاتر بکەین.

وەکو پێشتر وتمان شەر یەکێکە لە پرەنسیپە دیارەکانی مانەوەی خێڵ، بەلاَم دەبێت بزانین کە خێڵەکییەکان تەنها بە شمشێر شەر ناکەن، بەڵکو

جگە لەمە، بە چەکێکی لە شمشێر تیژتر شەڕ لەگەڵ نەیارەکانیاندا دەکەن کە ئەویش (چەکی زمان)ە، واتا (جنێو)دان یەکدی و ریسواکردنی یەکتری، کاریگەری ئەم چەکە زیاتر لەوەدا دەردەکەوێت کە جنێو هەواڵەی دایك یان خوشك، یان ژن بکرێت.

لەم حاڵەدا کەسی جنێودەر هەست بە ئاسودەیی دەکات و وای لێکدەداتەوە کە هەر بەڕاستی خۆی گەیاندووەتە دایك و خوشك و ژنی کەسی بەرامبەر، عەقڵی کەسی بەرامبەریش دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە کەسی جنێودەر هەر بەڕاستی دەستدرێژی کردووتە سەر شەرەفی دایك و خوشك و ژنی ئەم!

لەمەش ئەستەمتر ئەوەیە کە هەندێجار ئەم مەسەلەیە سنوری خێزانیش دەبەزێنێت و وایلێکدەداتەوە کە دەستدرێژی کراوەتە سەر شەرەفی هەموو خێڵەکەی، چونکە شەرەفی ئەم شەرەفی تەواوی خێڵەکەیەتی و شەرەفی خێڵەکەشی شەرەفی ئەمە، بۆیە دەماری پیاوەتی و خێڵایەتی رەپ دەبێت و بەبێ بیرکردنەوە هەوڵدەدەن کە کەسی بەرامبەر بکوژێت، ئەم کارەش نەك هەر بە تاوان نازانێت بەڵکو بە ئەرکی پیرۆزی خێزان و خێڵەکەی دەداتە قەڵەم، ئەندامانی تری خێڵیش نەك هەر سەرزەنشتی پیاوکوژەکە ناکەن، بەڵکو بە قارەمان و بەغیرەت ناوزەدی دەکەن.

ئەوەی لەم مەسەلەیەدا زۆر جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە بۆچی ئەگەر دوو کەسی خێڵەکی لەگەڵ یەکدا بەشەڕهاتن جنێو بەیەك نادەن، بەڵکو جنێو بە دایك و خوشك و ژنی یەکدی دەدەن؟

ئێمە پێمان وایە ئەمە هەروا و لە خۆڕا نییە، بەڵکو لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە جێگەی ئەو چەکە کە جنێوە زیاتر لەسەر کەسی بەرامبەر کاریگەربێت، واتا لەیەککاتدا کار لە رۆح و شەرەف و عەقڵی ئەو کەسە دەکات، بۆیە لەم حاڵەدا عەقڵی خێڵەکی دەبزوێت و لەکاردانەوەیەکی خێڵەکیانەدا کەسی بەرامبەر دەکوژێت.

دەبێت بزانین کە جنێوی شارستانی جیاوازی هەیە لەگەڵ جنێوی خێڵەکیدا، جنێوی شارستانی ئەوەیە کە دوو کەسی بەشەڕهاتوو یەکدی دادەشۆرن بەبێ ئەوەی پەل بهاوێن بۆ کەسی دووەم، واتا ئەندامانی تری خێزان، بەڵام جنێوی خێڵەکی هەریەکسەر سنوری خێزان و لەوێشەوە شەرەفی خێڵ دەبەزێنێت.

بە داخەوە ئەم رەوشتە خێڵەکییە هێند بە ناخی تاکەکانی کۆمەڵدا رۆچووە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەر درێژەی هەیە و بە دەگمەن نەبێت کەم کەسی شارنشینی هەیە، ئەگەرچی زۆرێك لە نەریت و رەوشتی خێڵایەتی بەلاوە ناوەو تەواو مۆدێرنانە هەڵسوکەوت دەکات، بیر دەکاتەوە، بەڵام لەکاتی شەڕدا بەرگی خێڵەکایەتی دەپۆشێتەوە و بە جنێوی پیس و نەشیاو تۆڵەی خۆی لە دایك و خوشك و ژنی کەسی بەرامبەر دەکاتەوە، ئەمەش بۆ کەسی یەکەم ئارام بەخشی و ئاسوودەیی گیانە و بۆ کەسی دووەمیش ئابڕووچوونە!

لەسەر رۆشنایی ئەم مەسەلانە (د. عەلی وەردی) باس لە تێهەڵکێشی رەوشتی شارستانی و رەوشتی خێڵایەتی دەکات و پێی وایە زۆر زەحمەتە بتوانین بە تەواوی سنور لە نێوان خێڵەکایەتی و شارنشینیدا دابنێین، چونکە هەتا ئێستا لە زۆر مەسەلەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فکری و عەقڵیدا کەلتوری خێڵ زاڵە بەسەر کۆمەڵگەی شارنشینییەوە.

ئەوەی لە رۆشنبیری و خوو ورەوشت و بیرکردنەوەی خێڵەکیدا زۆر مایەی سەرسامی و سەرنجە ئەوەیە کە کەسی خێڵەکی لە زۆر مەسەلەدا

هەڵگری دوو پەیامی دژ بە یەکن، واتا لە ناو کۆ (سیاق)ی یەك ڕەوشتدا دوو شتی پێچەوانە ئەنجام دەدات..

بۆ نموونە کەسی خێڵەکی بەوە ناسراوە کە درۆ ناکەن و قسە لە ڕون و فڕوفێڵیان نییە. بەڵام ئەگەر بە وردی لە گەوهەر و سروشتی خێڵەکایەتی وردببینەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم ڕەفتارانە مایەی دڵخۆشی نین، چونکە هیچێك لەمانە لە مرۆڤ دۆستییەوە سەرچاوەی هەڵنەگرتووە، بەڵکو کەسی خێڵەکی بۆیە درۆ ناکات و لە پاش ملە قسە بە کەس ناکات، چونکە پێیوایە کە کەس لە خۆی پیاوتر نییە و هیچ کەسێك نییە ئەم لێی بترسێت، ئیدی چ پێویست دەکات کە درۆ بکات، یان کەسی دی بخەڵەتێنێت، یان لە پاش ملە قسەی پێبکات؟

کەسی خێڵەکی هەر کێشەیەکی هەبێت، ئیدی چەند تڕۆهاتیش بێت، پشت بە عەقڵی کاڵ و ئیرادە و توانای خۆی و خێڵەکەی دەبەستێت و یەکسەر لەگەڵ کەسی بەرامبەردا بەشەڕ دێت و هەر لەوێدا تۆڵە دەکاتەوە! هیچیش لەلای گرنگ نییە کە ئەم کاردانەوەیەی چ ماڵوێرانییەك بۆ خۆی و کەسی بەرامبەر و هەردوو خێڵ دەخوڵقێنێت، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین: کە کەسی خێڵەکی جگە لە ئەمڕۆ هەرگیز بیر لە ئایندە ناکاتەوە.

جگە لەمە کەسی خێڵەکی بەوە ناسراوە کە خاوەنی پەیمان و بەڵێنی خۆیەتی، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیمان و بەڵێنانە زیانی گیانی و ماڵیشی لێبدات، پێی شەرمە لێی پاشگەز ببێتەوە. بەڵام ئەوەی لەم مەسەلەیەدا مایەی نیگەرانییە ئەوەیە کە ئەم ڕەوشتە باشە، سەرچاوەیەکی مرۆییانەی نییە، بەڵکو ئەو بۆیە پەیمان دەدات و لەسەر بەڵێنی خۆی سور دەبێت بۆ ئەوەی ناو و ناوبانگ و پیاوەتی لێوە بە دەست بهێنێت، چونکە پیاوی خێڵەکی پەیمان بە کەس نادات تا نەزانێت بۆی دەبێتە مایەی پیاوەتی و زاڵێتی و جوامێری. ئەگەر هەستی بەوە کرد بەوەفا و پەیماندان نیشانەیەکن بۆ لاوازی خۆی، ئەوا ناچار دەبێت ببێت بەخیانەتکار و غەدار و دوایش شانازی بەم کارەیەوە دەکات.

سیفەتێکی تری خێڵەکایەتی شایانی ئەوەیە سەرنجی بدەین، (دڵسۆزی)یە، خێڵەکییەکان بەوە بەناوبانگن کە دڵسۆزن لەگەڵ یەکدا، بەڵام سەیر لەوەدایە کە ئەمان چەندە دڵسۆزن لەوە زیاتر توند و تیژ و دڵڕەقن، ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە خێڵەکییەکان هەتا سەر لەگەڵ کەسێکدا دڵسۆز نابن، بەڵکو ڕاستتر وایە بڵێین: ئەوان بۆ شەڕکەر و زاڵم دڵسۆزن، ڕووداوەکانی مێژوو ئەوەیان سەلماندووە کە ئەو بزوتنەوەیەی (سیاسی، یان عەسکەریی، یان کۆمەڵایەتی) بێت، پشتی بە کەسانی خێڵەکی بەستبێت، ئەوا سەرئەنجام شکستی هێناوە، چونکە کەسی خێڵەکی هەتا ئەو کاتە دڵسۆزە لەگەڵتدا کە تۆ بەهێز بیت، هەر ئەوەندەی توشی شکست، یان لاوازی هاتیت، ئیتر ئەویش بەبێ بیرکردنەوە لە ڕابردوو و لە ئایندە، یەکسەر لێت هەڵدەگەڕێتەوە و بە توندترین شێوە لە دژت دەوەستێتەوە.

بزوتنەوەی وەهابییەکان کە لە سەدەی هەژدەدا و لە بیابانی عەرەبی سەریهەڵدا نموونەیەکی زیندووی ئەم ڕەوشتەی خێڵەکییەکانە.

خێڵەکییەکان لە کاتی فەتحی مەکەدا بوون بە ئیسلام، لەبەر دوو هۆ، یەکەم لەبەرئەوەی نەکوژرێن، دووەم لەبەرئەوەی سامان و ماڵیان پارێزراو بێت، بەڵام کاتێك پێغەمبەر (د. خ) کۆچی دوایی کرد، زۆرێك لەوانە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە.

ئەم ڕەوشتە هێند رەگی لە كۆمەڵگەدا قوڵە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت زۆرێك لە شارنشینانیش پەیڕەوی لێدەكەن.

دەتوانین هەڵوێستی هەندێ لەو پێشمەرگە خێڵەكیانە بە نموونە بهێنینەوە كە لە كاتی ئەنفالەكاندا بە دڕندانەترین شێوە لە كوردایەتی هەڵگەڕانەوە و سەری هاوڕێ پێشمەرگەكانی خۆیان كرد بە دیاری ڕژێمی بەعس و دواجاریش بوون بە جاشێكی دڵسۆزی ڕژێمی بەعس. بەڵام كاتێك ڕژێمی بەعس لە ڕاپەڕینی 1991دا باری كەوتە لێژی جارێكی تر ئەم جاشانە بوونەوە بە پێشمەرگە و دڵسۆزی كوردایەتی!

سیفەتێكی تری خێڵەكایەتی (میوان دۆستی)یە. خێڵەكییەكان زۆر شانازی بەم ڕەوشتەی خۆیانەوە دەكەن و ڕەخنەش لە شارنشینان دەگرن كە وشك و بێماریفەتن.

ئەم قسانەی خێڵەكییەكان چەندە ڕاست بن، هەر نیوەی ڕاستە، چونكە ئەوان ڕاستە ڕێز لە میوان و كەسی بێگانە دەگرن و پێیان خۆشە و ئامادەشن خۆیان برسی بن و میوانیان تێر بكەن.

بەڵام ئەم ڕەوشتەش وەكو زۆر ڕەوشتی تری خێڵەكییەكانی تر، جگە لە كاڵفامی و ڕەوشتی دژ بەیەك زیاتر هیچی دی نین، چونكە لەیەك كاتدا كەسی خێڵەكی چەندە میوان دۆست و بەخشندەیە، لەوە زیاتر بەخیلە. ئەو هەرگیز چاوی بەرایی نادات و دڵی ئارام ناگرێت ئەگەر ببینێت كەسێك هەیە لە خۆی دەوڵەمەندتر. ئەمە جگە لەوەی كە ئەو میواندۆستیشی بۆ بە دەستهێنانی ناو و پیاوەتی بەكاردەهێنێت.

جگە لەمانە، پیاوی خێڵەكی ئەگەرچی لەگەڵ میوان و غەوارەدا میهرەبان و بەخشندەیە، بەڵام ئامادەیە لە شەڕی خێڵایەتیدا ئەو میوانە بكوژێت، ئیدی ئەگەر ئەو كێشەیە هیچ پەیوەندیشی بەمەوە نەبێت، مادامەكی خواستی خێڵەكەی لەگەڵ كوشتنی ئەو كەسەدایە، ئەو خێڵەكییە میوان دۆستە بەبێ بیركردنەوەو سڵكردنەوە، وەك ئەركێكی خێڵایەتی ئەم كارەی پێئەنجام دەدات!

ڕەوشتێكی تر خێڵەكییەكان (ئیمانداری)یە، بەهای ئاین لەلای خێڵەكییەكان ئەگەرچی پلە دووە و لە دوای بەهای خێڵ و شەرەفی خێزانەوە دێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا خێڵەكییەكان بەوە ناسراون كە لە شارنشینان لە خوا ترس تر و ئیماندارترن، بەڵام ئەم ڕەوشتەش لەناو كۆی خۆیدا دژێكی هەڵگرتووە كە بریتییە لە دووبەرەكی و خۆ بەزلزانین و تۆڵەسەندنەوەو خوێن ڕشتن. بۆیە دەبینین ساتێك لە ساتەكان ئەم دوو ڕەوشتە دژ بەیەكە بەریەك دەكەون.

بۆیە ئەم ڕەوشتەش جگە لەمەسەلەیەكی بێ ناوەڕۆك زیاتر هیچی دی نییە و هەرگیز مایەی دڵخۆشی نییە.

لە مێژوو مسوڵمانانندا ڕووداوی لەم جۆرە گەلێ زۆرە، بۆ نموونە قورەیشییەكان كە خۆیان بە ئیمانداری تەواو دادەنا، بەڵام چەندە ئیماندار بوون، لەوە زیاتر مونافیق بوون.

قورەیشییەكان ئیمامی عوسمانیان خۆشدەویست، بۆیە هەموویان یارمەتییاندا بۆ ئەوەی خەلافەت بكەوێتە دەستی. كاتێكیش خەلافەت كەوتە دەستی زۆرێك لە قورەیشییەكان سامانێكی زۆریان پێكەوەنا. بەڵام كاتێك عوسمان كوژرا، قورەیشییەكان كراسە خوێناوییەكەیان وەك دروشمێك بەكارهێناو توانیان دەسەڵاتی ئەمەوی، كە لەسەربنەمای دەمارگیری دروستبوو دابمەزرێنن.

ئەمانەو دەیان پرەنسیپ و خووڕەوشتی خێڵەكایەتی تر هەیە كە دژ بەیەكن. ڕەنگە

هەڵەنەبین گەر بڵێین: ڕەوشتی خێڵەکییەکان لە ناوەڕۆکدا ئەوەندەی دژی یەکدین و خۆیان لەباردەبەن، ئەوەندە دژی دژەکەی نییە.

ئەم کتێبە هەڵگری زۆر دەلالەتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و سیاسی ترە، کە بەداخەوە ئێمە دەرفەتی ئەوەمان نییە کە موتالای هەموو ئەو دەلالەتانە بکەین و لەمە زیاتر تێی بفکرین.

لە پەراوێزی ئەم چەند دێڕەدا، جگە لە درود بۆ گیانی (د. عەلی وەردی) و سوپاس و ستایش و دەستخۆشی بۆ کاک (بەرزان ئەحمەد) و (خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا) هیچی دی شك نابەم. ماوەتەوە بڵێین ئەمە دووەمین کتێبی (د. عەلی وەردی)یە کە کاك (بەرزان) وەریدەگێڕێتە سەر زمانی کوردی، ئێمە هیواداریین لەم هەوڵدانەی بەردەوامبێت و تەواوی بەرهەمەکانی (د. عەلی وەردی)، ئەوانەی هەتا ئێستا نەکراون بە کوردی، وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی.

لە کۆتاییدا دەمەوێت بڵێم یەکێك لەو کەموکورتیانەی کە ئەم کتێبە و کتێبی (کارە نا ئاساییەکانی نەست)، کە هەر کاك بەرزان وەریگێڕاوە، ناشرین کردووە، ئەو هەموو هەڵەی چاپەیە کە تێیان کەوتووە. ئێمە هیواداریین لە چاپەکانی تری ئەم کتێبانەدا ئەم کەموکورتیانە چارەسەربکرێن.

# مرۆڤی ناپابەندی میشیل لاڤال

پۆل فرانسوا پاولی

لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید



ئەوانەی بەهۆی دیاریکردنی خاڵە لاوازەکان واز لە ئایدیۆلۆجیایەك دەهێنن و گەواهی لەسەر پەرۆشی بۆ رابردوو دەدەن ئەوانە دوژمنی داکۆکیکارانی پەرستگای هەموو کەسێکن. ئارسەر کۆستلەر بە ئالوودەییەوە دەبێتە کۆمۆنیست و دژە کۆمۆنیست. لە تاڤ لاوی دەبێتە هەڵگری خاچی –شۆڕشی پرۆلیتاری– تا کاتی بڵاوبوونەوەی درۆ و دەلەسەی سەراپاگیری کە بە گڕو تینەوە پەیوەندی ئەگنۆستیسیزمی* دیموکراتی دەکات بێ ئەوەی هیچ جارێك ئاشتی و حەوانەوە دەستەبەر کات. ئەمە ئەو سەرکەوتنە ئاشکراو فرە مرۆییەی لەمەڕ پێداویستی و باوەڕکردنە بەودا هاتووە گۆڕانی چڕە کە میشیل لاڤال لە توێی – مرۆڤی ناپابەند و کەسایەتی ئارسەر کۆستلەر و سەردەمەکەی بۆمان دەخاتە ڕوو. بریتییە لە بیۆگرافیای مەزنی ئەو پیاوەی گەر لە ساڵی 1983 بە مردن لە دەس نەخۆشی پارکینسۆن هەڵنەهاتبا ئەوا تەمەنی ئەمڕۆ سەد ساڵێك دەبوو. کتێبەکە قۆناغ دوای قۆناغ باس لە خۆبەخشی بیریارێکی گەورە و بەشداربووی سەدەی پێشوو دەکات. پشکنینەکەی کۆستلەری جۆلەکە و گەنجی هەنگاری نیشتەجێی ڤیەننا بەدوای حەقیقەت لە تەمەنی بیست ساڵی دەست پێدەکات کاتێکە کارێگەر دەبێ بە بیروباوەڕەکانی بیرمەندی ناسیۆنالیستی جوولەکە ڤلادیمیر زییڤ جابوتنسکی کە بۆ بینینی زایۆنیزم ڕوو لە فەلەستین دەکات. ئێمە لە ساڵی 1926 داین بێ ئەوەی بزانین کە ئارسەر کۆستلەر پێشتر کەسێکی شۆڕشگێڕ بووە و کەمتازۆر خەونی بە نوێکردنەوەی مرۆڤایەتی بینیووە بەڵام ژیانی لە –کیبوتز– بردۆتە سەر کە لە راستیدا پەیوەندی پێوە نەبووە. "بۆ چاندنی تەماتە دەبێ خاوەن بەهرەبین و منیش بەهرەمەند نەبووم" لایەنگرێکی نوێ وا دەنووسێ. کۆستلەر لە ساڵی 1930 لە ڕڤاندا ڕوو دەکاتە ئەڵەمانیا. لەوێ بۆ ئەوەی بێتە ڕۆژنامەوان پەیوەندی بەڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیستییەوە دەکات و ئەشکەنجە بە دەست هێڵێکی ڕامیاری سەر بە ڕێبازی فیۆدالی مۆسکۆ دەبینێ و تەنانەت لەگەڵ خودی سۆسیالیستەکان "سۆسیالیستە خیانەتکارەکانی" وەك نازییەکان دەجەنگێ. دەگاتە بڕوایەك کە یەکێتی سۆڤیەت ئەوە نیە کە بانگەشەی بۆ دەدا بەڵام لەو سەردەمەدا بێ کۆمۆنیستەکان هیچ کەس ناتوانێ دژ بە فاشیزم ڕاوەستێ.

کاتێکە بۆ نووسینی ڕاپۆرتێك لەمەڕ جەنگ ڕوو دەکاتە ئیسپانیا لە مەلاگا لەلایەن فرانکوییەکانەوە بەدیل دەگیرێ. لە زینداندا پەی سروشی جیابوونەوەی باڵا دەبات و ناوی – هەستی ئۆقیانووسی– لێدەنێ. پاش ماوەیەکی درەنگ لە یەکێك لە ڕۆمانە هەرە تایبەتەکانیدا کە لە ژێر ناونیشانی – جەنگی

خاچپەرستی بێ خاچ-ە وەسفی خۆشی دوور کەوتنەوە لە چارەنووسی دەکات. کۆستلەر دوای ئەوەی لە مارکسیزم جیا دەبێتەوە بۆ ئەدەب لە دایك دەبێت. لە کاتی بزووتنەوە پاکسازییەکانی ستالینی لە ساڵی 1938 لە کۆمۆنیستی دادەبڕێ و ڕووداوەکەش سروشی نووسینی بەرهەمی - هیچ و هەتایی- پێدەبەخشێ و خێراش دەبێتە ئایین لادەرێکی ڕووخێنەرانە. پاش ئەوەی دەچێتە ئینگلتەرە پەیوەندی بە بەرەی ڕزگاریخواز دەکات و بەشێوەیەکی گەلێ ئاسایی لەلایەن بیریارانی وەك سانت جێرمان دێ پرێ و دومارلۆبۆتی و سیمۆن دوبوڤوارەوە سەرزەنشت دەکرێ. میشێل لاڤال چێژ لە دەرخستنی بانگەشە کاری سەردەم و نێوەندەکان وەردەگرێ. دەتوانێ لە چوارچێوەی کەسایەتی ناسۆزانەی کۆستلەر ئەو کەسە شۆڕشگێڕە بەرجەستە بکات کە لە فەرەنسا بە دەست ساڵانی بوونگەرایی و ماویزمی کۆمەڵایەتی ساڵانی حەفتاکان ئازار دەچێژێ. "ئێمە کە لە ڕیزی پارتەکەدا بووین گۆڕستانی گوازراوی هاوڕێ کوژراوەکانمان بووین. کفتی ئەوان ئاڵای ئێمە بوو. ئەوانی دی کە تەنها خەریکی وەرگرتنی گەرماوی سایەی تیشکی ڕۆژ بوون ئەوان لە سایەی ڕۆشناییەکانی تراویلکەی ساختەکارانەدا هەرگیز لە تەواوی ڕاستیەکان نەدەگەیشتن. ئەوان تەنها لە نیوەچڵ و چارەکی شتەکان تێدەگەن چوونکە بە تەنها نیوەچڵ و چارەکیان بەخشیوە. ئەوان نیوەی بێگەردێتی لە ڕاموسانی گشتی و ئەو ڕوانینە سێکسیە چێژدارە دەهێڵنەوە کە لە کونی دیوارێکەوە لە سۆزانێتی مێژوو ڕادەمێنن..".. کۆستلەر وەك کامۆ و مالرۆ نابێتە پیاهەڵدەری کاپیتالیزمی ئەمەریکایی. بەو ئەمریکایە خۆشحاڵ نابێ کە ئارەزوویەکی ڕەهای بۆ کۆنسیۆمیۆیزم ڕامیاری فرە خەرجکردن - دەبێ و پروپاگەندە قورساییەکی گەورەی دەخاتە سەر. ئەو ئێستا و بەردەوام دەبێتە کەسایەتیەکی ئەوروپای دێرین تەنانەت بیروڕاو بۆچوونی جیاوازیش لە هەمبەر زایۆنیزمی ڕەها وەردەگرێ و سەرزەنشتیان دەکات لەوەی کە ئیسرائیل بە زۆرە ملێ لە چوارچێوەی نیشتەجێبوون خۆی سەپاندووە. کۆستلەر لە زایۆنیزمەوە بەرەو کۆمۆنیزم و لەوێشەوە بەوەهمەکانی پاسیفیزم- ئاشتی گەرایی- و ئەنتی فاسیستیدا گوزەر دەکات و سەرجەم کەشتیەکانی لەسەر جێ قوربانی هزری ڕەخنەگرانەدا دەسووتێنێ. لە ساڵی 1955 دژی سزای لە سێدارەدان ڕادەوەستێ و دەستبەرداری هەڵوێستە جەماوەرییەکان دەبێت. ژیانێکی تایبەت دەباتە سەر و دووچاری نۆراستێنی - ماندووبوونی دەمارەمێشکیەکان - دەبێت. میشیل لاڤال جەخت لەوە دەکات کە هەرچەندە کۆستلەر کوڕی تاقانەیە کەچی ڕقی لە دایکی دەبێتەوە. ئافرەتی خۆش دەوێ هەرچەندە بەردەوام لە گەڵیاندا مشتومڕ دەکات. حەزمان دەکرد زانیاری پترمان لە بارەی ژیانی ئەوینداری ئەم مرۆڤە بێ بنەچەیە هەبێ. هەروەها کۆستلەر بایەخ بە پاراسایکۆلۆجی دەدات. لە مبارەیەوە دەڵێ: "تەنها کردار مەیدانی هزرە و بەڵام هزریش بەس نییە". چی بکەین لە ژیان گەر بێ ئاگابین لەو ئایدیالەی هێز و توانامان دەداتێ؟ ئەمە چیرۆکی پیتەر سلاڤاکی بۆرژواو لاوی کۆمۆنیستی نێو - شەڕی خاچپەرستی بێ خاچ- ە کە

وێنەی دووتنۆك ئاو لەگەڵ کۆستلەر وێکدەچن. ڕۆژێك لە پزیشکە دەروونشیکارەکەی دەپرسێ "چۆن بتوانین بەبێ پابەندبوونی هیچ شتێك بژین؟" و پێی ڕادەگەیەنێ کەوا پاڵنەری پابەندبوون ئەشێ کەمتر گشتی بێت لەوەی قورربانیدار و تۆبەکارانە بێت. پزیشکەکە وەڵامییداوە: "تۆ پابەندی خۆتی و ئەمە دیارییە کە و پێشکەشتی دەکەم". ئەو دیارییەش ژەهراوییەی کە کۆستلەر پتر لە نرخ و بەهای خۆی پێدا بۆ کەسانی سەردەمەکەمان کارێکی نا پێویستە..

## پەراوێز

*Agnosticisme (لاآدریە): دۆکترینێکە لە مەڕ نەهیکردنەوەی بەهای هزر و توانای شکانەوەی دەسەڵاتی هزر بەسەر مەعریفەدا دەدوێ.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی لۆفیگارۆی بەرواری 5ی مایسی 2005.

# دەربارەی هیومانیزم

**ڕیچارد نۆرمان**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

لە بڵاوکراوەکانی کۆمپانیای تایلۆرو فرانسیس –لەندەن، 2004 قەوارە: 184 لاپەڕە.




نوسەری ئەم کتێبە لێکۆڵیار "ڕیچارد نۆرمان"ە، کە پسپۆڕە لە مێژووی فیکری ئەوروپی بە گشتی و لە سەردەمی ڕێنیسانس و ڕۆشنگەریدا بە شێوەیەکی تایبەتی. لەم کتێبە نوێیەدا نوسەر باس لە چۆنیەتی فۆرمەلەبونی هیومانیزم دەکات لە سەرەتای سەدەی شانزەدا، پاشان باس لەوە دەکات کە چۆن ئەم بزاوتە لە هەڵکشاندا بووە، تا ئەوەی لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا گەیشتۆتە ترۆپکی کامڵ بوون.

سەرەڕای هەموو ئەو تاوانانەی فاشیزمی ئەوروپی لە سەدەی بیستەمدا ئەنجامیدا، بەڵام "نۆرمان" ئەمە ناکاتە بەهانەیەك بۆ ئەوەی سەر لە بەری ژیاری خۆرئاوا ئیدانە بکات، وەکی هەندێك کردیان. ئەو لادانانە لە ژیار و ڕۆشنگەری و هیومانیزم، پێویستە زیاتر هانمان بدەن بۆ ئەوەی پابەندبین بە هیومانیزمەوە نەك دەست بەرداری بین.

وەك دەزانین هەندێك قوتابخانەی فیکری بۆ نمونە وەك قوتابخانەی فرانکفۆرت، پاش کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی داوای ئیدانەکردنی مۆدێرنە و ژیاری خۆرئاوا و ڕۆشنگەری کرد، لەبەرئەوەی هەموو ئەمانە نەیانتوانی ڕێگری لەبەربەریەت و دڕندەیەتی و کۆمەڵ کوژی بکەن، تەنانەت لەناو خودی ئەوروپا خۆشیدا. بەمجۆرە ئەم قوتابخانەیە کەوتە گومانکردن لە هیومانیزم و پێی وابوو مرۆگەریی جگە لە وەهم و تراویلکەیەك شتێکی تر نییە.

نوسەری ئەم کتێبە پێیوایە ئەمە وەسفکردنێکی خراپی ئاقاری مرۆگەرییەو بە قازانجی

هێزە ڕاستڕەوە توند ڕەوەکانی ئەوروپا دەشکێتەوە کە بەو کارە نامرۆڤانانە هەستاون، کەواتە ناکرێت دەستبەرداری هیومانیزم و شارستانیەتی تازەبین.

بەڵام داخۆ هیومانیزم چییە و چ وەختێك وەکی بزاوتێکی یەکگرتووی بەهێز لە فیکری ئەوروپپیدا سەریهەڵدا؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا "ریچارد نۆرمان" دەڵێت: (مەبەست لە هیومانیزم ئەو بزاوتە فیکری و ئەخلاقی و ئایینیە مەزنەیە کە بۆ یەکەمجار لە سەردەمی ڕێنیسانس و لە ماوەی سەدەی شانزەهەمدا پەیدا بوو، یەکەمجار لە ئیتاڵیا سەری هەڵداو پاشان گوازرایەوە بۆ فەرەنسا و ئەڵەمانیا و ئینگلستان و تەواوی ئەوروپا).

دەسپێکی ئەم بزوتنەوەیە ئاماژەیە کە بۆ سەرەتای ڕۆژگاری مۆدێرنە لە خۆرئاواو کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەم بزوتنەوەیە جەختی لەسەر لێکۆڵینەوە ئینسانیەکان دەکردەوە، بە تایبەت ئەدەبی یۆنانی و ڕۆمانی کۆن کە سەدەکانی ناوەڕاست بە بیانوی ئەوەی ئەدەبێکی ئیلحادییە، فەرامۆشی کردبوون. جیاوازی سەردەمی نوێش لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاست لەوەدا بوو کە سەدەکانی ناوەڕاست بایەخی بە لێکۆڵینەوە تیۆلۆژیەکان دەدا نەك لێکۆڵینەوەی هیومانستی.

بەمجۆرە بیریارانی ئەوروپا گەڕانەوە بۆ لای فەیلەسوفەکانی یۆنان و ئەدیبەکانی ڕۆمان، هەر لە "ئەفلاتۆن"ەوە بۆ "ئەرستۆ و هۆمیرۆس و فێرجیل". ئەو بیریارانە گەڕانەوە سەر تاوتوێکردنی فیکری بەر لە ئاینی مەسیحی، پاش ئەوەی جاڕس بوون لە دەست سەدەکانی ناوەڕاست و تیۆلۆژیای ئایینی کە خەسڵەتێکی سەرکوتکارانەی هەبوو.

بیریارانی ئەوروپا دەیانویست لە ڕێی ئەو پرۆسەی گەڕانەوەیەوە، کەمێك پشوبدەن و لەو فەزا خنکێنەرەی قەشەکان و کڵێسای مەسیحی دەربازیان بێت. لەبەرئەوە یەکێك لە پێناسەکانی هیومانیزم بریتییە لە: (بوژانەوەی ئەدەبی یۆنانی و ڕۆمانی کۆن، ئەویش لە ڕێی ئاشنابوون پێیان پاش فەرامۆشکردنێکی دوورو درێژ). ئەم پرۆسەیەش لە ڕێی تاوتوێکردنی تێکستە کۆنەکان و سەر لەنوێ چاپکردنەوەیانەوە بە ئەنجام گەیشت، بەتایبەت کە زانای ئەڵەمانی "گۆتەنبێرگ" لە سەدەی شانزەهەمدا، چاپخانەی دۆزییەوە.

وەك دەزانرێت دەستنوسە یۆنانیەکان لە نێوان هەرەسی بیزەنتیە و سوتانی کتێبخانەی قوستەنتینیە لە ساڵی 1453دا، گەیشتنە وڵاتی ئیتاڵیا. ئەو کات زانا یۆنانیەکان لە دەست تورکەکان هەڵاتن و پەنایان بردە بەر ئیتاڵیا و لەگەڵ خۆشیاندا تێکستەکانیان و کلتور و زمانەکەشیان هێنا. لەم سەروبەندەدا فەیلەسوفەکانی ئیتاڵیا ڕاستەوخۆ و لە ڕێی تێکستە یۆنانیەکە خۆیەوە نەك لە ڕێی وەرگێڕانە لاتینیەکەیەوە، ئاشنایەتیان لەگەڵ فیکری "ئەفلاتۆن"دا پەیدا کرد، بەمەش ڕۆحی ئەفلاتۆنیزم تەشەنەیەکی زۆری کرد و کاریگەری هەژمونی مەسیحیەتی دۆگمای لەسەر ئەقڵی ئینسانەکان کەمکردەوە، بەبێ دەستبەرداربوون لە ترنسندنتالیەتی یەزدانی یاخود نمونەی بەرز و باڵا لە بووندا. لێرە بەدواوە ئاقاری مرۆگەری بریتی بوو لە: (بایەخدانی مرۆڤ بەخۆیی و، خۆشی وەها دەدایە قەڵەم کە پێوەری شتەکانە لە بووندا).

ئاشكرایە سەدەكانی ناوەڕاست بە چاوێكی سوك سەیری مرۆڤی دەكرد و بە هیچی نەدەزانی، لەبەرئەوەی پێیوابوو بوونەوەرێكی كاتیە و لە ناودەچێت و كامڵ نییە. هەروەها بەرامبەر توانا و لێهاتووی مرۆڤ ڕەش بین بوو، بە تەنهاش گرنگی بە تیۆلۆژیای ئایینی و ئەو دنیا و غەیب و.. هتد، دەدا. بەڵام هیومانیزم بایەخی بە مرۆڤ دەدا و متمانەی پێدەكرد و لێی ڕا دەبینی كە بتوانێت پێشكەوتن و پەرەسەندن بەدی بێنێت، كەواتە هیومانیزم ئاقارێك بوو گەشبین بوو بە داهاتووی مرۆڤ نەك ڕەشبین بێت.

ئەگەرچی هیومانیزم وازی لە بایەخدان بە ئایین و ئەو دنیا نەهێنا، بەڵام گرنگی زیاتر و زۆرتری بە دنیا دەدا و، دژایەتی و جیاوازیەكی لە نێوان ئەم دوو مەسەلەیەدا نەدەبینی. بەمجۆرە ئەو ئاقارە بە بزاوتی مرۆگەریی ناوی دەركرد، لەبەرئەوەی بایەخی بە مرۆڤ دەدا و دەربەستی بەختەوەركردنی مرۆڤ بوو لە سەرزەوی، نەك سەرقاڵی سەر فرازی بێت لەوە دنیا. لێرەوە فەیلەسوفی مەزنی ئەڵمانی "هیگڵ" سەردەمی ڕێنیسانسی وا ناساند كە سەردەمی ئاشتبوونەوەی مرۆڤە لەگەڵ ئێستادا، چونكە ئیتر مرۆڤی مەسیحی هەر دەرگیری ڕابردوو نەبوو، ئەو ڕابردووەی كە سەردەمی مەسیحیەت و قەشە و پیاوانی كڵێسا بوو، بەڵكو بایەخی بە ئێستا و كێشەكانی ساتەوەختی خۆی دەدا. بە مانایەكی تر وەكی كەسێكی فێندەمێنتالستی ڕابردووخواز نەمایەوەو تەنها هەر چاوی لە سەرچارەنووسی مرۆڤ نەبوو لە دوای مردنی، هێندەی بایەخی بە ژیانی دەدا لەسەر ئەم زەوییە، یان چۆن بتوانێت لە ڕێی پێشكەوتنی زانستی و پزیشكی و گوزەرانیەوە، كێشەو ئازارەكانی كەم بكاتەوە.

لەبەشێكی دیكەی ئەم كتێبەدا "ڕیچارد نۆرمان" دەنوسێت: (مێژوونوسی گەورە — میشێلێ — جیاوازیەكی گەورە لە نێوان ڕۆشنایی سەردەمی ڕێنیسانس و تاریكستانی سەدەكانی ناوەڕاستدا دەكات. هەرچی یەعقوب بۆكهارتی مێژوونوسی بەناوبانگی سویسراشە، ئەوا لەساڵی 1860 كتێبێكی لە ژێر سەردێڕی — شارستانیەتی سەردەمی ڕێنیسانس لە ئیتاڵیادا — نوسی. بۆكهارت لەو كتێبەیدا دەڵێت: بەر لە هەر شتێك سەردەمی ڕێنیسانس واتە سەردەمی تاكەكەس، چونكە بۆ یەكەمجار تاكە كەس لە گروپ یاخود تایەفەیەكی ئایینی گرنگتر دەبێت).

پێویستە سەردەمی ڕێنیسانس و سەرهەڵدانی هیومانیزم و متمانەكردن بە مرۆڤ و توانست و داهاتووی، بە باشبونی هەلومەرجی ئابووری لەو سەردەمەدا ببەستینەوە. تەواوی ئەوروپاییەكان پێیان وابوو دەتوانن هەلومەرجی خۆیان چاكتر بكەن و ئاستی بژێویان بەرز بكەنەوە و چێژ لە خێر و خۆشیەكانی ژیان ببینن. ئەمەش مانای وایە كە ئاقاری مرۆگەری یاخود ڕابونخوازی فرە ڕەهەندە، واتە: كلتوری و ڕۆحی و ئایینی و ئابوورییە.

هاوكات دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت كە هاوشان بەو ئاقارە، تەفسیر كردنێكی تازە بۆ ئایین هاتە ئارا، واتە تەفسیرێك جیاواز لەو تەفسیرە دۆگمایەی لە سەدەكانی ناوەڕاستدا لە ئارەدا بوو. هەروەها دەبێت بزانین ئاقاری مرۆگەری و ڕێنیسانس لە هەمان ئەو سەردەمەدا هاتنە ئارا

که ڕیفۆرمی ئایینی له ئەورووپادا دەستی پێکرد، واته هاوکاته لەگەڵ بزوتنەوەکەی "مارتن لۆتەر"، ئەو بزوتنەوەیەی له سەرەتاکانی سەدەی شانزەهەمدا سەریهەڵداو کەوته دژایەتیکردنی پاپا و کڵێسای کاتۆلیکی و ڤاتیکان. "لۆتەر" بڕوای وابوو مرۆڤ پێویستی به ڕۆڵی پیاوانی ئایینی نییه بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ خوای خۆیدا هەبێت، هەروەها پێویستی ئەوەشی پێیان نییه تا بیروباوەڕ و تێکسته پیرۆزەکانی بۆ تەفسیر بکەن، چونکه خوا خۆی ئەقڵی داوه به مرۆڤ و بەمەش دەتوانێت خۆی ئەو کارانه بکات.

کەواته سەردەمی ڕێنیسانس و هیومانیزم کاریگەریان لەسەر ئایین و چۆنیەتی تێگەیشتن لێی و لێکدانەوەشی به جێهێشت. بەمجۆرە پەیوەندی مرۆڤ به ئایینەوە زۆرئازادانه تر بوو له ڕابردوو، هاوکات ڕۆحانی تر و ئینسانی تر بوو.

له ڕێی پەیوەندیکردن به قوتابخانەی ڕواقیەکانەوە، خەڵکی سەردەمی ڕێنیسانس به دیدگایەکی دیکه ئاشنابوون دەربارەی جیهان و مرۆڤ، جیاواز له دیدگای مەسیحیەت. چونکه ئەم قوتابخانەیه تەئکیدی لەوە دەکردەوە که مرۆڤ بوونەوەرێکی ئازاد و داهێنەرەو دەتوانێت له ڕێی بەکارهێنانی ئەقڵی و بەهرە مەزنەکانیەوە که خواوەند پێی بەخشیووە، شتی زۆر سەرسوڕهێنەر بکات، بۆیه نابێت خۆی تەسلیمی قەدەر بکات و پشت به هێزی دەرەکی ببەستێت وەکی ئەوەی ئەخلاقی مەسیحی تەقلیدی فێری دەکردین، ئەو ئەخلاقەی له سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆمان ماوەتەوە.

لێرەوە مرۆڤی ئەورووپی بەرەبەرە له دەست پیاوانی ئایینی و مۆجیارییه بێتامەکانیان قوتاری دەبوو، که هەموویان باسیان له خۆ له قەرەنەدانی ژیان و پێشکەوتن و کارو بەرهەم هێنان دەکرد، بەلاّم ئەو لەم قۆناغه نوێیەدا پێیوابوو دەتوانێت له ڕێی بەکارهێنانی ژیری و ئەقڵی خۆیەوە به چاکترین شێوە، له قۆناغی هەژاری و برسێتی و نەزانی قوتار بێت. ئەمه بریتییه له هیومانیزم و ئەمه مانای هیومانیزم بووه له سەردەمی ڕێنیسانسدا.

پێویسته باس لەوەش بکەین که بیریارانی ئەو سەردەمه ڕێزێکی زۆریان له مەعریفه دەگرت و بڕوایان وا بوو وا له مرۆڤەکان دەکات باشتربن، چونکه له ڕێی مەعریفەوە مرۆڤ بەرەو پێش دەچێت و له قۆناغی نەفامی و بەربەریەت دێته دەرێ.

یەکێك له هەرە بەناوبانگترین بیریارانی سەردەمی ڕێنیسانس "ئیراسمۆس"ی هۆڵەندییه، که ساڵی 1469 له شاری ڕۆتردام هاتۆته دنیاوە و ساڵی 1536 و له تەمەنی شەست و حەوت ساڵیدا کۆچی دوایکردووە. ئەدەبی یۆنانی و ڕۆمانی کۆنی خوێندووە و کەوتۆته ژێر کاریگەری ئاقارە مرۆگەرانەکەیەوە، بەبێ ئەوەی دەستبەرداری قەناعەتی بێت به ڕوناکی ئەقڵ. وەکی دەشزانرێت "ئیراسموس" ئیدانەیەکی زۆری پیاوانی ئایینی کرد، لەبەرئەوەی ئەو پێیوابوو زۆربەیان نەزان و نەفامن. هەروەها ڕەخنەی ئەوەی لێگرتن که زۆر هەڵوەدای پارە و سامانن به هەر ڕێگایەك بووە. ئەمه له کاتێکدا ئینجیل ئافەرۆزی ئەو شتانه دەکات. لێرەوە به بۆچونی ئەو یەکەم کەس که خیانەت دەرهەق به ئایین بکات پیاوانی ئایینین، سەرەڕای ئەوەی بەشێوەیەکی نا دروست (واته به شێوەیەکی بەرتەسك و دەمارگیرانه)، له ئایین تێدەگەن. ئەوەی زیاد له هەر

شتێکی تر گرنگی پێدەدا، دەمارگیری ئایینی بوو کە بە بکوژی ئەقڵ و کەرامەتی مرۆڤایەتی دەزانی.

"ئیراسمۆس" بانگەشەی بۆ تۆلێرانس و ئاشتی و پێکەوە ژیانی برایانەی مرۆڤ دەکرد، ئەگەرچی لە ڕووی ئایینی و مەزهەبیشەوە جیاوازن. هەروەها داوای ئەوەی دەکرد ڕێز لە ئازادی فیکر و ویژدان بگیرێت و بەمەش پێش فەیلەسوفانی سەردەمی ڕۆشنگەری کەوت و تەنانەت بوو بە ڕابەریشیان.

لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا "ڕیچارد نۆرمان" دەڵێت: (ئەڵبەتە هیومانیزم لە سەردەمی ڕۆشنگەری مەزن، واتە لە سەدەی هەژدەدا گەیشتە ترۆپک و لەو کاتەدا ئەقڵ بە تەواوەتی لە کۆتو بەندەکانی ترادسیۆنی تیۆلۆژیای مەسیحی ڕزگاری بوو، بۆ یەکەمین جاریش سەربەخۆیی خۆی بە دەست هێنا. بەمجۆرە ئەقڵی مرۆڤایەتی توانی هەنگاوی گەورە بۆ پێشەوە بنێت، لە هەموو بوارە زانستی و فەلسەفی و تەکنۆلۆژیە پیشەسازیەکاندا. لەو سەردەمەدا یاخود ماوەیەکی کەم بەر لەو سەردەمە، ژمارەیەک زانای مەزن پەیدابوون کە زانستی نوێیان دامەزراندو ئەو یاسا فیزیاییانەیان دۆزییەوە کە ئاڕاستەی گەردون دەکەن، لەوانە: (گالیلۆ، دیکارت، کیبلەر، ئیسحاق نیوتن). "نیوتن" کاریگەریەکی گەورەی لەسەر فەیلەسوفانی وەک: (ڤۆلتێر و کانت و دیدرۆ و.. هتد)، بەجێهێشت.

لێرەوە فەلسەفە وەک خزمەتکارێکی تیۆلۆژیای مەسیحی نەمایەوە، وەکی سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵکو بووە کایەیەکی سەربەخۆ. بەمەش ئەو بزاوتە ڕەخنەییە بەناوبانگە دەستی پێکرد کە بیروباوەڕی مەسیحی بژارکرد و بەشێوەیەکی ئەقڵانی کەوتە هەڵسەنگاندنی، لێرەدا پێکدادانێکی ترسناک لە نێوان فەیلەسوفەکان و پیاوانی ئایینیدا دروست بوو. ئەم کێشەیەش زیاتر لە دوو سەدە و نیوی خایاند، تا دواجار بەسەرکەوتنی مۆدێرنە و ئەقڵانیەت کۆتایی هات و تیۆلۆژیای کۆنی ئایینی مەسیحیش پاشەکشەی کرد.

بەمجۆرە دەبینین هیومانیزم و ڕێنیسانس وەک دوو بزاوت کە لە سەدەی شانزەهەمدا دەستیان پێکرد و لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا گەیشتنە لوتکە، توانیان پێشکەوتوترین و مەزنترین شارستانیەتی سەرگۆی زەوی دروست بکەن، ئەمەش ئەو شارستانیەتەیە کە هەنووکە تیایدا دەژین و سەرجەم میللەتان و نەتەوەکانی جیهانیش لە هەوڵی لاسایکردنەوە و کۆپیکردنەوەیدان.

**سەرچاوە**

بیان الکتب، 2005/2/27

# "جۆرج براک"ی نیوەکەی تری بیکاسۆ

**سەردەم**




جۆرج براک ساڵی 1963 لە تەمەنی هەشتاو یەک ساڵیدا دوا کۆچی کرد. زۆربەی تەمەنی لە

ژێر گوشاری سێبەری بیکاسۆی هاوسەردەمیدا بەسەربرد، بیکاسۆ دە ساڵ دوای براک مردو، ناوو ناوبانگیشی ئەمەندە سەدەی بیستی داگرت کە هیچ هونەرمەندێکی دی ئەو بایەخەی پێنەدرا. وەلێ براک پێش بیکاسۆ کەوت لەو خەڵاتە دەگمەنەی کە لە فەرەنسای وڵاتیدا پێی بەخشرا، هێشتا لە ژیاندا بوو کە مۆزەخانەی لۆڤەر پیشانگایەکی گەورەی بۆ کردەوە، ئەوەیش ڕێز لێنانێك بوو کە بۆ کەسی دی لە شێوەکارەکانی فەرەنسا نەکرابوو، تەنانەت بۆ بیکاسۆو پێشئەوییش بۆ مونیەو ماتیس.

براك دەورێکی گرنگی بووە لە سەرهەڵدان و بەرەو پێش چوونی کۆبیزم و ئەبستراکتیزم و پریشینیزم، کەچی زۆر لە مێژوونووسان لە نووسینی ژیاننامەیدا سەرنەکەوتوون. تا لەم مانگەدا کتێبێکی "ئەلیکس داتشیف" کە ئاکادیمیەکی پسپۆرە بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی چاپکرا، ناوی کتێبەکە "جۆرج براك: ژیان"ە لە وێدا باس لەوە دەکات کە زۆر جار بیکاسۆ سیفەتی "مەدام بیکاسو"ی داوەتە پاڵ براك بەو حسابەی کە براك "وەتە"ی نەبوە، واتا بێ غیرەت بوەو نەیتوانیوە لە کارەکانیدا سەرکێشی بکات و سەرچڵ بێت، لە کاتێکدا کە براك بۆکس وەشێن و خاوەن جەستەیەکی تەندروست و بەهێز بوەو توانیوەتی هەرکات بیەویستایە سەروچاوی بیکاسۆتیك بشکێنێت. تەنانەت لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بریندار بوەو، گەلێك میداڵی شەرەف و ئازایەتی دراوەتێ.

جۆرج براك لە سیانزەی ئایاری ساڵی 1882 لە نزیك پاریسدا لەدایك بووە، باوك و باپیری پیشانگای فرۆشتنی تابلۆی هونەریان هەبووە. لە ساڵی 1890 دا خێزانەکەی لە ئەرجانتۆوە کۆچی بۆ هاڤەر کردووە، لەوێ بزوتنەوەی پریشینیزم (انطباعیة) سەریهەڵداوە و کلود مونیە و ئوجین بودانی تیابوون. لەوێ براکی لاو فێری ژەندنی نەی بوەو لەگەڵ باوکیدا بەشداری گەشتی هونەری کردوەو لە شێوەکارەکان نزیك بۆتەوە، لە تەمەنی پانزەساڵیدا لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان دەستی بە خوێندنی شێوەکاری کردووە.

زۆری نەبرد کە براك پەی بە نهێنیەکانی پیشەکە برد، ئەوەی پەیوەندی بەوێنەو ڕەنگو دیکۆر ونەخشەوەهەیەو وردەکاریەکانی فێربوو، کە پاشان ئەمانە لە کارە کۆپیزمەکانیدا دەرکەوت. لە نێوان ساڵی 1902-1904دا چووە پەیمانگای هونەرەوە و هەمیشە سەردانی لۆڤەری دەکرد. زیاتر گرنگی بەسەردەمی گریك و میسری دەدا. تابلۆ بەرایییەکانی ئەوەیان دەردەخست کە کاریگەری پریشینزمەکانی لەسەرە، وەك مونیە و کمیل بیسارو. دوای ماوەیەکی کەم لەسەر ڕیشەکەی کاریگەریی سیزان دەرکەوت، براك تا ساڵی 1905 نەیتوانی تایبەتمەندی خۆی هەبێت، کاتێك کە دیدەنی هۆڵی پاییزی لە پاریس کرد و، کاری کێویەکان "المتوحشين" (*Les Fauves*) بە تەقینەوەی ڕەنگ و بوێریەکەیان تەواو سەرسام بوو، لە دوو ساڵی داهاتوودا براك لە نزیك کەنارەکانی دەریای ناوەڕاستەوە ژیا و خۆی بۆ لاسایی کردنەوەی کێویەکان تەرخان کرد، بەڵام زۆر بە پارێز و لێزانیەوە. ساڵی 1907 لە هۆڵی بەهاری هونەرمەندە سەربەخۆکاندا شەش کاری خۆی نمایشداو لە چەند سەعاتێکدا هەموویان فرۆشران.

لەو ماوەیەدا براک گرێ بەستێکی لەگەڵ دیڤید هنری کهنویلر ئیمزا کرد کە وەکیلی هونەری بوو، دیڤید دەورێکی گرنگی هەبوو لە ڕەواج پێدانی هونەری نوێدا. دیڤید براکی بە غیوم ئەبولینیری شاعیر ناساند، ئەمیش بردی بۆ ستودیوکەی بیکاسۆ، بەڵام براک کاریگەریی "کچانی ئافینیون"ی لەسەر نەبوو، ئەم ڕایەی خۆیشی لە هاوڕێکەی نەشاردەوە. بە بیکاسۆی وت "گوێ بگرە، لەگەڵ شرۆڤەکردنی تابلۆکانیشا، پێ دەچێت بتەوێت پەتێك یان بەنزێینێکمان دەرخوارد بدەیت و ئێمە بە ئاگریی تفی بکەیتەوە" لەگەڵ ئەمەیشدا ئەم دوو هونەرمەندە بوونە هاوڕێ و، بیر و بۆچونیان وا لەگەڵ یەکترا متوربە بوو کە بزوتنەوەی کوپیزمی لێ کەوتەوە، لە ڕاستیدا تۆوی ئەم بزوتنەوەیە پێشتریش کەمێك لە هەردووکیاندا هەبوو: بیکاسۆی بوێر و براکی ئەندازیار و ڕەند.

لە پاییزی 1908دا براک تابلۆ بەراییەکانی کوپیزمی بڵاوکردەوە کە ناودارترینیان "ماڵەکانی ئیستاك" بوو، هەر ئەمە وای لە ڕەخنەگری پاریسی لویس فوکسید کرد کە وشەی "کوپیزم" بە شێوازی براك ناودێر بکات. هەروەها ناوی بزوتنەوەکە کە لە سەرەتای شۆڕشی نوێدا هاتبوە گۆڕێ لە هونەری شێوەکاری نا.

لە ساڵی 1912دا براك زەماوەندی لەگەڵ مارسیل لابریدا کرد و ماڵێکی لە (دی رونی) نزیك بە ئەفینیون گرت. دانشیف لە کتێبەکەیدا باس لەوە دەکات کە براك وەك بیکاسو ژن بازنەبووە. بۆیە ژیان نامەکەی هیچ جۆرە چیرۆکێکی وروژێنەری لەو بارەیەوە تیانیە: "دوای ژن هێنانی هەموو سەرکێشیە سۆزاویەکانی کۆتاییان هات. کە بە هیچ جۆرێك سەرنج ڕاکێش نەبوون" ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کە دانشیف زۆر هەوڵیداوە شتێك لەو بارەیەوە لە ژیانی ڕاتستەقینەی براك بزانێت، ئەوەیش بە چاوپێکەوتنی ئەو ژنانەی کە بیکاسۆیان ناسیوە، بە تایبەتی فرانسواز جیلو، کە تاکە ژنێکە بیکاسوی لە ژیانی خۆی دەرکردبێت. دوای ژنە شێوەکاری ئەبستراکتی ئەمریکایی ئیلزورس کیلی، بەڵام هەردووکیان هیچ زانیەریەکی شیاویان لەسەربراك نەبووە. لەگەڵ ئەوەیشدا کە براك و بیکاسۆ بەردەوام بەیەکەوە بوون لە کاتی دروست کردنی کوبیزمدا.

دوای شەری یەکەمی جیهان ساڵی 1914، هاوکاری نێوان براك و بیکاسۆدایە کزی، براك لە ساڵی 1915دا لەو شەڕەدا سەری بریندار بوو، بۆیە ئیکلیلی ئازایەتیان دایەو لە خزمەتی سەربازیشیان بەخشی. تابلۆکانی دوایی تایبەتمەندیان لەوەدا بوو کە بە پێی بیرۆکەو وتەکان ڕەنگەکان دەگونجان، کە پاشان بیر رفیردی هاوڕێی لە یەکێك لە ژمارەکانی "نور – سود"دا کۆی کردنەوە، لەو تابلۆیانەدا براك و بیکاسو لەوەدا جیاوازبوون کە بیکاسۆ ئارەزووی سەرکێشانەی زۆرو براك ئەقڵانی تر بوو. بۆیە بەرەو پێشچوونی براك لە شێوەیەکی بازنەیدا بوو نەك ستوونی و تەقینەوە وەك بیکاسۆ. براك تەکنیکی کۆلاجی خستە سەر تابلۆ و وێنەی دیواربەند کە ناودارترینیان بن میچی لۆڤەرە. هەروەها نەخشەسازی و گەلێك دیکۆری کرد کە بەناوبانگترینیان دیکۆری بالیەی سیرگی دیاجیلیفی ساڵی 1925ە. لە ساڵانی دواییدا کاریگەریەکانی یۆنان و میسری کۆنی گێڕایەوە.

بەرگی کتێبەکەی دانشیف لەسەر ژیاننامەی براك تابلۆیەکی کوبیزمی بیکاسۆیە، وەك دەڵێن تابلۆکە تەمسیلی دەم و چاوی براك دەکات بەڵام لەسەر شێوازی بیکاسۆ. بۆیە سیمایەکی تاڕادەیەك وەهمی و نادیارە، رەنگە خودی بیکاسۆ وای مەبەست بووبێت.

بەڵام دانشیف جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە "لەناوبردنی براك وەك ئەوەی لەگەڵ تروتسکیدا کرا کارێکی مەحاڵە" ئەمەیش ڕاستە هەرچەندە براك نیوەکەی تری بیکاسۆیە، نیوکەمەکەی لە درەوشانەوەو شێتیەتی و بلیمەتیدا.

سەرچاوە

الحیاة 2005/7/18

# فەلسەفە..

# قۆناغەکانی پەرەسەندنی لە چاخەکاندا

**ئەندریە کۆمت سبونفیل**

**لە عەرەبییەوە: نەوروز حسێن**

نوسەری ئەم کتێبە، فەیلەسوفی بەناوبانگ، ئەندریە کۆمت سبونفیل، پێشتر مامۆستای زانکۆی سوربون بووە، ئێستاش خۆی تەواو بۆ تۆژینەوە و نوسین تەرخان کردووە. لەوەو پێش چەند کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە وەك (وتارێك سەبارەت بە بێئومێدی و دڵخۆشی – 1984)، (وتارێکی بچوك سەبارەت بە فەزیڵەتە گەورەکان – 1995)، (فەرهەنگی فەلسەفی – 2003)، کە ناوبانگی بێوێنەیان بەخۆوە دیوە.



نوسەر یەکێکە لە نەوەی دووەم کە بەدوای فەیلەسوفە گەورەکانی وەك میشیل فۆکۆ، جیل دولوز، جاك دیریدا و لویس ئاڵتوسیر.. هتد دا دێت، سەرەتا خوێندکاری ئەوان بووە پاشان رێچکەی خۆی دۆزیوەتەوە و خۆی لەوان جیا کردۆتەوە. بەوەش ناسراوە کە توانای ساناکردنەوەی بابەتە فەلسەفیەکان و وتەزا فەلسەفیەکانی هەیە بۆ خوێنەرە ئاست مامناوەند و تەنانەت بۆ خوێنەرە ئاساییەکانیش.

دیارە نوسەرانی کتێبە فەلسەفیەکان دابەش دەبنە سەر دوو بەش، بەشێکیان ئەوانەن کە خوێنەرانی پسپۆڕ لەو بوارەدا تێیان دەگەن، ئەویش لەبەر گرانی و ئاڵۆزی، بەشەکەی تریان ئەوانەن کە خوێنەر بە گشتی لێیان تێدەگەن چونکە بە زمانێکی سانا و بێ گرێ و گۆڵ دەینوسن.

نوسەری ئەم کتێبەمان لە بەشی دووەمە، بۆیە کتێبەکانی ناوبانگیان هەیە و بە دەیان هەزار و بگرە سەدان هەزاری لێ چاپ و بڵاو بۆتەوە، فرۆشی واش بۆ کتێبی فەلسەفی ناوازەیە، چونکە کتێبی فەلسەفی گەر بازاڕیشی هەبێت ئەوجا پێنج تا دە هەزار دانەی لێ چاپ و بڵاو دەبێتەوە.

نوسەر لەم کتێبەدا چاوێکی گشتی بە مێژوی فەلسەفەدا دەخشێنێت هەر لە سەرەتاوە لای گریکەکانی پێش دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەوە تا ئەمڕۆ. کتێبەکەش لە سێ بەش پێکهاتووە جگە لە کۆتایی و پێرستی ژێدەر و سەرچاوەکان،

بەشی یەکەمی کتێبەکە بە ناونیشانی "فەلسەفە چییە؟"دەست پێ دەکات و وەڵامیش ئەوەیە کە فەلسەفە وتارێکی ئەقلانیە لەسەر دونیا و شتەکان، چونکە فەلسەفە تیوربەندییەکی ئاقلانەو وریایانەیە کە یاریدەمان دەدات بۆ چۆنیەتی بەرەنگار بوونەوەی گرفتەکانی ژیان و نەترسان و نەسڵەمینەوە لێیان وێرای ئاڵۆزی و کتوپڕیی هاتنیان. فەیلەسوفی گەورەش ئەو کەسەیە کە چەندێ لە کتێبەوە فێر دەبێت هێندەش یان زیاتر لە ژیان خۆیەوە فێر دەبێت.

لەم ڕووەوە سوکرات بەڵگەیەکی گەورەیە کە لە نێوان ساڵەکانی 470–399 پز دا ماوەی حەفتا ساڵێك ژیا، کە لە بازاڕدا بە خەڵکی دەوت "خۆت خۆت بناسە"، واتە فەلسەفە کردەیەکی شاراوەی ناو خودە و میتۆدێکە بۆ تێڕامان یاریدەدەرمانە بۆ ناسینی خۆمان بەشێوەیەکی ورد. ئیدی بەوەش پەی بە هۆکارەکانی ناتەواوی و ناحەزیی خۆمان دەبەین و چۆنیەتی چاککردنەوەیان و خۆلادان و لە ناحەزیەکان دەناسین. واتە فەلسەفە سودی پراکتیکیشی هەیە.

لەکاتێکدا ئێمە بە پێچەوانەی ئەمەوە، تەواو خۆمان ناناسین و نازانین بۆچی بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕەفتار دەکەین، یان لە کاتی تردا مەیلی خەم یا خۆشی دەکەین، بۆیە قوڵبونەوە بۆ ناو خودی خۆمان و بۆ ئاشنابوون بە پێکهێنەرە دەرونیە ناوەکیەکانی کەسێتیمان کارێکی پێویستە. ئەوەتا هەریەکێك لە ئێمە لە شوێنێکی دیاریکراودا لەدایك بووە و کاریگەری تایبەت لە منداڵی خۆی و دواتر لە خێزان و کۆمەڵگەکەی وەرئەگرێ و دوای گەورەبوون لە بیریان دەکات، بەڵام ئەم شتانە ئێمە لە یاد ناکەن، بە بەڵگەی ئەوەی تا هەنوکە کاریگەرییان لەسەر هەڵوێستمان سەبارەت بە ژیان هەیە و هەروەها کاریگەرییان لەسەر چۆنیەتی کاردانەوەکانمان هەیە بێ ئەوەی خۆمان هەستی پێ بکەین.

لەبەر ئەمە چەند بچینە ناواخن و قوڵایی کەسێتیمانەوە، پێویستە ئاوڕێك بۆ دواوە بدەینەوە و هەوڵی گرتنی ئەو سەرداوە بدەین کە ڕابردومانی بە ئێستاوە گرێداوە، وەك چۆن منداڵی بە پیرێتییەوە گرێ دەدا.

لەم ڕووەوە دەکرێ بڵێین سوکرات لە دەرونشیکاریدا پێش فرۆید کەوتوە، بەوەی کە وتویە: "خۆت خۆت بناسە". فرۆید ئەمەی کردو چووە قوڵایی منداڵیی خۆیەوە و هەوڵیدا لە پەیوەندییەکانی نێوان خۆی و دایکی و خۆی و باوکی تێبگات و ترسە نادیارەکان و ئەو ڕەفتارە بنچینەییانەی کە کەسێتیەکیان بۆ دروستکردووە بناسێ.

لەوێوە توانی لەوگرێ – دەرونییانەی خۆی ڕزگاری ببێت کە بەربەست بون و ڕێگری بون بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن لە ژیاندا. واتە پێویست وایە لەسەر هەر یەکێکمان جارناجار لە خودی خۆی بپرسێتەوە و ئەمدیواودیوی بکات بۆ زانینی ئەوەی ئایا چیمان کردووە و چیمان نەکردووە و بۆچی بەو شێوە یان ئەو شێوە مامەڵەمان لەگەڵ کەسانی دی کردووە و ..هتد.

پرۆفیسۆر ئەندریە کومت سبونفیل، کاتێك دێتە سەر باسی فەیلەسوفە گەورەکانی گریك، وەك سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ، هەڵوێستە دەکات و دەڵێت، ئەفلاتون باوەڕ بە دنیایەکی هاوشێوەی ئەم دنیایە هەیە لە ئاسماندا، بەڵام ئەرستۆ دنیابینی بوەو گرنگی داوە بە دنیای زەمینی و گرفتەکانی و

دیاردەكانی. واتە فەلسەفەی ئەفلاتونی ئایدیالیزم و فەلسەفەی ئەرستو دنیابینی یا ماتریالیزم بوە. هەمیشەش مێژوی فەلسەفە دابەشی ئەم دوو لایەنە بووە، ئایدیالیزم و ماتریالیزم.

تێبینی ئەوەش دەكرێ كە فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی، هەمان شێوە، دابەشبوون بۆ شوێنكەوتوانی ئەرستۆ و شوێنكەوتوانی ئەفلاتون، بۆ نمونە ئیبن روشد، بێ شك، لە شوێنكەوتوانی ئەرستۆ بوەو بەشێكی زۆری ژیانی خۆی تەرخان كردبوو بۆ ڕاڤەی كتێبەكانی ئەرستۆ و قسەكردن لە بارەیانەوە، بۆیە بە ڕاڤەكاریش ناسراوە. دیارە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە ئیبن ڕوشد لاساییكار یان شوێنكەوتویەكی كوێر بوبێ، بەڵكو داهێنەر بووە و سودی لە میتۆدی ئەقلانی ئەرستۆ وەرگرتووە بۆ ڕاڤەی مەسەلە ئاڵۆزەكانی سەر بە فیكری عەرەبی ئیسلامی.

هەروەها لۆژیكی ئەرستۆ یارمەتیدەری بووە بۆ چۆنیەتی بینینی پەیوەندی نێوان ئەقڵ و ئاین. ئەمە ئەو شیكارە ماقوڵەی دایە كە تا ئەمڕۆ بە بوێری و توندی و تۆڵییەكەی سەرسامی كردووین، ئەویش لە كتێبە بەناوبانگەكەی: "وتارێك دەربارەی پەیوەندی نێوان شەریعەت و حیكمەت"، لێرەدا، بێشك مەبەست لە حیكمەت، فەلسەفەیە. هەر ئیبن ڕوشد خۆی دەڵێت، بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ نەزانەوە، هیچ دژوارییەك لە نێوان فەلسەفەو ئایندا بەدی ناكرێ، بە مەرجێ بە شێوەیەكی ڕاست لە ئاین و قورئان تێبگەین و ئەوەتا قورئان لە ئایەتەكانیدا چەند جارێك بانگهێشتمان دەكاتە سەر ئەقڵ.

لەولاوە ئیبن سینا شوێن ئایدیالیزمی ئەفلاتون و قسە فەلسەفیەكانی كەوتوە، بۆیە دواتر بیری بەرەو جۆرێك لە سۆفیگەری گۆڕاو دوركەوتەوە لە ماتریالیزم و هۆی ئەمەش هەندێ لە شاگردەكانی بونە سۆفیی گەورە. لەمەشەوە فەیلەسوف، یان گرنگی بە دنیای زەمینی و بوونی هەستپێكراو واتە ماتریالیزم دەدات، یان گرنگی بە دنیای میتافیزیك و دنیای ئایدیا و ئەبەدیەت و نەمری، واتە ئایدیالیزم دەدات، یان گرنگیی بە هەردوولا دەدات.

دواتر، نوسەر مێژوی فەلسەفە دابەشی سێ قۆناغ دەكات، قۆناغی گریكی، قۆناغی سەدەكانی ناوەڕاست و قۆناغی چاخە نوێكان. وەك دیارە، قۆناغی سێیەم بە "دیكارت" دەست پێدەكات، كە یەكێكە لە گەورە فەیلەسوفە ئەقڵانیەكان لە مێژودا و میتۆدێكی كاریگەری پێشكەشی خۆرئاوا كرد و خۆرئاوای گەیاندە لوتكەی ژیاری و پێگەیشتن ئەویش لە كتێبە بەناوبانگەكەی "وتارێك دەربارەی میتۆد"، تیایدا میتۆدەكەی ئەرستۆی ئاوەژو كردەوە كە لە دۆخی وەستان و جامبووندا بوو، و میتۆدێكی نوێی هێنایە ئاراو دەیوت، ئامانجی فەلسەفە ئەوەیە كە یاریدەمان بدات بۆ دۆزینەوەی ئەو یاسایانەی باڵادەستن و بەسەر گەردوندا دەمانگەیەننە پلەی سەروەریی بەسەر سروشتدا.

دەتوانرێ بوترێ خۆرئاوا تا ئەو كاتەی میتۆدی دیكارتی نەكردە مارش، هیچی نەكرد و نەیتوانی بگاتە داهێنانی نوێترین ئامێری تەكنەلۆژی و كۆنترۆڵكردنی سروشت، چونكە پێشان مرۆڤ لە سروشت و چەخماخە و هەور و لافاو و زریان دەترسا و دواتر بە پێشكەوتنی زانست و داهێنانی

ئامێری نوێ توانی بەرەنگاری ئەو دیاردە سروشتیانە بێتەوە و لێیان تێبگات و چیتر لێیان نەترسێت.

گرنگی زانستی نوێ و فەلسەفەی ئەقلانی لێرەدایە کە گەیاندوینی بەم پێشکەوتنە ژیارییەی، هەنوکە درکیان پێ دەکەین. واتە فەلسەفە پێکنەهاتووە لەو وتارە وشکانەی دەنرێن بە بۆشاییەوەو ئەو واژە نارون و گرانانە نیە کە تێگەیشتنیان ئاسان نیە، بەڵکو وتارێکی ئەقلانیە و یاساکانی گەردون یان کۆمەڵگەمان بۆ ڕاڤە دەکات و یاریدەمان دەدات بۆ شیکارکردنی ئەو گرفتانەی دێنە ڕێمان، گەر وانەبێت، واتە شایانی ئەوە نیە ساتە وەختێك بۆ فێربوون و لێکۆڵینەوەی بەفیڕۆ بدەین.

لێرەوە بوو کە گەورە فەیلەسوفان لە ڕۆڵی فەلسەفە و بانگەوازی فەلسەفە تێگەیشتن. بەمەش فەلسەفە لە خۆرئاوادا پەرەیسەند و بووە هۆی ئەم پێشکەوتنە ژیارییەی وا ئێستا لە فەرەنسا و ئینگلتەرە و ئەڵمانیا و تەواوی ئەوروپا و ئەمریکای باکوردایە.

بەڵام هەر کاتێك فەلسەفە لە کۆمەڵگەیەکدا بمرێ، ئەوا بیری ئەقلانیش دەمرێت، وەکی ئەوەی لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامی لە دوای ئیبن روشد ڕوویدا. بەوەی بیری (غەیبی) پەرەی سەند و کۆنترۆڵی ئەقڵی عەرەبی کرد و چیتر بە شێوەی ئەقلانی (فەلسەفیانە) بیر نەدەکرایەوە و بیری فەلسەفی لە جیهانی عەرەبی ئاوا بوو، چونکە ئیبن روشد لە ساڵی 1198ز، واتە لە سەرەتای سەدەی سیانزەدا مرد و ئەم ئاوابونەش تا دروستبوونەوەی پەیوەندی بەخۆرئاواو تازەگەریی ئەوروپییەوە، واتە تا سەدەی نۆزدە درێژەی کێشا. واتە بەلای کەمەوە شەش سەدەی خایاند، کە لەم شەش سەدەیەدا تازەگەریی فەلسەفی هاتبوە ئارا و زانایان و بیرمەندانی گەورەی وەك گالیلیو، دیکارت، لایبنتز، سپینوزا، نیوتن و.. هتد دەرکەوتبون.

دانەری کتێب، دێتە سەر ئۆگست کۆنت (1798-1857ز)، کە دامەزرێنەری (فەلسەفەی وەسفی)یە لە فەرەنسا و پێشەوای ئەقلانیەتی زانستیە دوای دیکارت. ئەوکات فەلسەفەکەی ئۆگست کۆنت لە هەموو ئەوروپادا بلاوبوەو ئێستەش بە شێوەیەك لە شێوەکان بونی هەیە.

ئۆگست کونت مێژوی مرۆڤایەتی دابەشی سێ قۆناغ کردووە و دەڵێت، ئەم مێژوە بەو سێ قۆناغە بنەڕەتیەدا تێپەڕیوە، ئەوانیش قۆناغی باری تیولوژیا (لاهوت)، باری میتافیزیکاو دواتر باری زانستی (یاخود پۆزەتیفیزم) کە ئۆگست کۆنت خۆی سێیەمیانی داڕشتوە. هەروەها مرۆڤایەتی زۆرترینی سەدەکانی (لە مێژودا) لە تیولوژیای غەیبانیدا بەسەر بردووە، کە دەیویست مانایەك بدات بە دیاردەکانی گەردون، وەك هەورەگرمە و بروسکە و باو بۆران و.. هتد کە هێزی شاراوەو نەبینراو لە پشتیانەوەن.

مرۆڤی ئەوروپی، تا سەدەکانی ناوەڕاست لەم بارەدا بووە، چونکە تا ئەم زەمەنە تیولوژیای مەسیحی بالادەست و فەلسەفە و زانست بێهێز و ئاسایی (یان لاوان)بوون. بۆیە دەبوو مرۆڤ هەست بە بێدەسەلاتیی خۆی بکات لە ئاست دیاردە سروشتیەکان و لێیان بترسێ، کە نهێنی و سەرچاوەکانیان پێ نازانێ. ناچار پەنا براوەتە بەر شیکاری غەیبی کە کاری کاهینەکان و پیاوە ئاینییەکان بووە ئەمانەیان بۆ ڕوون بکەنەوە.

پاشتر مرۆڤایەتی کەوتە باری دووەمیانەوە، قۆناغی میتافیزیکا کە لە قۆناغی یەکەم باشتر بوەو لێرەدا مرۆڤ بوە ئەو بونەوەرەی تا ڕادەیەک ئەقڵی خۆی بەکارهێنا بۆ تێگەیشتن لە دیاردەکان. ئەوجا مرۆڤایەتی گواسترایەوە بۆقۆناغی پۆزەتیفیزم (یاخود زانستی پەتی)، تیایدا ئەقڵ بێ هیچ دژواریەک بوە ڕابەری هەڵوێستەکانی خۆی. ئیدی زانستی فیزیا لە ئەوروپادا زۆر پەرەی سەند و توانی دیاردە سروشتیەکان لە ڕێی یاسا هۆکارییەکانەوە (کە نیوتن بەشێوەیەکی بنەڕەتی دۆزینیەوە) لێك بداتەوە.

واتە قۆناغی پۆزەتیفیزم بەرزترین و باڵاترین قۆناغی مرۆڤایەتیە، کە لوتکەی پەرەسەندنی ئەقڵانیەتە و چیتر مرۆڤ زانستیانە و واقیعیانە و هەستپێکراوانە لە گەردوون تێگەیشت و تەومژی میتافیزیکا و خورافە و خەیاڵ ڕەوینەوە و مرۆڤ بووە گەورە و کۆنترۆڵیاری سروشت.

وەك ئەوەی دیکارت بۆی چوو بوو، ئیدی فەلسەفە تەواو بووە زانست و قۆناغەکانی ئەرستۆی تێپەڕاند. چونکە زانستی نوێ زانستی سەردەمی ئەرستۆی بەشێوەیەك تێپەڕاند، کە ناپێوڕێت.

پاشتر ئۆگست کۆنت زانستەکانی بەگوێرەی گرنگییان پلەبەند دەکات، زانستی ماتماتیک، زانستی گەردون، زانستی فیزیک، زانستی کیمیا، زانستی بایولوژی و زانستی کۆمەڵناسی، کە ئامانجی ئەم زانستانە یارمەتیدانی مرۆڤە بۆ دۆزینەوەی یاساکانی سروشت و گەردون، تا کۆنترۆڵیان بکات.

پێشکەوتنی ئەم زانستانە بوو وای لە خۆرئاوا کرد لە هەموو گەلانی سەرزەمین پێشکەوتوتر بن. لە کۆتاییشدا ئامانجی ئۆگست کۆنت ئەوە بوو کە لە کۆمەڵگەدا سیستەمێك بهێنێتە ئارا بۆ چیتر ڕونەدانی پێکدا هەڵپژان و ئاژاوە. بەمەش باوەڕ لە نێوان هەموو تاکەکاندا، لە ناویاندا تاکەکانی چینە میللی و کەمدەستەکان، دروست ببێت. زیادترین شتێك کە ئۆگست کۆنت لێی دەترسا تێکچونی باری ئاسایی کۆمەڵگە بوو بە هۆی هەڵگەڕانەوە یاخود یاخیبونەوە، چونکە خۆی لە ماوەی شۆڕشی فەرەنسی و کەمێك دوای شۆڕشەکە ژیانی بەسەر بردووە.

دیارە گەلی فەرەنسی زۆری بەم دەردەوە ناڵاند ئەو بارە نائاساییە، ئەم فەیلەسوفەی تا ڕادەیەکی زۆر بێ تاقەت کردبوو، بەجۆرێك کە هەوڵیدا چارەیەك لە ڕێی فەلسەفەی ئەقڵانیەتەوە بدۆزێتەوە. کەواتە کێن ئەوانەی دەڵێن فەلسەفە سودی بۆ کۆمەڵگە نیە؟ یان کێن ئەوانەی دەڵێن فەیلەسوفان لە (لە بورجی عاج)دان و بایەخ نادەن بە کاروباری ڕۆژانەو ئەو بارانەی مرۆڤ بە دەستیانەوە دەناڵێنێ؟ ئەم بۆچونە هەڵەیە و دوورە لە فەلسەفەوە. بۆیە ئەوانەی کاروبارەکان لە ڕادەی پێویست زیاتر ئاڵۆز دەکەن و وتەی ناڕون و شاراوە و کەم تێگەیشتن بەناوی فەلسەفەوە دەنوسن، هەڵەن. چونکە هەر فەیلەسوفێکی گەورە ویستویەتی بانگەوازێکی ڕوون بە مرۆڤایەتی بدات. ئەم وتەیەش لە دوای ئەرستۆ بەسەر گەورە فەیلەسوفی ڕۆژئاوا (کانت)دا دەچەسپێت و دواتر هیگل و مارکس و بیریارە گەورەکانی دیکەش ئەگرێتەوە، هەرچەندە کانت و هیگل شێوازیان گرانیش بووە.

## سەرچاوە

بیان الکتب 2005/5/2

# سەرەتای فیکری فەرەنسی مۆدێرن

**میکائیل مۆریاتی**

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

لە بلاوکراوەکانی زانکۆی ئۆکسفۆرد
2005
قەوارە: 286 لاپەڕەری مام ناوەندی




دانەری ئەم کتێبە توێژەری ئینگلیزی "میکائیل مۆریاتی)ە، کە پسپۆرە لە مێژووی فەلسەفەی فەرەنسی. ئەو لێرەدا چاوپیاخشاندنێکی مێژووییانەی قوڵ و درێژمان سەبارەت بە سەرەتاکانی فەلسەفەی مۆدێرن لە فەرەنسا دەخاتە بەردەست. ئاشکرایە دیکارت خاڵی سەرەتایە نەك تەنها بۆ فەرەنسا، بگرە بۆ هەموو جیهانیش. ئەوە دیکارت بوو گەورەترین کودەتای فەلسەفی بەسەر (ئەرستۆ)دا کرد و لەسەر عەرش هێنایە خوارەوە کە بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ دەستی بەسەردا گرتبوو. هەر دیکارت بوو فەلسەفەی مۆدێرنی لەسەر ئەساسی لۆجیك بیرکای و زانستی فیزیا و تیۆرەی کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ بۆ گەردون، دامەزراند. ئەو تیۆرەیەش پێچەوانەی تیۆرەی (بەتلیمۆس) و (ئەرستۆ) بوو کە دەیوت زەوی ناوەند و جێگیرە و رۆژ بە دەوریدا دەسوڕێتەوە، بەلام کۆپەرنیکۆس و دوای ئەویش گالیلۆ تەواو پێچەوانەی ئەوەیان سەلماند، زەوی جێگیر نییە بەڵکو دەسوڕێتەوە و بە دەوری خۆشیدا دەسوڕێتەوە، وەك لە ئێستادا سەلمێنراوە. دانەر لە سەرەتادا ئاوا دەڵێ: کاتێ دیکارت لە سەدەی حەڤدەدا دەرکەوت، ئەو دەم خەڵك لە حاڵەتی گەڕاندا بوون بە شوێن مورشیدێکی رۆحی رێگایان پیشان بدات. ئیدی دوای ئەوەی دیکارت لە ساڵی 1637 کتێبی (وتارێك لەسەر میتۆد)ی بلاوکردەوە، ئەوە مانای ئەوەی دەگەیاند کە ئەو رێگایەی خەڵکی بە شوێنیدا دەگەڕان هاتە ئاراو دەتوانن پێیدا تێپەڕن و ئەو کەسەش رێگاکەی دۆزیوەتەوە (رێنیە دیکارت)ە. لەبەر ئەم هۆیەیە هەندێك دەڵێن فەلسەفەی دیکارتی سەدەی حەڤدەی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، هەروەها ئەم فەلسەفەیە بە تەنها رێگای لەبەردەم فەرەنسیەکاندا رووناك نەکردەوە، بەڵکو رێگای بۆ هەموو ئەوروپا روناك کردەوە. بەم شێوەیە فەلسەفەی دیکارت شوێنیفەلسەفەیئەرستۆتالیسی گرتەوە، دوای دەرکەوتنی ئەم فەیلەسوفە بلیمەتە (رینیە دیکارت) چیتر خەڵك پێویستیان بە ئەرستۆ نەمابوو.

دیکارت هاوکێشەیەکی فەلسەفی یاخود پێکهاتەیەکی تەوفیقی خستە بەردەم گەلانی ئەوروپا کە عەیامێك بوو چاوەڕوانییان دەکرد. لێرەوە گرنگی دیکارت لە مێژووی فیکردا دەردەکەوێت. ئێستا با بزانین دیکارت کێیە؟

ساڵی 1595 لە باشوری رۆژئاوای فەرەنسا لە دایکبووە. ساڵی 1604 چووەتە قوتابخانەی یسوعییەکانەوە، واتە قوتابخانەی برایانی مەسیحی، لەوێ پرنسیپەکانی زانستی و ئاین فێرکرا. لەو

سەردەمەدا هەموو قوتابخانەكان قوتابخانەی ئاینی و پاشكۆی دێرەكان بوون. هاوكات دیكارت گەرچی بەشێوەیەكی گشتی سەرسام بوو بە مامۆستاكانی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەی لە پڕۆگرامەكانی خوێندن دەگرت و بە پڕۆگرامێكی دووبارەبووی نەزۆك لە قەڵەمی دەدا، بە تەنها بیركاری شوێنی سەرسوڕمانی بوو. هەر بۆیە زۆری حەزلێكردووە و شارەزاش بووە تێیدا. دواتر هەر بیركاریشە ڕۆڵێكی گەورە لە فەلسەفەكەیدا دەگێڕێت. ئەوە بیركاری بوو دیكارتی فێركرد لە فیكردا میتۆدێكی ئاشكراو روون گەلاڵە بكات. ئەوەش لەبەرئەوەی بیركاری زانستێكی عەقلانی، لۆجیكییە و دەمانگەیەنێت بەیەقین. دواتر دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: دیكارت بە تەنها لە ڕێگەی بیركاری و لۆجیكەوە نەگەشتە پێكهێنانی میتۆدە عەقلانییەتەكەی لە فیكردا، بەڵكو لە میای ئەزمونە عەمەلی و ژیانییەكانەوەش گەشتە گەلاڵەكردنی ئەو میتۆدە عەقلانیە لە فیكردا. دیكارت كەسێكی گۆشەگیر و دورە پەرێزنەبوو لە بورجە عاجیبەكەی خۆیدا، بەڵكو چووبووە نێو گێرمەو كێشەكانی ژیانەوە و پێش ئەوەی یەك ووشە بنوسێت تاڵی و ناسۆرییەكانی ژیانی چەشتبوو. دیكارت چووە ڕیزی سوپای شازادە (مۆریس دۆنالسۆ) لە هۆڵەندە، ئیدی مانای جەنگ و لێدان و پەیوەندییە مرۆڤایەتیەكان و دژوارییەكانی ژیانی زانی.

شەوی 10ی نۆڤەمبەری ساڵی 1619 ئیلهامی بۆ هات و حەقیقەتی خۆی ئەو ئەركەی لە ژیاندا پێی سپێردراوە، بۆ دەركەوت ئەودەم زانی لەسەریەتی مەسەلەیەكی گرنگ جێبەجێ بكات كە بریتییە لە: دۆزینەوەی میتۆدێك گەر رۆژئاوا لەسەری ڕۆشتن و پیادەیان كرد ئەوا دەتوانن ببنە گەورەی سروشت و سروشت بهێننە ژێر ڕكێفی خۆیانەوە، ئەمەش لە ڕێگەی زانست و تەكنەلۆجیاوە.

لێرەوە دیكارت سەبارەت بە میتۆد مامۆستای رۆژئاوایە. ئەو فەیلەسوفەیە لە بواری زانست و فەلسەفەدا ڕێگای حەقیقەتی پیشانی رۆژئاوا داو وایكرد رۆژئاوا بەسەر هەموو جیهاندا سەركەوێ. لەبەرئەمەشە (هیگڵ) بە پاڵەوانی فیكر وەسفی دەكات.

دیكارت بۆ ئەوەی بگاتە گەلاڵەكردنی میتۆدێكی ڕاست بۆ مرۆڤایەتی، دەستی كرد بە خۆكێشانەوە لە خەڵك و چوو لە وڵاتی هۆڵەندە بژی نەك لە فەرەنسا كە وڵاتی بنەڕەتی خۆی بوو. ئاخۆ هۆكاری ئەمە چییە؟

لە ڕاستیدا ئازادی لە هۆڵەندە زۆر زیاتر فەراهەمكرابوو تاكو لە فەرەنسا.. دیكارتیش لە پێناو بیركردنەوەیەكی لەسەرخۆ و گەلاڵەكردنی پڕۆژە فەلسەفییەكەی بەبێ ئەوەی بێزاری بكەن، پێویستی بە گۆشەگیری و تەنهایی هەبوو، دیكارت دەیزانی فیكری پێشخۆی دەڕوخێنێ تاكو پاشتر فیكرێكی دیكە بونیاد بنێ، ئەمەش ڕووبەڕوی تۆمەت و گومانلێكردن بگرە ڕووبەڕووی ڕاوەدونانی دەكردەوە. لە واقیعدا كڵێسای مەسیحی دیكارتی بەدڵ نەبوو، گەرچی دیكارت لە لێدوانەكانیدا بەردەوام كڵێسای دڵنیا دەكردەوە و دەیگوت: ئەو دڵسۆزی ئاینی باب و باپیرانیەتی، بەڵام میتۆدەكەی پشتی بە گومان دەبەست پێش ئەوەی بگاتە یەقین، مەترسی بۆسەر بیروباوەڕی كڵێسا بوو كە بە هیچ جۆرێ تەحەمولی گومانی نەدەكرد.

ڕاستە دیكارت میتۆدە گومانكارییەكەی بەسەر

بیروباوەڕی مەسیحیدا پراکتێك نەکرد، تاکو دڵنیابێت لە ڕاستی یاخود ناڕاستی ئەو بیروڕایانەی مەسیحی. بەڵام ئەو فەیلەسوفانەی دوای ئەو هاتن، بەتایبەتی (سپینۆزا) پراکتیکمان کرد. ئەمەش لە نێوەندی پیاوانی ئاین ناڕەزاییەکی توندی نایەوە.

لە واقیعدا میتۆدی سکولایی، واتە میتۆدی قوتابخانە تەقلیدییەکانی تایبەت بە سەدەکانی ناوەڕاست، لەسەر ئەساسی ڕێزگرتنێکی کوێرانە و پاشکۆیەتی پیاوانی ئاین ڕاوەستا بوو. هێندە بەس بوو یەکێکیان بڵێ: فلانە قەدیس وای وت و فیسارە قەدیس وای وت، ئیدی خەڵك بڕوایان پێدەکرد، گەرچی ناوەڕۆکی قسەکانی هەڵەبێت و دووربێت لە ڕاستی و حەقیقەتەوە.

بەڵام دیکارت بەخەڵکی گوت: نەکەن باوەڕ بە قسەی کەس بکەن گەر بە شێوەیەکی لۆژیکی و عەقلانی نەسەلمێنرابێت، ئێوە عەقڵتان هەیە، ئەوەندە بەسە عەقڵتان بخەنەگەڕ تاکو ڕاست لە هەڵە جیابکەنەوە و بگەنە حەقیقەت. هەربۆیە خەڵکینە عەقڵتان بخەنە ئیش و بە پاساوی ئەوەی ئەم کاهینە یاخود ئەویتریان دەیەوێ بەبێ گفتوگۆ باوەڕی پێبکەن، عەقڵتان لە دەستنەدەن. چونکە ئەویش وەك ئێوە مرۆڤە و ڕەنگە ڕاست بکات و ڕەنگە هەڵەش بکات و لە هەڵەکردن مەعسوم نییە.

بەڵام خەڵك لە سەدەکانی ناوەڕاست، بگرە لەسەردەمی دیکارت، لەو باوەڕەدا بوون پیاوانی ئاین مەعسومن، چونکە ئەوان بەناوی پێغەمبەر و تەورات و ئینجیلەوە قسەیان دەکرد.

دواتر دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: بەم شێوەیە دیکارت گەلانی ئەورووپای لە میتۆدی سەدەکانی ناوەڕاستەوە گواستەوە بۆ میتۆدی سەدە تازەکان. ئەم گواستنەوەیەش بوو کە بووە هۆی ئەوەی ئەورووپا لە ڕێگەی داهێنانی ئامێرە تەکنەلۆژییە ئاڵۆزەکانەوە توانی دەست بگرێ بەسەر سروشتدا.

لە واقیعدا ئەو شۆڕشە گەورەیەی دیکارت لە بواری فیکردا هێنایە ئاراوە، لەمەی خوارەوەدا خۆی دەبینێ: دانانی عەقڵ لە شوێنی تیۆلۆژیای مەسیحی تەقلیدی لە تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی جیهاندا. تەنها ڕۆشناییەکانی عەقڵ توانای هەیە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە شتەکان بگات و پاشتر ئەو شتانە بگۆڕێ.

بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە دیکارت کەسێکی کافر بووە. بگرە بە پێچەوانەوە ئەو باوەڕی بە خودا هەبوو. بەڵام باوەڕێکی عەقلانی نەك باوەڕی ئەهلی تەوەکول و خۆبەدەستەوە دراو، دیکارت ئاوای دەگوت: گرنگترین و بەرزترین فیکرە، ئەو فیکرەیە کە دەڵێ خودا هەیە. خودی فیکرەی بوونی خودا خۆی لە خۆیدا تەواوترین و ناکۆتایترین فیکرەیە. بەڵام مرۆڤ کەسێکی ناتەواوەو ژیانی سنوردارە، ئیدی منی مرۆڤێکی ناتەواو سنوردار چۆن دەکرێ لە کامڵترین و ناکۆتاترین فیکرە بگەم کە فیکرەی بوونی خودایە؟ ئەم فیکرەیە لە منەوە نایەت بەڵکو لە بوونەوەرێکەوە دێت لەسەروی منەوەیە و لە منیش گەورەترە. ئەم بونەوەرەش خودای بەرزو بڵندە. هەر ئەویشە خۆشەویستی تەواو ناکۆتای لە مندا چاندووە. لێرەوە بەبێ هیچ گومانێ خودا بوونی هەیە پاشان دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: مادام خودا بوونی هەیە، لێرەوە چیتر ناکرێ مرۆڤ بخەڵەتێنرێ.

بگرە بە پێچەوانەوە، ئەوە خودایە ڕێگای ڕاستی پیشان دەدات، لێرەوە مادام خودا عەقڵی پێبەخشیوین، هەر ئەویشە

داوامان لێدەكات بكەوینە شوێن بیروباوەڕە ڕاستەكان كە دەسەلمێنرێن.

سەبارەت بە وتەزا بە ناوبانگەكەی دیكارت "من بیردەكەمەوە، كەواتە من هەم" دانەر ئاوا دەڵێ: لە قولایی گومانەوە یەقین دێتە دەرێ، لێرەوە گومانی دیكارتی گومانێكی نەزۆك و عەدەمییانە نییە، بەڵكو گومانێكە ئەنجامێكی دیاریكراو دەدات بە دەستەوە.

هەربۆیە لای دیكارت نابێت تەنها جەخت لەسەر گومان بكەین و ئەو یەقینە لە بیر بكەین كە لە ئەنجامی گومانەكەوە دێتە ئارا. دیكارت پیاوێكی گومانكار نەبووە تەنها لەبەرئەوەی گومانی خۆشویستووە، بەڵكو لەبەرئەوە بووە حەقیقەتی خۆشویستووە و هەوڵیداوە لە ڕێگەی گومانەوە بگاتە یەقین.

لێرەوە مادام من گومانم هەیە، كەواتە من هەم، چونكە گەروانەبوایە گومانم لە هیچ شتێ نەدەكرد، هەر بۆیە وتەزای "من بیردەكەمەوە، كەواتە من هەم" لە واقیعدا مانای "من گومانم هەیە، كەواتە من هەم".

ئەو گومانەوامان لێدەكات لە پێناو گەشتن بە حەقیقەت شتەكان لە بێژەنگ بدەین، بەلام ئەوانەی گومان لە هیچ شتێ ناكەن و باوەڕ بە هەموو ئەو شتانەش دەكەن لە لایەن وشەو پیاوانی ئاینەوە پێیان دەوترێت، ئەوانە ناتوانن بیر لە خۆیان بكەنەوە. هەر بۆیە ناتوانن خۆبەخۆ بگەنە حەقیقەتەكان، ئەوانە ئەهلی پشتبەستنن بە خەڵكانی دیكە و كەوتنە شوێن خەڵكانی دیكەن، نەك ئەهلی بیركردنەوەو داهێنانی زاتی بن.

دواتر دانەر قسەوباس لەسەر فەیلەسوفێكی دیكەی گەورە دەكات كە دژ بە دیكارتە، ئەویش "باسكاڵ"ە. باسكاڵ لە سەرەتای گەنجیدا لە بواری زانستی فیزیا و بیركاریدا بلیمەت بوو، بەلام دواتر وازی لە بواری زانست و زاناكان هێناو گواستییەوە بۆ بواری ئاین، هەر بۆیە ناكرێ باسكاڵ لە خانەی فەیلەسوفە عەقڵانییەكان پۆلێن بكرێ.

لە واقیعدا ئەو بە پێی ئاینی مەسیحی فەیلەسوفێكی وجودی بوو. باسكاڵ بەرامبەر بە چارەنوسی مرۆڤایەتی و بەرامبەر بە تەسائولاتی لە جۆری: ئێمە كێن؟ لە كوێوە هاتوین؟ چارەنوسمان بەرەو كوێیە؟ كەسێكی پڕ دڵەڕاوكەو شپرزە بوو. ئەو لەو باوەڕەدابوو تەنها ئاین لە توانایدا هەیە وەلامی ئەو سێ پرسیارە بداتەوە نەك زانست. هەربۆیە باسكاڵ وازی لە لێكۆڵینەوەی زانستی و عەقلانی هێناو هێرشی كردە سەر دیكارتی عەقلانی ئیمان لاوان، باسكاڵ دەیگوت دیكارت كەسێكی بێكەڵكە و جێی متمانە نییە! پاشان دەیگوت: تەنها دڵ هەست بە بوونی خودا دەكات نەك عەقڵ، لێرەوە سەنتەری ئیمان دڵە نەك عەقڵ، ئەوەشی دڵی نەبێت ئیمانی نییە.

لێرەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی تێڕوانینی فەیلەسوفان بۆ خودا تینوێتی ناشكێنێ، بەڵكو تێڕوانینی ئاین بۆ خودا تەواوترە. چونكە تێڕوانینی یەكەم تێڕوانینێكی ئەبستراكتی وشك و برینگی بێ دڵە و بێ هەست و سۆزە، بەلام تێڕوانینی دووهەم پڕە لە دڵنەوایی و خۆشەویستی و هیواو ئاوات.

**سەرچاوە**

بیان الكتب 2005/8/1.

# یاسوناری کاواباتا لە شۆخە نوستووەکاندا

عەبدئەلحسەین بریسم
لە عەرەبییەوە: محەمەد کەساس

(بۆچی مارکیز هیوای دەخواست ئەم ڕۆمانە خۆی بینوسیایە...!؟)



لە کتێبی (شیعر یان پەخشان)دا وا ڕاهاتووین کە نوسەرانی دیکە پێشەکی بۆ بنوسن و پێشکەشی بکەن، ئەم پێشەکیانە هەوڵێکن بۆ ناساندنی نوسەر و تیشك خستنە سەر کتێبەکە، ئەگەر ئەم دەقە ئەدەبیە لە زمانە سەرەکیەکەی کە پێی نوسراوە وەرگێڕرا بۆ زمانێکی دیکە، ئەوا ئەو پێشەکیە ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت بۆ ئاشنابوون بە دنیای نوسەر، هەندێك جاریش ئەو پێشەکیە لە ناوەڕۆکی دەقەکە زێدەتر ئامادەیی هەیە، ئەمەش لە ڕۆمانی (شۆخە نوستووەکان)ی نوسەری ژاپۆنی (یاسۆناری کاواباتا) بەرجەستە بووە، کاتێك کە نوسەری کۆلۆمبی جیهانیی ناسراو (مارکیز) پێشەکیەکەی بۆ نوسی. دەتوانین بڵێین (مارکیز) لەو پێشەکیەیدا، یان لەو پێشکەشکردنەیدا بەشێکی دیکەی بۆ ڕۆمانەکە زیادکردووە، بەشێوەیەك هەست دەکەیت لە ڕۆمانەوە نزیکیت، ئەوەش لە ڕێی ئاماژەکانیەوە، یان پێشەکیەکە جۆرێك لە سیحری داڕشتن لە خۆ دەگرێ، بە تایبەتی لە وەسفکردنەکانی بۆ کیژێکی ڕۆژهەڵاتیی جوان و بەژن زراڤدا، ئەوەش وەك ئەوە وایە بڵێت: ئەمە جوانترین کیژە لە ژیانمدا بینیومە.

ئەمە چ مانایەك دەگەیەنێت بۆ خوێنەر و چ پەیوەندیەکی هەیە بەو گەشتەی لە پێشەکی ڕۆمانی (شۆخە نوستووەکان)دا نوسراوە، لێرەوە دەردەکەوێت ئەو کیژە پەیوەندیەکی ماناداری بە بابەتە سەرەکیەکەوە هەیە پاش خوێندنەوەی ڕۆمانەکە، کە لە لایەن نوسەرو خاوەنی ڕۆمانی (سەد ساڵ لە تەنیایی)یەوە ئاشکرا کراوە و خراوەتە ڕوو، ئەمەش وامان لێدەکات بپرسین ئایا (مارکیز) چۆن هەستی بەمە کردووە، پاشان دەردەکەوێت کە ماڵ – تەوەرەی سەرەکی و شوێن بۆ ڕوداوەکانی ناو ڕۆمان لە نێوان کیژانی ناو خێزانەکەی خۆیەوە هەبوون، ئەو کیژانە لە شێوە و تەمەندا لە یەکدیەوە نزیکن لەگەڵ ئەو کیژەی (مارکیز) لەناو فڕۆکەکەدا، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە، ئەو پەیوەندیەی نێوان پێشکەشکردن و پێشکەشکاری کیژەکان لە ڕێی ئاماژەی ترەوە خراوەتە ڕوو هەر لەلایەن (مارکیز)ەوە ئاشکراکراوە و دۆزراوەتەوە. کیژی ناو فڕۆکەکە داوا لە خزمەتکاری ناو فڕۆکەکە دەکات، دوای ئەوەی (شەمپانیا) ڕەت دەکاتەوە، کوپێك ئاوی بۆ بێنێ بۆ ئەوەی ئەو دوو (حەب)ە قووت بدات کە لە قوتویەکدا دەریهێنان کە چەندین دەنك (حەب)ی دیکەی بە چەند ڕەنگێکی جیاواز تێدا بوو، دوای ئەوە یەکسەر خەوی لێکەوت.

ئەو پەیوەندیە چیە لە نێوان ئەم دیمەنەی (مارکیز) لە ناو فڕۆکەکەدا بینیویەتی لەگەڵ ڕۆمانەکەدا؟، هەر زوو وەڵامەکە

دەست دەكەوێت، ئەو شۆخە نوستووانە هەمان ئەو (حەبانەیان) قووتداوە، جگە لەوە بە تەمەنەكانی ناو ژوورەكەش كاتێك حەبەكان لە نزیك سەرینەكەیەوە دەدۆزنەوە هەموویان بەكاریان دێنن و قووتیان دەدەن، دەبینین پێشكەشكار، یان پێشەكی نووس ئاماژەی گرنگ و ئاڵۆز لە دەقی ڕۆمانەكە وەردەگرێ و تێكەڵ بە دەقی پێشەكیەكەی دەكات، نوستنی كیژەكەی (ماركیز) لەناو فرۆكەكەدا هاوشێوەی نوستنی شۆخەكانی (كاواباتا)یە لەگەڵ ئەوەشدا تەمەن لەلای كیژەكەی پێشەكی نووس و كیژەكانی نوسەری دەق، نزیكن لە تەمەنی پاڵەوانی ڕۆمانی (ئیفۆشی) و نوسەرەكەیەوە.

هونەری پێشەكی نوسین بۆ كارێكی داهێنەرانە بێگومان پێویستی بە داهێنان هەیە بە هەمان ئاستی دەقەكە پێشكەشكراوەكە، یان پێشەكی بۆ نوسراوەكە، ئەمەش لە پێشەكی نوسینەكەی (ماركیز)دا دەبینرێ كە بۆ (كاواباتا)ی نوسیوە لە ڕۆمانی (شۆخە نوستووەكان)دا، ئەم ڕۆمانە ئەو ڕۆمانەیە كە نوسەری ڕۆمانی (خۆشەویستی لە سەردەمی كۆلێرا)، كاتێك پرسیاری لێكراوە دەربارەی ئەوەی كە ئایا خوازیار بوویت كام ڕۆمانە تۆنوسەری بویتایە؟

ئەمیش لە وەڵامدا بێ دوو دڵی دەڵێت: ئەو ڕۆمانە ڕۆمانی (شۆخە نوستووەكان)ی نوسەری ژاپۆنی (یاسۆناری كاواباتا)یە. لێرەوە دەگەڕێینەوە بۆ لای نوسەری ئەو ڕۆمانە (كاواباتا)، ئەو ڕۆماننوسەی كە خەڵاتی (نۆبڵ)ی بۆ ئەدەب وەرگرت لەساڵی 1968دا، هەر ئەو ساڵەش لە شوقە بچوكە خەمئامێزەكەیدا خۆی كوشت، دوای ئەوەی چەندین ڕۆمانی مەزنی وەك (وڵاتی بەفر –1948) و (پۆلە چۆلەكە سپیەكان – 1953) و (نركەی چیا – 1954) و (شۆخە نوستووەكان)ی بۆ جێهێشتووین.

لێرەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی ئەم پێشكەشكردنە، یان ئەم پێشەكیە پڕ لە داهێنانەی (ماركیز) بۆ ڕۆمانی (شۆخە نوستووەكان) لە نرخی بەرزی ئەدەبی و ئینسانی ڕۆمانەكەوە هەڵێنجراوە، كەواتە ئەوانەی كاری ئەدەبیی مەزن پێشكەش دەكەن، پێویستە پێشكەشكردنەكەیان هەمان ئاستی مەزنیی كارە ئەدەبیەكەی هەبێت.

### سەرچاوە

ڕۆژنامەی (الصباح)،
ژمارە 499، 14ی ئازاری 2005.

# چەند فایلێك

وەرگێڕە بەڕێزەکان ئاگادار دەکەینەوە کە لە ژمارەکانی داهاتوودا ئەم فایلانە بڵاودەکەینەوە، هیواداریین بە بەرهەمی بە پێز و دانسقە دەوڵەمەندی بکەن

1-ئیدوارد سەعید

2-یورگن هابرماس

